# گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد

بەرگی سێیەم
بەشی یەکەم
١٩٧٥

چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ـ بەغدا

بسم الله الرحمن الرحيم

نوسەری هەر وتار و لێکۆڵینەوەیەك کە لەم گۆڤارەدا بڵاو دەکرێتەوە خۆی بەرپرسیاری ناوەڕۆکێتی .

===*===

البحوث والدراسات التي تنشر في هذه المجلة تعبر عن اراء اصحابها .

# خولی دووەمی دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕ

سەرۆکی کۆڕ
ئیحسان شێرزاد

/ مانگی مارتی ١٩٧٤ سێ ساڵی ڕێك بە سەر کارکردنی کۆڕدا تێپەڕی و بەو جۆرە خولی یەکەمی دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕ دوایی هات/و خولی دووەمی دەستی پێ کرد. هەرچەندە ئەو ساڵانەی پێشوو بە کاروباری کارگێڕی و خۆدامەزراندنەوە خەریك بووین، بەڵام شان بە شانی ئەوەش لە جێبەجێ کردنی ئەرکە زانستێکانی کۆڕدا درێغیان نەکردوە . دەربارەی کاری ئەو سێ ساڵەی کۆڕ لە چەند ژمارەی پێشووی گۆڤارەکەماندا دواوین[1] .

---

(١) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد »، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، ل ٣ ـ ٨ ، ٣٢٢ ـ ٣٥٥ ، ٣٦٤ ـ ٣٧٩ ، ٣٨٠ ، ٤١٩ ، ٤١٩ ـ ٤٢٣ ؛ بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ل ٥ ـ ٨ ، ٨٢٨ ـ ٨٥٨ ، ٩٤١ ـ ٩٤٨ ؛ بەرگی دووەم ، بەشی دووەم ، ل ٥ ـ ١٠ ، ل ١٦٦ ـ ١٧٠ ، ٢٨٣ ـ ٣٠٤ .. هتد .

بەم جۆرە دەتوانین بە شانازییەوە بڵێین کە وا کۆڕی زانیاری کورد بە سەر بڵندییەوە پێی نایە چوارەم ساڵی تەمەنییەوە. ئەمە و دەرچوونی ژمارە یەکی بەرگی سێیەمی گۆڤارەکەمان بە هەل دەزانین بە هەموانی رابگەیەنین کە وا دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕ و ئەنجومەنی کۆڕ بۆ خولی دووەم ئومێدیان وایە بۆ جێبەجێ کردنی ئیش و کاری کۆڕ پتر هەوڵ و تەقەلا بدرێ و ئەو ئەرکە زانستییانەی کەوتوونەتە سەر شانی باشتر بیانگەیەنێتە ئەنجام. بۆ هێنانەدی ئەو مەبەستە گەلێك بڕیاری نوێ وەرگیراوە و کاری بەکەڵك و پێویست هەڵسوڕێنراوە. ئەو کارانەی لە ماوەی نۆ مانگی رابوردوی سەرەتای خولی دووەمدا جێبەجێ کراون لە هەواڵەکانی کۆڕدا نیشان دراون[2].

لێرەدا بە پێویستی دەزانم، ئەو پلان و ئامانجانەی کۆڕ کە لە ئیشە سەرەکییەکانی خولی دووەمیدا هەیەتی، بخەمە پێش چاو:

١ ـ لە ساڵێکدا دوو ژمارەی گۆڤار دەربکرێ.

٢ ـ زیاد کردنی بەرهەم و چاپەمەنی کۆڕ.

٣ ـ زیاد کردنی ئەندامانی کارا و یاریدەر.

٤ ـ رێکخستنی ئیشوکاری کارگێڕی لەسەر شێوەیەکی نوێ و هێنانی چەند کادرێکی تری بە توانا.

---

(٢) بڕوانە : «گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد»، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل ٥ ـ ١٠، ٢٨٣ ـ ٢٩٠؛ هەروەها لە چەند شوێنێکی ئەم بەشەی گۆڤارەکەماندا.

٥ ـ بڵاوکردنەوەی چەند باسی تازە دەربارەی مێژوَی کورد .

٦ ـ بڵاوکردنەوەی وردبوَنـــەوەی لیژنەکانی کۆڕ دەربارەی ڕێزمانی کوردیی .

٧ ـ بڵاوکردنەوەی چەند پیتێـکی سەرەتای فەرهەنـگی کۆڕ ـ فەرهەنـگی یەکگرتوَی کوردیی .

٨ ـ ساڵی ٣ ـ ٤ کتێبی گرنـگ و بایەخدار وەربگێڕدرێتە سەر زمانیی کوردیی و بڵاو بکرێتەوە .

٩ ـ لە بارەی دانان و داڕشتن و وەرگێڕانی زاراوەوە ، وەك ئاشـــکرایە ئەنجومەنی کۆڕ ، نەك تەنها بایەخێکی تەواوی پێداوە ، بەڵـکو بەشی زۆری کاتی بۆ ئەم کارە گرنگە تەرخان کردوە . لە هەمان کاتدا چەند لیژنەیەکی تایبەتیشی بۆ لێکۆڵینەوەی زاراوی زانستیی داناوە . ئەنجامی ئەم هەوڵ و کۆششەش ئەو سێ لیستەیەیە ، کە لە هەر سێ ژمارەی گۆڤارەکەماندا[٣] و بە دوَ کتێبی سەربەخۆ[٤] بڵاومان کردوَنەتەوە سەرەڕای ئەوە کۆڕ چالاکتر لە

(٣) بڕوانە : « گـۆڤاری کۆڕی زانیـاری کورد » ، بەرگـی یـەکەم ، بەشی یەکەم ، ل ٤١٩ ـ ٥٢٦ ؛ بەرگـی دووەم ، بـەشی یەکەم ، ل ٨٩٤ ـ ٩٤١ ؛ بەرگـی دووەم ، بەشی دووەم ، ل ١٦٦ ـ ٢١٨

(٤) زاراوی کارگێڕی ، دانان و لێدوانی ئەنجـومەنی کۆڕ ، پێشەکـیی و ڕێـکخستنی د. کەمال مەزهەر ، بەغدا ١٩٧٣ ـ ١٩٧٤ ؛ وە زاراوی هەمەچەشنە ، دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کـۆڕ و لیژنەکانی ، پێشەکی و ڕێـکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجیی مارف ، بەغدا ١٩٧٤ .

جاران خەریکی زاراوە و لەم ژمارەیەی گۆڤارەکەماندا بەشێك لەو زاراوانە دەخەینە پێش چاو کە ئەنجامی ئەم چەند مانگەی دواییە . بریارمان وایە ، کە لەسەر ئەم کارە بە باشی بەردەوام بین و جگە لە زاراوی هەمەچەشنە ، لە ماوەی ئەم سێ ساڵەدا کاری زاراوی کتێبی فێرگەکان تەواو بکەین .

١٠ ـ کتێبخانەی کۆڕ رۆژ بە رۆژ دەوڵەمەندتر و ئاوەدانتر دەبێ و رەنگبێ بۆ بەڵگەش ئەوە بەس بێ کە لەم ماوە کەمەی خولی دووەمی دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕدا نزیکەی دوَ هەزار کتێبی زیاد کردوە . بەم جۆرە ئێستا کتێبخانەی رازاوەی کۆڕ یەکێکە لە کتێبخانە هەرە بڵند و بەنرخەکانی کوردی . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پتر گرنگی بە کتێبخانەکەمان دەدەین و پارەیەکی زیاترمان بۆ کڕینی کتێب و چاپەمەنی و دەستنوسی کوردی تەرخان کردوە .

١١ ـ هەرچەندە چاپخانەی کۆڕ بچوك و کۆنە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاری باش و گەورە و پوختمان پێ راپەڕاندوە . هەردەم هەوڵ و کۆشش دەدەین کەم و کورتێکانی چاپخانەکەمان نەهێڵین . بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی پارەیەکی زۆرمان لە بوجەی ئەم چەند ساڵەدا بۆ تەرخان کردوە . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، کە لە سەرەتای مانگی دوانزەی ١٩٧٤دا مەکینەیەکی چاپی نوێمان پێگەیشت . ئێستاش چاوەڕوانی گەیشتنی هەندێ مەکینە و تفاقی تری پێویست دەکەین و دەبێ بەم زوانە پێمان بگەن . بێگومان فراوان کردن و نەهێشتنی کەم و کورتی چاپخانەکەمان و تەواو بوونی بینای تازەی کۆڕ

یارمەتییەکی زۆرمان دەدەن و کارمان ئاسان دەکەن .

١٢ ـ لە ژمارەی پێشـووی گۆڤارەکەماندا باسمان کردبوو ، کە لە ماوەی چەند ساڵی رابووردوودا کۆڕ توانی لە ناو دەزگا زانستیـەکانی ناوخۆ و دەرەوەدا جێگەیەکی دیار بۆ خۆی بـکاتەوە(٥) . بێ‌گومان هەوڵ و تەقەلا و کۆششمان ئەوەیە ، کە وا ئەو پەیوەندییە توندتر و بە هێزتر و فراوانتر بکەین و ئەنجامیش ئەوەیە کە لەم ماوەیەی دواییدا لەگەڵ چەند دەزگایەکی زانستی تری دەرەوەدا پەیوەندیمان بەستووە .

کۆڕی زانیاری کورد ماڵی هـــەموو نەتـەوەی کوردە و دەستـــەوتێکی گەورەی خەباتی دوور و درێژمانـە . یارمەتی دان و پشتیوانی کردنی ئەم کۆڕە ، ئەرکی نیشتمانی هەموو کوردێـکی زانا و رۆشنبیر و نیشتمان پەروەرە :

کۆڕی زانیاری کورد هێشتا ساوایە ، تەمەنێکی کەمی رابواردوە ، خۆی بە تەواوی نەگرتوە و کەم و کوڕی هەیە ، پێویستی بە یارمەتی دان و هاوکاری رۆڵە وەفادار و دڵسۆزەکانی نەتەوەکەمان هـــەیە .

سوپاسی ئەو زانایانە دەکەین ، کە یارمەتی‌یان داوین و بیر و رای خۆیان دەربڕیوە . ئێمە درێژە بە کاری خۆمان دەدەین و ئێوەش لە یارمەتی دان درێغی مەکەن ، تا بە هـەموان خزمـەت بە نەتەوە و زمان و ئەدەب و مێژووەکەمان بـکەین .

* * * * *

---

(٥) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دووەم ، بەشی یەکەم ، ل ٩

# چەپکێك لە گوڵزاری «نالی»

ئەندامی کارا : مەسعود محەمەد

## بەشی دووەم

لە بەشی یەکەمی ئەم گوتارەدا بە خوێنەرم راگەیاند باسی ( ناوەرۆك ) بەگشتی و بە جورێکی لێی بوەشێتەوە لەوێدا جێی نابێتەوە ، ئەوەشم خستە سەر قسەکانم کە درێژەی باسی ناوەرۆك بە ناچاری کەوتە ناو بەشی دوەمی کتێبی ( حاجی قادری کویی )یەوە چونکی لە بەشی یەکەمدا جێی نەبۆوە هەرچەند دەمێکیشە لە نوسینی بومەتەوە . بەداخەوە ئەم باسە بەدبەختە لە بەشی دوەمی ( حاجی قادر )یشدا بێمراد بو ، دەبێ چاوەنۆڕی بەشی سێیەمی بێت .

لە بەشی یەکەمی ئەم گوتارەمدا کورتەیێکی بیروباوەڕی خۆم لە بارەی ناوەرۆکەوە نوسی و بەدوا ئەودا کەوتمە سەر دۆزینەوەی واتای سەر بە کۆمەلایەتییەوە لە هەڵبەستەکانی نالیدا . مەنتیقی نوسینەکەم لێم داخوازی دەکات ، کە من رێم نەبێ بە درێژی لەسەر ( ناوەرۆك ) بنوسم ، دەبێ دەورێکی سەرەباسی ( ناوەرۆك لە شیعری نالی ) بدەم کە خۆی یەکێکە لە سەرەباسە بنجییەکانی ئەم گوتارە و قەرزێکە

بەسەریەوە بەڵام لە نووسینمدا نامەوێ پێش‌بڕکێ لە خۆم بکەم بۆ مەبەسی زۆتر گەیشتن بە شی کردنەوەی ئەو سەرەباسە . من جڵەوی قەڵەمەکەم ناوەتە دەست هەڵبەستی نالییەوە ، بۆ چ لایێکی ببات بەدجڵەوی لەگەڵدا ناکەم . بە پێی باوەڕی خۆم لە هەر شوێنێکی گوڵزار و چەمەنزاری ئەدەبی نالی گەشتی دڵ و زیهن بکەین خۆشییێک دەدۆزینەوە کە وا لەوێدا نەبێ نادۆزرێتەوە ، لەکیس‌دانیشی جێی پڕ نابێتەوە .

بێ‌گومان باسی ناوەرۆك لە شیعرەکانی هەر بەوەندە تەواو نابێ بڵێین لایەنی کۆمەڵایەتی و نەریت و داب و دەستووری بەیەکەوەژیان لە نوکتە و وردەکاریەکانی دەدرەوشێنەوە و بەوەدا نالی لە توهمەی وشکەمەلەی خەیاڵبازیی رووت و رەهەوا کەوتنی هونەری سەراوتی و بێ‌بنجی مادی بپەڕێنینەوە ؛ راستی گوتە ئەمەیە ئەوەندە دوانە کورتە سەرەتایێکە لە باسی پڕ دەنگ و صەدای ناوەرۆك لە شیعری ( نالی )دا .

بەڵام بەر لەوە هیچ بڵێم لە بارەی ئەو ناوەرۆکەوە پێویستە تێبینیەکی گرنگ دەربڕم وەك پێپلکە بێ لە بەر هەنگاومان بەرەوژوور و سەرەوهەوراز بۆ ناو واتا و ناوەرۆك لە باغ و راغ و گوڵ و گوڵزاری نالی کە خۆی زۆر راستگۆیانە و بەئینسافەوە بانگ هێشتنمان دەکا بۆی بەم دێڕە شیعرەی وەك کارتی بانگ هێشتن :

وەرە ســـەیری خیـابانی بـــەیازی دەفتـەری ( نـــالی )
کە صەف‌صەف ( مصرع )ی بەرجەستە ریزی سەروی مەوزوَنە

تێ‌بینیەکەم بریتییە لەمە : مرۆڤێك کە گەیشتە پایەی نالی لە بوێژیدا ، هێندەی بەدیهیە دیارە مەیدانەکانی پڕ دەمەتەقەی وەك بەهرەی خۆڕسك و هەست‌ونەست پڕبوَن لە دیمەنەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و شـارەزابوَن لە زانست و هونەری باوی رۆژگاری خۆی و پەیداکردنی قەناعەتی تایبەتی لە سەرجوملەی بوَن و مردن و ژین و چاکە و خراپەدا .. تا ئـــەم مەیدانانەی هەمـــو پێچاوەتەوە و کردوَنی بە یەکێك لە گۆڕەپانە مەعنەویەکانی ناو جیهانی فرەوانی دەروَنی خۆی ئەوســـا گەیشتوە بەو دەسەڵاتە کە شیعری وەها بهۆنێتەوە خەریك بێ لەبەر پڕ مەعنایی و نوکـتە و نازکی بتەقێتەوە .

هەڵاخنینی شـــیعر بە واتا و هونەر کارێـکە نە هی بەهرەی تەنها نە هی پێ‌گەیشتنی تەنهایە : دەبێ بەهرە و پێ‌گەیشتن ، واتە زات و بابەت ـ دەروَن و دەرەوە ، لە هەڵاخنیندا بەشـدار بوبـن لەم بەشداریەشدا بە رادەی لەنـگەرراگـرتن و پارسەنگ‌کردنی هەر دوَ لایان دەسەڵاتی شاعیر خۆدەنوێنێ . فەرمو سەیرێکی ئەم یـەك دوَ نموَنەیە بکە لە شیعری نالی کە پارسەنگ‌بوَن و لەنگەربەستنی باس کراویان تێدا بەدی دەکرێت . نموَنەی یەکەم :

٩ ( طرّە )ت وەکو توَماری شکستە و سەری کوڵمت
بـۆ توری ســـەوادم بوەتە شـــەمعی موتـــاڵا

نموونەی دووەم :

لەم (پارچەلۆکە) هەورە بەقەد رووی هەموو زەمین
بەم رایەڵە قەدیفەیی سەوزی عەجەب تەنی

لە نموونەی یەکەمدا چی لە توانای ئادەمیزاد بۆ کۆ بۆتەوە لە واتای سەر بە نووسین و خوێندنەوە و تاریکی و رووناکی و راگرتنی هەر چشتە بەرامبەر هەمجینسی خۆی و داڕشتنی قاڵبی جوانی لە ناو بۆتەی عیشق و تێکئاڵاندنی حەقیقەت و مەجاز و تێوەرپێچانی تەوریە بە دەوریانەوە.. هەمووش لە دوازدە وشەدا. تۆ سرنج بگرە لە تاکە وشەی کۆتایی بەیتەکە کە « موتالا ـ مطالعه » یە چۆن بەتەنها لەلای خۆیەوە بووەتە ئاوێنەی قودرەت هەموو تیشکێك دەداتەوە کە لە وشەکانی « طرّە ، تووماز ، شکستە ، کوڵم ، نوری سەواد ، شەمع » هەڵبستێتەوە ، وشەی شکستەش بە هەردوو واتای (بەسەریەکداشکانەوەی مووی طرّە ـ خەتیشکستەی فارسی کە طرّە و توومارەکەی پێ نووسرابێ) لە ئاوێنەکەدا دووبارە دەبێتەوە ، هەروەها وشەی « سەواد » ئەویش بەهەر سێ واتای (رەشاییشەو ـ رەشکێنەی چاو ـ خوێندەواری) . خۆشت دەزانیت شەمع لە شەودا پێ دەکرێت تاکو چاو شتی لە بەر بخوێنێنەوە با ئەوشتە توماری شکستەش بێ . بەڵێ وشەی « موتالا » ئەمانە بە تێکڕایی عەکس دەکاتەوە بێ ئەوە یەك زەررە لە تیشکی هیچ کامێکیان بەخەسار بدات . کە بێین و لە ناو هەموو وشەکاندا بۆ دەسبژارکردن وشەی « توومار »

هەڵبژێرین بۆ دۆزینەوەی دەسەڵات و بلیمەتی شاعیریەت تێیدا ، شەپۆل شەپۆل ، ئاورینگی ئەو دەسەڵات و بلیمەتیە بە ڕوماندا دەپژێ : تۆمار لە لایێکەوە شتێکی نوسراوە هەم لەگەڵ « طرّە »دا دەگونجێ کە نوسینی تێدایە و لەو ڕێگەیەوە بەیەکتر تەشبیه کراون ، هەم دەبێتە ئەو پێشەکیەش کە لە ئەنجامی بەیتەکەدا موتاڵا دەکرێ هەرچەند لە بەیتەکەدا پەیوەندی ڕاستەوخۆی موتاڵا بە وشەی (سەری کوڵم)ەوەیە کە وا بۆتە « شەممەی موتاڵا » . دیسانەوە تۆمارەکە کە جێگری « طرّە » یەوە بەبەر ئەو گیراوە ، هەر خۆی دەبێتەوە ئەو شەوە تاریکە درێژەی کە دەوری سەری کوڵمی داوە و ئەویش تێیدا بۆتە « شەممەی موتاڵا » کە لە شەودا هەڵدەکرێت ، ڕەشایی و درێژی شەوەکەش بە هۆی وشەی تۆمارەوە لە بەیتەکەدا لەوەڕا دێت کە تۆمار لە لایێکەوە مەشوورە بە درێژی لە لایێکی تریشەوە موی ڕەشی « طرّە »ی یاری پێ تەشبیه کراوە . تۆمارەکە سەرەڕای بەدەستەوەدانی ( ڕەشایی و درێژی ) کە هەم جینسی موی « طرّە » و شەون ، جارێکی تریش وەسفی جوانی موەکە دەکات بە هۆی وشەی « شکستە »وە کە ڕادەگەیەنێ داوە ڕەشە درێژەکانی موەکە چین چین بەسەر خۆیاندا شکاونەوە . لە لایێکی تریشەوە ئەم تۆمارە کە بە وێنەی بەرچاو « شکستە » و بەسەرخۆیدا شکایەوە بێ لە هەمان کاتدا تۆمارێکی نوسراوە بە خەتی « شکستە » کە جۆرێکە لە ڕێنوس و زۆر باو بێ لە و سەردەمە ڕابردوەی ڕۆژگاری

نالی‌دا ، بەوەشـدا « طرّە »ی یار بە تەواوی دەبێتە بابەتی موتالاکەی کۆتایی بەیتەکە . لەمانە هەموی گەڕلی و بە چاوێـکی دڵ و دەروَنت سەیرێـکی ئەم دیمەنە ئەفسوناویەی دەورەدانی توڕڕە و تومارەکە لە کوڵمی یار بکە کە بۆتە شەمعی موتالا ، لێت دەشـێوێ و نازانیت موتالای تومارەکە بـکەیت لە بەر شەوقی مۆمی سەری کـوڵمی یاخود لە ناو شەوەزەنگی موەکاندا موتالای مۆمەکە خۆی بکەیت کە سەری کوڵمیەتی .

لە نمونەی دوەمدا نالی شارەزایی بە سروشت و بە کۆمەلایەتی وێـکڕا کۆ دەکاتەوە و دەســـتڕەنگینانە تابلۆیێـکی هونـــەری ئەفسوناوی ئەوتـــۆ لە کۆکردنەوەی هەردوان پێـك دێنـێ و بـە چەشـنێك لە تابلۆکەدا تێـکیان هەڵدەکێشێت و دەیانهۆنێتەوە مرۆڤ نازانێ کامیان کامن .

( پارچەلۆکە )ی هەورەکە دەشێ بە واتای پارچە پەمۆ بێ یاخود بە واتای پارچەی بچوك بێ کە بڵێین قاڵبە داڕشـــتنی « تصغیر »ی پارچەیە وەك دەڵێـی « تەشـبیلۆکە ، جۆگـەلۆکە .. » ، ئا ئـــەم پارچەلۆکەیەی هەور لە بەرزایی ئاسمانەوە بە رایەڵەی داوی باران دەبێتە قەدیفەی سەوز و رۆی زەمین دەتەنێ بە سەوزایی . بەهـار چەند سنمەتـکارێکی شـــارەزایە کە دەتوانێ ئەم کارگـەیەی تەنینی قەدیفە لە هەور و باران پێك‌بێنێ و لە لۆکەی هـــەور ( یاخـود لە هەوری کەم ) قوماشی سەوزی بەرین بچنێ بە قەد رۆی هەمـــو

زەمین . سنعەتکاریی و وەســتایی بەهار لەم چنـین و تەنینەدا دوو جاران موعجیزە پێك دێنن یەکەمیان لەوەدا کە هــەوری کەم دەکاتــە قەدیفەی زۆر دوەمیان کە رەنـگی هەورەکە لە سپیەوە دەگۆڕێ بە سەوز چ دەرمانێك و ئەجزایێکی کیمیاویشی بەکار نەهێناوە . گەلێك جار لە وەسفی ئەم بەیتەدا گوتـوومە کاری تەنیـنی قەدیفە لە کارگەی راستەقینەدا هەر بەقەد بەیتەکەی نالی رێك و پێـکە و هەر هێندەی ویش زەحمەتی تێدایە چونکە بەڕاستی هونەرەکەی نـــالی لەم بەیتەدا هەموو سنووریێـکی بەرچاوی هـونەر و شـیرنـکاریی و شـــۆخی و دەستڕەنـگینی تێپەڕاندوە .

خواجە «کلیم همدانی» لە وەسفێـکی بەهــاردا ئەم بەیتــەی گوتوە کە ئەویش بەڕاستی شاکارێـکە یەکجار کەم مانەندە :

از بهر ســبقت بـیرون شدن شکوف برگ

در تنگنائی شاخ درخت میکنند جـدال

واتە « بۆ پێـش بڕکێـی زووکردن لە هاتنە دەرەوە ، گوڵ و گەڵا لە تەنـگژەی لـکەداردا زۆرەملێیانە » . بەڵام لە گەڵ ئەم هەمــوو جوانی و هونەرەشدا بەیتەکەی (خــواجە کلیم) لە تەك هینەکەی نالیدا ئەوەندە محدود دێتە بەرچاو دەشـــێ ببێتــە نەقشێـکی ئەو قەدیفەیەی ناو بەیتەکەی نالی .

نامەوێ غەدر لە کەلیم بکەم بــە شکاندنی بەیتەکەی لە رێـی

هێنانەوەی هەمو واتای بەیتەکەی نالی کە لە سروشتی بەهاری تێپەڕاندوە و بەولای بەهارەوە باوەشی بە کۆمەڵایەتی‌دا گرتوە و هەردوکیانی پێکەوە کردوە بە کەرستەی ملکەچ بۆ هونەر و جوانی لە حاڵێکدا بەیتە نازدارەکەی کەلیم وەك بوکی جوان لە ناو کژاوەی سروشتدا خەملیوە و ئاوڕینەکانی لە پەردەی دەوری کژاوەکەوە ئاودیو نابن بۆ کۆمەڵایەتی ، بەڵێ نە بەیتەکەی کەلیم دەشکێنم بە خنکاندنی لە ناو تۆفانی واتای شیعرەکەی نالی نە لێرەشدا چ ئیشێکی زۆرمان هەیە بە قوڵ بونەوە بۆ تەختی بنی گۆمی بەیتەکە چونکە لەو نمونانەدا تاکە مەبەس ئەوە بو راستیێکی گرنگی ئەدەب رون کەینەوە کە بریتییە لەوە هەڵاخنینی شیعر بە واتا و جوانی تا رادەی مشت بون و لێوڕژان کاری تاکە هۆی هونەر وەیا تاکە هۆی پێگەیشتن نیە ، هەردو هۆ دەبێ کۆ ببنەوە تا بتوانن ئەفسونی بەهرە وەرگێڕنە سەر گوتەی زمان ، لە کۆبونەوەشیاندا بە رادەی لەنگەر بەستن و پارسەنگ بونی هەردویان لە دو دەستەی تەرازوی بەیتی هەڵبەستدا دەسەڵات و هێز و دەستڕەنگینی شاعیر خۆ دەنوێنێ . کە سرنجت بدەیتە دو نمونەی سەرەوە دەبینی ئەم لەنگەر بەستن و پارسەنگ بونە لە هەردو بەیتەکاندا بە چەشنێك لە سەرانسەری داڕشتنی رستەکانیان داوەستاوە و هێندەیان وەستایی تێدایە لە لای خۆیانەوە بە زیادەوە لە شیرینی و ئارایشتی هەردوان زیاد دەکەن . من لێرەدا مەسەلەیێکی کوردیم بە بیر دەکەوێتەوە کە

دەڵێ « خوا بدا پێغەمبەریش نەختێکی دەخاتە سەر » . تۆ سەیری (پارچەلۆکە) بکە کە گوتم دەشێ « پارچە لۆکە ، پەمۆ » بێت و دەشێ « پارچەلۆکە ، پارچەی بچوك » بێت کە قاڵبە داڕشتنی چوك کردنەوەی « لۆکە »یە ، چۆن بەم دوو واتایە لەنگەری خۆی راگرتوە هەم لەگەڵ گەرستەی دروست کردنی قەدیفە کە لۆکەکەیە ، هەم لەگەڵ مەهارەت و ئیمجازکاریی بەهار کە لە پارچەیێکی بچوکی هەور بە پانایی رووی زەمین سەرپۆشی قەدیفە دەتەنێ . لە بیریشت بێ نالی ئەم هەڵسوڕ و داسوڕە هونەرکارانەی بۆ سەروبن لە ناو تەنگژەی پێداویستی کێش و قافیەدا دەکات کەچی هەر دەڵێی سواری قالیچەی سلیمان پێغەمبەر بوە و لە ئاسمانی بەربەرەڵای بێ سنووردا پێی دەفڕێ .

کە وتوویژمان سەری کێشایە سەر لەنگەر بەستن و پارسەنگ بوون ، لەو ناوەشدا نموونەی بەراورد کردنمان لە شیعری شاعیرێکی فارس هێنایەوە کە (خواجە کلیم همدانی) بوو ، وا بە چاك دەزانم نموونەیێکی پێشکەوتوو لە شیعری شاعیرێکی بەناوبانگی کوردیش بێنینەوە بۆ مەبەسی بەراوردکردنی بێ تەرەفانە لەو رووەوە کە ئەم جارەیان هەردوو شاعیر کوردن و خەلقی ناوچەیێکیشن . پیرە مێرد ئەم بەیتەی بە سەر زاری (زین)دا هێناوە

خەنجەر بۆ دڵە گەر راستت دەوێ

ئاخ مەی تیایە نەك بەری کەوێ

نالی ۷۰ ساڵ پتر بەر لە پیرە مێرد دەوری واتـــای ئەوتۆیی هەڵاتوە و بۆنی خەیاڵی یاری لە دڵدا بەم بەیتە جوان و نـازدارە نەخشە کێشاوە :

تۆ کە حۆری وەرە ئێو جەننەتی دیدەم چ دەکەی
لەم دڵەی پڕ شـــەرەر و ســـینەیی ســـوزانمدا

گەلێك لە شاعیرانی کورد و غەیری کورد ئەم واتایەیان کردوە بە بنـگەی هەڵبەست و هەریەکەیان بە پێـی دەسەڵات وێنەی ئەم هەڵـکەوتە خەیاڵییەیان کێشاوە . چەندێـکی شاعیر بێن و واتـــاکە دوبارە بـکەنەوە من بێزار نابم بەڵام تـاکە مەرجێـکم لـــە دوبارە کردنەوەکـەدا هەیە : شاعیر دەبێ لە کوتانەوەی واتـای تەقلیدیدا شەقڵێـکی تایبەتی خۆی بەکاربێنێ کـە هەڵبەستەکـەی لە نۆکـەرتی و خزمەتـکارتی هەڵبەستی لە خۆی بەپێشەوە رزگـار بکات .

لێرەدا قسەمان لەگەڵ چەند و چۆنی سەر جوملەی بەکارهێنانی ئەم واتایە نیە ، کات و دەرفەتیشمان چەنك ناکەوێ نموونـەی دەیان شاعیری کورد و میللەتانیتر بێنینەوە و بە یەکتریان بگرین و پـایەی لێوەشاوەیییان بۆ دەستنیشان کـەین ، تەنانەت رێـمان نیە لـە شیعری نالی خۆی نموونەیتر شی کـەینەوە کـە ئەویـــش وەك ئەم بەیتە دەوروپشتی واتای تێخزانی وێنـەی یاری لە چـــاو و دڵ و مێشکی عاشق داوە وەك غەزەلی :

جەنانی وەك جینان کردم بە ماوا
حەبیبــەی (ماڵییــاوا) ماڵی ئاوا

هەر لەم غەزەلەشدا پەردەی بوکێنی لە نــاو چاوەکانیدا جێ دەکاتەوە کـە دەڵێ :

زەفافەتـگاهی پـەردەی ئـاڵی چــاوم
موبارەك حیجلە بێ بۆ بــوك و زاوا

لێرەشـدا بۆك و زاوا و پەردە و زەفافەتگاه هەمویان لە وصالێـکی بەچاودیتندا کۆ بونەتەوە نەك بە گەیشتنەیەکتری دو لەش .

من لە خەریك بونم بە دو نمونەی یەكواتا لە هەڵبەستی نالی و پێرە مێرد کە بەشێکە لە ناوەرۆکی گوتارەکەم ، ئا لەوێشدا هەر لە روی رەچاوکردنی لەنگر بەستن و پارسەنگ بونی لایەنەکانی جوانی و هونەر و ئارایشت و واتا لە ناو نمونەکاندا بیروباوەڕم دەردەبڕم دەخڵم[بەسەر قۆڵ بونەوە بۆ بنی گۆم و گەشت کردن لە بەرینایی هەڵبەست نیە لەم دو نمونەیەشـدا نامەوێ دو شــاعیر ، پیرە مێرد و نالی ، بەرامبەر یەکتر راگرم چونکە دیارە تاکە بەیتێـکی ئەم و ئەویان نابێتە تەرازوی هەڵسەنگاندنی هەمو ئەدەب و هونەر و دەسەڵاتیان ، لەوە زیاتر کە دەسەڵاتی نالی لە یەکێك لە هونەرەکانی بوێژیدا راگرین لە ئاوێنەی بەراوردکردن لەگەڵ نمونەی هــاوبابەتی خۆی چیترم مەبەس نیە . لەم رێچکۆڵە تەسکەوە بۆ ســەر خوانی بەراوردکردن دەرۆم و دەڵێم پیرە مێرد وینەی خەیاڵی مەی لە ناو دڵی زینـدا دانـاوە

بەرامبەر خەنجەرێکی مادی و بەمەدا خەیاڵ و مادەی بەرەنگاری یەکتر کردوون وەك دوو شتی یەك چوون و هاوتا ، لە وشەکانی هەڵبەستیشدا نە تاکە وشە نە کۆمەڵە وشەی ناو رستە هیچ تەوجیھ و وەرامێك بە دەستەوە نادەن لە خاست ئیعتیرازی کەسێکدا کە بڵێ تارمایی و خەیاڵی ناو دڵ مەترسی لێ ناکرێ بەر خەنجەر بکەوێ ، ئەم دەست پاراستنەی زین بۆ چی ؟ بەڵێ ئێمە لە لای خۆمانەوە و لە دەرەوەی هەڵبەستەوە دەتوانین وەرام بدەینەوە و بڵێین هەست کردنی زین بە بوونی مەم لە ناو دڵیدا هێندە بەهێزە وەك ئەوەیە کە بەڕاستی لە ناو ئەو دڵەدا بێ نەك بە تارمایی ، بەلام ئەمە یارمەتیدانە بۆ بەیتەکە لە لاوە و لە دەرەوەی ڕا کە نابێتە دەربازبوونی ڕاستەوخۆ لە ئیعتیراز . ئەمە ڕاستییەکە چ دەمەتەقە هەڵناگرێ ، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێ بڵێین یارمەتیدانەکە ناگاتە پایەی خێر و سەدەقە پێکردن چونکە بە بەر سۆز و تاسەی عیشقەوە هەیە پریشکی ئاگری خۆی لە دڵێکی زامدارەوە بۆ دڵێکی تری هەستیار باوێژێ و سفت و سۆ و وڕێنەی خۆی لەوێشدا بەخەبەر بێنێ و خەیاڵی مەعشوقی خۆی بە هەموو سفت و سۆ و وڕێنەکانی عیشقەوە بێنێتە بەر هەستی ئەو دڵە هەستیارەیشەوە . کەواتە یاریدە دانەکە شتێکە لە داخوازیەکانی عیشقی سووتێنەر کە لە بەیتەکە دایە نەك لە عیشقی ( مطلق ) دا بەلام هەر چۆنێك بێ ، ڕەواندنەوەی ڕەخنەکە کاری من و تۆیە کە لەسەر بنگەی بەیتەکەوە هەڵیدەستێنین ،

زەنەی ئاسایی خودی بەیتەکە نیە ... راگەیاندنی یەکسەرەی وشە و داڕشتنی نیە . ئەگەر شاعیر هاتبا و بیگوتبا خەنجەر لێدانەکە خانە لە مەم دەشێوێنێ ئەوسا هیچ رەخنەیێك نەدەهاتە بەر بەیتەکە چونکە کە ئێمە قبوڵمان بێ وێنەی مەم لە دڵی زیندا هەبێ قبولیش دەکەین بریندار کردنی دڵەکە ئەو خانەیە بشێوێنێ ، کە وابێ هەق دەدەینە زین دەست بیارێزێ لە شێواندنی خانەی مەم ، کە دڵی زینە .

رەنگە خوێنەر لێم بە دەنگ بێ و بڵێ کەی بوە لەگەڵ شیعردا ئەم « منطق » کاریە ؟ ئەوەی راستی بێ لە شیعردا رێ بە رەخنەگر نادرێ لە دەرەوەی شیعرەوە « منطق » و فەلسەفە بێنێ و بیکا بە رەخنە لە شیعر ، بەڵام « منطق »ێك لە ناوەرۆکی شیعرەکەوە هەڵستێ و خۆی بەسەر واتاکەیدا بسەپێنێ دەشێ و دەبێ بکرێتە ئەمرازی پێوانەی شیعرەکە . لە بەیتەکەی پیرە مێردیشدا لایەنی بەرامبەر یەکتر وەستانی خەنجەر ( کە مادەیە ) لەگەڵ وێنەی مەم ( کە نامادییە ) دیعەنێکە بەقەدەر سەرلەبەری بەیتەکە بەرچاو و چ پێویستێك نیە بۆ دیتنی بە خواستنەوەی چاویلکە لە « منطق »ی دەرەوەی هەڵبەستەکەوە . لە داڕشتنی بەیتەکەدا لەنگەرنەبەستن هەیە لەم بەجوتنەهاتنی ( مادی و نامادی ) لە حاڵێکدا لێیان داوا دەکرێ یەکتر پارسەنگ بکەن : « خەنجەری ئاسن بۆ دڵە کە کوشتە ، بەڵام خەیاڵی مەمی بەردەکەوێ کە نامادی‌یە .. »

هێنانەوەی ئەم تەرزە رەخنەیە هەروەك لە واتای بەیتەکەوە

سەر هەڵدەدا ، جارێـكی‌تریش سواری زیهنی رەخنەگر دەبـێ بەوەدا کە شیعری‌تر هەن وەك ئەمیان مادە و ئامادەی کـۆ کردۆتەوە و هیچ رەخنانیش ناسەلمێنێ بە هۆی داڕشتن و هێنانەوەی وشە و تەعبیری ئەوتۆ لە خۆیانەوە کرێ و کاڵیان هەڵدەوەشـێنن بەر لەوە رەخنە بەدەستەوە بدەن . نموونەیێکی ئەم شێوە داڕشتنە بەیتەکەی ( نالی )یە ، کە بەرامبەر نموونەکەی پیرە مێردم راگرت .

لەم بەیتەدا لەنگەر بەستنی وشە و واتا لە سەرانسەری داڕشتنی کوردیی گوتەنی ، فرتەنەیێکە بۆ خۆی :

بەهەشـــتی چاو بە هەمـوو نەخـــش و نیگـار و بەرژین و سەرچاوەیەوە راگیراوە بەرامبەر دڵ و ســـینە بە هەموو بڵێسە و ئاگر و سووتانیانەوە ناوی جەهەنەمیش نەهاتووە چونکە عاشـق دڵـی نایێ بڵی یار لە جەهەنەمدایە .. ئاگرستانێك کە تـارمایی و خـەیاڵی یاری تێدایە جێگەیێکی پیرۆزە بە سۆز و گەرمایی عیشق . حۆریی خەڵقی بەهەشتە و لەسەریەتی بچێتە بەهەشتی چاوەوە ، دڵ و سینە کـە مەڵبەندی ئاگری عیشقن بە زواڵـەت لەگـەڵ حـــۆریی رێـك ناکـەون . گوتم « بە زوالەت » چونکی نالی کە بانـگ هێشـــتنی یاری دەکا بۆ هاتنە ناو بەهەشـتی چاوی و بەمـــەدا بە زاهیر پێـی دەڵێ لە دڵی دوور کـەوێتەوە لە حەقیقەتدا بانـگ هێشـتنەکە بـۆ نزیکتربوونەوەیە لێـی ، لەو رووەوە کـە دیتنی یاری تێدایە ، خۆ دیاریشە دیتنی یار بە چاو دە جاران و صەد جاران پتر حەسانەوەی عاشـــقی

تێدایە لە تلانەوە بە دەست تارمایی و خەیاڵەوە کە هەر عەزابێکی ڕوتە بۆ عاشق . سەیری شاعیر چەند سیحرکارانە مەبەسی خۆی ، کە داواکردنی وەصلە ، دەشارێتەوە لە نێو مەبەسێکی چەشم بەندانەی حەسانەوەی یار لە بەهەشتدا .

لە مانە گەڕێ : پارسەنگ بوون و لەنگەر بەستنێکی تر هەیە کە لە بەیتەکەی پیرە مێرددا نەبو . دەزانین بوونی یار لە نێو ئاگرستانی دڵ و سینەی عاشقدا بوونێکی خەیاڵییە نەك « بە لەش » ، کەچی چوونی یار بۆ ناو بەهەشتی چاو بە خەیاڵ نیە و بە هەمو لەشە ، کەواتە کوا لەنگەر بەستن ؟ بو لێرەشدا ئەو رەخنەیە نەگرین کە لە بەیتەکەی پیرە مێردمان گرت خۆ نالیش خەیاڵ و مادەی لەتەك یەکتردا داناوە ؟ ئا لێرەدا نالی دەسەلاتێکی ئەفسوناوی بەکار هێناوە بابی فلسێکیش ئەرکی بۆ بە خەرج نەبردوە ، هەر هەمان خواهشتی چوونی یار بۆ ناو بەهەشتی چاو کە جێی رەخنەیە و گومانی لەنگەر نەبەستنی لێدەکرێ بە خۆی و واتاکەی حەقیقییەوە دەبێتە هۆی راستەقینەی لەنگەر بەستن و پارسەنگ بون !! چوونی یار بۆ ناو بەهەشتی چاو هەر ئەوەندە بە لەشە کە چاوەکە دەیبینی ، ئەوەی بەڕاستی دەچێتە ناو چاوەکەوە وێنە و صورەتی یارە کە ئەویش هەر هێندەی خەیاڵەکە و تارمایيەکەی ناو دڵ و سینە مادەیە : وێنەی ناو چاو و خەیاڵی ناو دڵ پارسەنکی یەکترن و لەگەڵ یەکتردا لەنگەریان بەستوە وەك دوو تای تەرازوی یەك سەنگ . . لەمەڕا دەسەلاتە بێ سنور و یەکجار

مەشقۆر و لێسەلمێنراوەکەی نالی دەردەکەوێ کە ئەو سەرەڕای ئاخنینی هەڵبەست بە واتا و هونەر و جوانی و بەولای لەنگەر راگرتن و پارسەنگ کردنی لایەنەکانی وشە و واتا، هەر لە هەمان هۆی گومان لێ کردنی رەخنە بەدەستەوە دان و بێ ئەوە لە وشە وەیا رستەیێکی تری هەلبەستەکەوە رەخنەکە بڕەوێنێتەوە، هەر لەوێدا جوانی و بێعەیبی و بێرەخنەیی و هونەر و واتا هەڵدەڕێژێ. لەمانە بترازێ جارێ گەلێك ئیعجازی تر لە هەناوی بەیتەکەدا پەنهانە، یەکێك لەوان ئیعجازانە ئەمەیە :

نالی کە دەڵێ «چ دەکەی لەم دڵەی پڕ شەرەر و سینەی سۆزانمدا» و بەمەدا لە زاهیر رێی رەخنەگر دەدا کە پێی بڵێ چۆن رەوا دەبینی داوا بکەی خۆشەویستەکەت لە دڵ و سینەت دەرچێ ؟ جگە لەوە کە دەتوانێ رەخنەکە بەوە بڕەوێنێتەوە بڵێ من بانگ هێشتنی یار دەکەم کە بەچاو بیبینم نەك هەر بە دڵ تێی فکرم، بەڵی جگەلەم وەرامە وەرامێکی تری ئەوەندە بە هێزی بەدەستەوەیە هەر بەجارێ رەخنەگر قەرزداربار دەکاتەوە و لۆمەی تێنەگەیشتنیشی بە پاڵ دەدات.

رستەی «چ دەکەی لەم دڵەی پڕ شەرەر» دوو واتای جودای هەیە، یەکەمیان ئەوە بوو قسەمان لێ کرد و وا خەریکین بەر رەخنەی بگرین و لێشی رزگار کەین، وەك کردمان، دوەمیان ئەمەیە : چ لە دڵە پڕ شەرەرەکەم دەکەیت کە هەموی هەر ئاگرە و سوتاوە و

کـەلـکی ئەوەی نەماوە تۆ هیچی لێ بکەیت .. لـەم واتـایەدا داوا کردنی دەرچوونی یار لە دڵەکـە پەیدا نابێ تا رەخنەی ئەو داوایە لە شاعیر بگیرێ . کـەواتە نالی دوَ واتای سەرلەبەری ئامادە کردوە لە هەندێ وشەی بەیتەکـەدا ، یەکـێکیان دەبێتە سـوپەر بـۆ رەت کردنەوەی هەمتو توانج و رەخنەیێك کـە لەوی‌تریان بگیرێ بـۆ ئەوە من و تۆ لە رێی استدلال لە وشەکانی‌تری بەیتەکـەوە رەخنەگر پاشگەز بـکەینەوە : دەمەوێ بڵێم واتای دوەمی وشەکان پێویـست ناهێڵێ بەوە ئەو وصالە بکەینە وەرامی رەخنە کە لە رستەی « وەرە نێو جەننەتی دیدەم » دا دەفامرێتەوە چونکە دیـتمان رسـتەی « چ دەکەی لەم دڵە » مەرج نیە ئـەو واتایە بگەیەنـێ کـە رەخنەکـەی لێ گیرا و وصالەکـە پاراستی ، سەدەفەکەی نالی دوَ دوڕڕی تێدایە هاونرخ و هاوسەنگی یەکترن ، چ بەیەکەوە بن چ تاك تاك ، ئەو لەنگربەستن و پارسەنگ‌بوونە پێك دێنن کـە من لەم چەند دێڕانەدا دەوریان هەڵدەسووڕێنم . سەیریش لەوەدایە نە بەیتەکە هەڵاخنـاوتی پێوە دیارە نە واتاکان نەفەسیان سوار بوە نە هیـچ جۆرە نوقسانییێك هەیە لە داڕشتنی بەیتەکـە پێویست بکا یارمەتی بدرێ و لەلاوە واتای بۆ بخوازرێتەوە وەیا کەلەبەری پڕ بکرێتەوە .

شاعیر زۆرن لەوانەی نوکـتە و نازکی لە شـیعریاندا هەیـە ، بەڵام بەشی هەرە زۆریان پێیانەوە دیارە جێی نوکـتەکە خـۆش دەکەن لە شـیعردا . بە نموونە لێرەدا شـیعرێـکی نـاوداری

دکتۆر ئیبراهیم نــاجی میصری دێنمـەوە کـە بـۆتە گۆرانی و کۆلێکیش مەدحی دەکرێ : شاعیر دەڵێ :

و مشـینا في طریــق مقمـر
تثب الفرحـــة فیـه حولنـــا

و ضحکنا ضحك طفلین معـا
و عدونـــا فسبقنـا ظلنـــا

بەچاکی لە تێکرای هەردوو بەیتـدا دیارە شـاعیر بە خەیاڵیدا هاتوە بڵێ ( پێش سێبەری خۆمان کەوتینەوە ) کە بەڕاستی واتاییێکی جوان و تا بڵێی شاعیرانەشە، بۆ ئەم مەبەســـە لە بەیتی یەکەمدا « طریق مقر » پەیدا دەکا چونـکی واتاکەی پەکی کەوتوە لەسەر تیشـکێك سێبەر دروست کات تاکو بە غاردان لەگەڵ خۆشەویستەکەی لێی پێش کەونەوە. دیارە ئەگەر واتاییێکی بە خەیاڵدا هاتبا پێویستی بە تاریـکی هەبا بە ئاسایی دەیگوت :

و مشـــینا في طریـق مظلم

جگە لەم لایەنەی خۆ هێنان و بردن بۆ سازدانی جێگەی لەبار بۆ واتا لە هەڵبەستدا ، شاعیری عادەتی ، بەڵکو شاعیری پێشـکەوتوش ، لە تاکە بەیتدا هەر تاکە نوکتەیێك کەڵاڵە دەکات و هەر جێـگەی ئـەو تاکە نوکتەیەشی بۆ سـاز دەبێ ـ وەك زۆری یەكنەفەرتی کە جێگەی یەك نوێنی تێدا دەبێتەوە، کەچی نمونەکانی شـیعری نالی

ئەوەندە واتایەیان تێدا ریز کراوە چاو بە هەڵە دەچێ لە ژماردنیان هیچیشیان جێی بە دراوسێکەی تەنگ نەکردوە. گەڵێ لە بەیتەکانی نالی وەك کانگەی گەوهەر وایە تا لێی دەیتەوە گەوهەری تازەی تێدا دیار دەکەوێ. نالی هێندەش ئوستادە لە داڕشتنی بەیتەکانی نەك هـەر پێوەی دیار نیـە خۆی خەریك کردبێ بە ئامادە کردنی جێگە بۆ واتا، جارەهای جار وا بوە دوای لێ بڕنەوە لە شـیکردنەوەی بەیتێـکی و دڵنیا بوون لە گەیشتن بە هەمو واتا و جوانی و نوکتەی ئاشـکراونهێنی بەیتەکـە ئەوسـا واتایێـکی تەڕ و تازە لە نکاو خۆ دێنێتە ناو بیبیلەی چاوەوە هەر دەڵێی کلاوی سەخرە جنی لەسـەر نابێ و لای دا. ئەمە یەکـێکە لەو بەیتانەی هـەر جارە واتایێك بە دەسـتەوە دەدەن :

هـەر چەندە گونـاهی دەمەکـەت بارە لە سەر لێو
حەددی چیـــە نالی کـە بڵێ ماچـــە کەفارەت

واتایێکی رێك و پێك کـە وێنـەی ئاشـکرای وشـــە و داڕشتنی بەیتەکـە رای‌دەگـەیەنێ ئەو راستە واتایەیە کـە یەکـەم نیگـــای خوێنەر و یەکـەم بیستنی گوێی‌گر بۆی دەچێ :

گوناهی دەمەکەت کە عاشق شەیدا کردن و بێ‌بەش کردنیەتی لەو دەمەت بۆتە بار. ئەو بارەی سـەر دەمەکەش چ قورسـایی باری گوناهەکە بێ وەیا ئەو بارە بێ کە لە زاراوەی کوردیدا دەبێتە (لێـو بەبار) کەفارەتەکەی ماچە، بەو ماچە قورسایی گوناهەکەش لەسەر دەمەکە

هەڵدەستێ ، لێو بەباریەکەش دەڕەوێتەوە بە سڕینەوەی لێوەکان لە ئەنجامی لەیەکتر خشانیان بە ماچ ، بەڵام نالی حەددی نیە ئەوە بڵێ و ڕێی ناکەوێ تەمای بە شتی وەها بێ .

ئەو هێندە واتایە ئاشکرایە گەورەترین شاعیر پێی رازییە و شانازیشی پێ دەکا . هەمۆ کەرستەیێکی واتا و جوانی و هێز و سۆز و خۆبەکەمگرتن و ریزنان لە مەعشوق و ... هتادی تێدایە کە کۆ کردنەوەیان لە شیعردا بە هونەرمەندی زیدە دەسەڵاتدار و هەستیار و جوانکار نەبێ ناکرێ . بێی و هەر ئەوەندە واتا و جوانی و هێزە بدۆزیتەوە لە بەیتەکەدا شتێکی کەمت نەدۆزیتەوە بەڵام شتێکی زۆرت لەکیس چوە :

هەرچەندە گوناهی « دەمەکە »ت .. لێرەدا پۆرگێك هەیە پڕە لە وردەکاری و فتونی عیشق و عاشیقی . وشەی « دەمەکە » صیغەی « نهی »یە و ئەمرازی « دە »ی بە سەرەوەیە وەك کە بڵێی « دەمەخۆ ، دەمەڵێ ، دەمەڕۆ .. » واتای بەیتەکە لە عاست « دەمەکە .. ت »دا بە جارێ دەگۆڕێ لەچاو واتاکەی بەرچاو ، چونکە وشەی « دەم » لە ناودا نامێنێ و فیعلێکی نەهی جێی دەگرێتەوە . کە ئەمە وابێ واتاکە وای لێ بەسەر دێ : هەر چەند گوناهی ئەو نەهی کردنەی تۆ لە من بەوەدا کە چەندێکی بۆت ببزۆمەوە پێم دەڵێی « دەمەکە » و دڵم شکێنیتەوە ، ئا ئەم گوناهەی « دەمەکە »ت کە بۆتە باری سەر لێوت بە ماچ نەبێ

کـەفارەتی نایێ بەلام نالی حەددی نیە وا بلێ و ڕێـی ناکەوێ .

ئەم دوَ واتایە ، هەردوَیان ، لە لایێـکەوە هەڵپەسێرە و خۆت خەریك کە لەگەڵ وشەی « حـــدّ » کە بە ڕێنوَسی کوردیَ دەبێ « حەدد » بنوَسرێ . ئەم وشەیە لە رستەی « حەددی چیە ، حەددی هەیە .. »دا بە واتای « ڕێ‌کەوتن و لێ‌هاتن و ماف‌هەبوَن » باوە ، لەو دوَ واتایەی تازەش هێنامەوە هەر وەها بەکار هاتبوَ . لە زمانی عەرەبیشدا وشەی « حدّ » واتای سنوَری هەیە کـە وا ڕەنگە واتا کوردییەکەی هەر لەو ســـنوَرەوە هاتبێ لەو ڕووەوە کە « حەدد هەبوَن » راستەوخۆ سنوَری میانی دوَ شتان بۆ ئەو کەسە دادەگرێ کە حەددی هەیە . ئەم « حدّ »ە لە شەریعەت و « اصول الفقه »دا بوە بە زاراوە بە واتای سزای گوناهان ئیتر « حـدّ »ی دزیەتی ٨٠ دارە ر هی هەندێ گونـاه ڕۆژوە وەیا برسی تێرکردنە وەیا بەنـدە ئازاد کردنە ... کـە وشەی « حدّ » بۆ ئەم واتایە ببەینەوە بەیتەکە دەبێتە پرسیار و وەرام :

هەرچەندە گوناهی دەمەکەت بارە لە سەر لێو
حەددی چیە نالی ؟ کە بلـێ مـاچە کـەفارەت

لە مصرعی یەکـەمدا ڕوَی وتوویێژی شاعیر لەگـەڵ یارەکەیتی ، بەڵام لـــە مصرعی دوەمدا ڕوَی پرســـیار لە یار وەردەگـێڕێ و بای‌دەداتەوە سەر خۆی ، کە ئەمە « مخـاطب » گۆڕینێکە زۆر پەسند

بوە لە ئەدەبی کـوردیدا تەنانەت لەمەدا پەیڕەوی شێوازی قورئانیش کراوە .

بەڵام ڕێـی تێ دەچێ نالی لە مصرعی یەکـەمیشدا وتوویژی لەگـەڵ خۆی بێ و بڵێ گوناهی دەمی نالی کە « مخاطب »ە بۆتە بار لەسەر لێوی ، ئەوجار لێی دەپرسێ ئەرێ ئەی نالی « حدّ »ی ئەم گوناهە چیە کـە بۆتە باری سەر لێوت ؟ خۆی وەرام دەداتەوە، کە هەر خۆشی نالییە ، و دەڵێ حەددی ئەم گوناهە ئەوەیە یار بڵێ ماچە کـەفارەت . لە شەریعەتدا کـەفارەت بۆ خۆی بە واتای ئەو « حدّ »ەش دێت کە لێرەدا مەبەستمان بێ .

خۆلاسـە « مخاطب » لە مصرعی یەکەمدا یار بێ وەیا نالی بێ ، مصرعی دووەم دەشێ ببێتە ئەو پرسیار و وەرام دانەوەیەی باسم کرد ، واتای وشەی « حدّ »یش ئەو سزایە شەرعییە بێ کـە لە « تلك حدودُ الله »ەوە وەردەگیرێ . تا ئێستا ، وابزانم ، سێ تۆزۆاڵمان لە واتاکانی ئەم بەیتە هەڵـگێڕایەوە بێ ئەوە هەستمان کردبێ بە هیچ جۆرە هەناسە سـوارییێك وەیا وەتەنـگ‌هاتنێـك لە لایەن خاوەنی بەیتەکەوە کە « نالی »یە . کە ئینـصـاف بەکاربێنین و داد بە حـەقدا بێنین دەبێ بسـەلمێنین ئەو سێ واتایە نەك هەر بەسن بۆ بەیتێك بەڵـکو لێشـی زیادن چونـکە ئەگەر وا نەڵێین دەبێ شاعیران مەنع کەین لە گوتنی بەیتی خاوەن یەك واتا و دوو واتا . لەمـەدا چ تەگـەرە نیە ، بـەڵام سەیر لەوەدایە جارێـکیان لەگـەڵ یەکێك لە ئەدیبە ناسـراوەکانماندا

باسی ئەم بەیتەم دەکرد و بەیەکەوە خەریکی سەر پۆش لەسەر هەڵگرتنی بوین و بەدوا قەتار کردنی ئەو سێ واتایەدا لە نکاو ئەدیبەکە گوتی ئای کە بێخەبەرین و ئاگامان لەوە بڕاوە وشەی « دەمەکەت » دەشێ بە واتای « خوێنەکەت » بێ چونکە (دەم ـ دم) لە عەرەبیدا بە خوێن دەڵێن ، خۆ دیارە دەم و لێویش کە جوان بێ لە سووریدا وەك خوێن دەنوێنێ و رێی تێ دەچێ بگوترێ رشتنی خوێنی عاشقان بە هەمێ رەنگی سوورییەوە لەسەر ئەو لێوانە بۆتە بار ... خولاسە کە زیهن چێ بۆ لایەنی واتای خوێن لە وشەی « دەم »دا ، بەیتەکە سەرلەنوێ دەبێتەوە بەو زەویە نەور و تەڕەی کە وا بە ئومێدی ئاوی زۆر بیری لێ هەڵدەکەندرێ و لە ئەنجامدا کارێزی لێ پەیدا دەبێ .

دەبینی هەڵگوشینی شیعری نالی تا ئەو رادەیە وشەکانی و واتاکانی دێت کارێکی بە کێشەیە نەفەسێکی درێژی پێ دەوێ . سەرەڕای کێشە تابشڵێی ورد و چاوخەڵەتێنە ، مێقلاشی وزەڕەبینی نەبێ زەفەریان پێ نابات ، رەنگە ئەوساش زەفەرپێبردن هەر یەکجار زەحمەت بێ . بەڵام پاداشی هەڵێنانی گەوهەرەکانی لەزەتێکی ئەوەندە گەورە و بێهەمتایە هەمێ خۆپێوەماندوکردنێك و لەگەڵخەریکبوونێك دێنێ . چ سەیرێکیش لەم گوتەیەمدا نیە ، چونکە ئاگامان لێیە دەوڵەتانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا خەریکن بۆ کاری زیهن بزیوی وەك شەترنج وەیا یاری لە شەترنج بەرەژێرتر

فێرگە دەکەنەوە و پسپۆڕ و ئوستادی شارەزا تەرخان دەکەن و پاداشی گەورە دادەنێن بۆ سەرکەوتوەکان لەو یاریانەدا ، تەنانەت هافزکێی نێو دەوڵەتانی بۆ ڕێك دەخەن و جیهان بەگەلان و بەحکومەتانیەوە پێیانەوە خەریك دەبن ئیستگەکانی رادیۆ و تەلەفزیۆن خەبەری بزافتنەوەی بەردێك لەو بەردانەی سەر تەختەی شەترنجەکە بە خەلق رادەگەیەنن وەك ئەوەی ڕوداوێکی گرنگی ئابوری وەیا رامیاری وەیا کۆمەلایەتی وەیا زانستی ڕوی دابێ . خۆ دەشزانین ئەم یاریە و هەمو یارییەکی وەك ئەو هەر هێندەی سود تێدایە کە زیهنی چەند کەسێك لە پەراوێزی خۆیدا تیژتر دەکا ، هەڵسوڕ و داسوڕی یاریچییەکانیش هونەری پسپۆڕانە نیشان دەدەن سەرەڕای ئەوە کە یاریەکە بۆ خۆی میراتێکی کۆنی هونەری ئادەمیزادە ، خۆ هەرچی جیهان هەیە ببێتە شەترنجزان یەك لوقە نان ناخەنە ناو زاری مرۆڤێکی برسییەوە . وا لەم کاتەی کە ئەم دێڕانەی تێدا دەنوسم و ڕێکەوتی ڕۆژی چوارشەمۆی (۲۷)ی تشرینی دوەمی ساڵی (۱۹۷٤)ە بەشێکی یەکجار زۆری ئەفریقا دوچاری قات و قڕی بوە و بە ملیۆن خەلق ئاوارە بون بەدوای خۆراکی نمر و نەژیدا چەندین هەزار کەسیش لە برسان مردن و چەندین هەزاریتریش خەریکی مردنن ، کەچی بلیمەتەکانی شەترنجزانی سۆڤیێت و ئەمریکا و دەوڵەتانیتر بە یاریدەی حکومەتەکانیانەوە خەریکی ( کش مات ) ی شەترنجن نە خۆیان و نە حکومەتەکانیشیان بیر لەوە نا کەنەوە پارە و

مەسرەفی ئەو یاریی و هاقژکێیانە بدەن بە برسیەکانی ئەفریقا ، کەسیش گلەیی‌یان لێ ناکا و پێیان نالێ ئای چەند بێ ڕەحم و بێ ئینسافن لە حاڵێکدا برا ڕەشەکانمان گیان دەدەن بە دەست برسیەتیەوە ئەم دەوڵەتە ئاتۆمیانە خەریکی کەیف و بەزمی شەترنجن . ئەوەی ڕاستی بێ منیش لە لانی خۆمەوە چ گلەییەکیان لێ ناکەم و دەزانم برسی بوونی ئەفریقا دەخلێکی بەسەر شەترنجی ڕوس و ئەمریکاوە نیە ، ئەو چەند ملیۆنەی سەرفیش دەکرێ بۆ شەترنج دەبێ هەر سەرف بکرێ دەنا یاریەکە کوێر دەبێتەوە ، لە جیاتی بڕینی مۆچە و بەراتی شەترنجزانانیش باشتر ئەوە بوو لە مۆچە و بەراتی چەکی شەڕ کەم بکرێتەوە وەیا لە مەسرەفی پۆلیسی نهێنی دابشکێ ... بەڵام کە ئەمە وا بێ و هێندەم بەلاوە ڕوون بێ دەبێ بشزانم ، ئەگەر شەوکوێر نەبم ، خەریك بوون بە شیعری نالییەوە بەتایبەتی بۆ ڕۆشنبیرێکی کورد صەد جاران پیرۆزتر و بایەخدارتر و بەشەرەفترە لە خەریك بوونی ڕوسێك وەیا ئینگلیزێك وەیا عەرەبێك وەیا کوردێك بە یاریی شەترنجەوە ، نەك لە یەك سەر بەڵکوو لە گەلێك سەرەوە :

١ـ هەر وەك یاریی شەترنج زیهنی یاریچی تیژ دەکا شیعری نالی لەویش زیاتر زیهنی ڕۆشنبیر دەکاتەوە و ڕای دێنێ بە هەڵێنانی مەتەڵی زیهنی لە مەیدانەکانی ئەدەب و وەك ئەدەبدا کە ڕامیاریی و ئابووریی و هونەریی ... یە . دەتوانم گرەو بکەم لەسەر ئەوە دۆزینەوەی تەڵەی شەترنج کە گەورەترین زانای شەترنج

نـابێتیەوە کەمـتر زیـهن‌کاری دەوڵی لـە دۆزینـەوەی تەڵـەی واتا کەنـاڵی خسـتۆتیە نێوان هەنـدێ هەڵبەسـتەکانیەوە . کە دەڵێم (گرەو دەکەم)ئـەوە بزانە لە پێشـەوە گرەوەکەم بردۆتەوە چونـکە نزیـکی ۱۵۰ سـاڵ تێ‌پەڕیوە بەسەر بەشـێکی ئەو تەڵانەی نالی تـا ئێستاکەش بـە کـەس نـەڕەواوەتەوە .

٢ـ خەریك بوون بە شەترنجەوە هەر لە مەیدانی شەترنجدا زیهن تیژ دەکا ، رەنـگە لە مەیدانەکانی (انسانیات)دا زیهن کوێرکاتەوە بە پێچـەوانەی نوکـتە شـیعری نـالی کە بەبەریەوە هەیە زیهنی مرۆڤ بـکاتەوە لە هـەمو مەیدانەکانی (انسـانیات)دا چونکە خۆی یەکێکە لـەو مـەیدانانە . باوەڕم هەیە تـۆ کە توانیت واتـــا نهێنیەکانی شـــیعری نـالی هەڵێـنی بە ئاســـانی دەتوانی درۆ و فێلبـازی پێشـەوایێکی ســیاسەت وەیا تەریقـەت تێ‌بـگەی و خــۆتی لێ بپـارێزی ، بە مەرجێـك ترسـت نەبێ لە دان‌هێنان بە راســـتی‌دا کۆمەش نـەکەی لە دۆزینـەوەی درۆ و دەلەسـەی کەســێك کە خۆشـت دەوێ وەیا لە پـلەی حیزبایەتی‌دا لە خـۆت هەورازترە .

٣ـ ئۆیینی شەترنج بەرتەسکە لە روقعەی شەترەنجەکە تێ‌ناپەڕێنێ ، لەوانەیـە نەخـوێندەوارێك ببێتە گەورەترین زانـای شـەترنج . بە نموونـە دەڵێم کاك نـوری برای کاك موســـتەفای کاکی هـیران شـەترنجی لە پـسپۆڕەکانی ئینگـلیز دەبردەوە ، خـۆ ئەگەر بە تەرازوی شەهادە و خوێندنی رەسمییان هەڵـکێشین کاك نوری مەکتەبیشی

نەدیتبو . نوکتەی شیعری نالی نەك هەر نەخوێندەوار تێی ناگا ، تاك‌تاکە خوێندەوار نەبێ سەرەدەرییان لێ‌ناکا ئەویش لە هەمو نوکتەکان نا ، بە ئاسانیش نا . بە تەنها زیرەکی و وردبینی چەکی ئەو شەڕەنین کە شیعرەکانی نالی بەرپای دەکەن : دەبێ لەگەڵ زیرەکی‌دا هەمو زانستەکانی سەردەمی نالیش کۆببێتەوە و کەڵەکەی پێ بکرێ لە سەر شیعردۆستی و ئاگاداری فنونی ئەدەبی کلاسیکی و ئاشنایی بە دیوانی زوربەی شاعیرەکانی ئیسلام . روقعەی واتا و نوکتەی شیعری نالی سەرەڕای زەکای مرۆڤ هەمو ئەدەب و زانستەکانی ئیسلامی سەردەمی ( نالی )یە . سەیر لەوەدایە شەترنجیش یەکێکە لەو کەرستانەی پەکی لەسەر دەکەوێ بۆ زانینی واتای هەندێك لە بەیتەکانی نالی :

(ماتم) وەکو زولفەینی سیەه گرتی سەراپات
پۆشی لە روخت تەعبیەیی بەیدەق و شامات

وشەی ( شامات ) ناچارت دەکا بزانی ( شا ) لە یاری شەترنجدا ( مات ) دەبێ لە پێشەوەش مەجبوری کردبوی کە بزانی لە عەرەبی‌دا ( شامات ) رێژە جەمعی وشەی ( شامة )یە بە واتای ( خاڵ ) کە لە روی یاردا وەك بەیدەقی سەر تەختەی شەترنج ( تعبیە ) کراوە و ( ماتم ـ ماتەم ) و زولف پۆشیویانە .

کەبێین بەراوردی شیعری نالی بکەین لەگەڵ یاری شەترنجدا ، لە هەر روێکەوە بێ ئەو بەراوردی کردنە ، دەبینین بەڕاستی شەترنج

یەکێکە لەو نۆکەرانەی دەستەونەزەر رادەوەستن لە دیوانی شیعری نالیدا . لە نوقتەی بەرامبەردا ، یاریی شەترنج کە خۆی کەرستەیێکی شیعری (نالی)یە چ پەکی نەکەوتوە لە سەر تێگەیشتنی شیعر ، هی نالی بێ یا شاعیرێکی تر : شەترنج دیوان و دیوەخانەی نیە زانستێکی دەرەوەی خۆی ببێتە نۆکەر تێیدا . لەم مەیدانەدا شەترنج وەك ئەو بۆرە پیاوەیە دەسەڵاتی بەسەر کەسدا راناشکێ مەگەر بە سەر خۆیدا ، رووتەیێکە لە ناو کۆڕی مرۆڤی کۆك و پۆشتەدا .

٤ـ ئەمرازی یاریی شەترنج بە هەمتو هونەری،خۆی و شارەزایی و زیرەکی شەترنجزانەوە تەختە و بەیدەق و پەیکەری روخ و فیلە کە هەمتویان بێگیان و سارد و سڕن ، لە خۆیانەوە بە دەنگ نایەن و چ پەیامێك راناگەیەنن ئەگەر من و تۆ بە دەنگیان نەهێنین ، بەڵام ئەمرازی شیعر ، هی نالی بێ وەیا هی شاعیرێکی تر ، وشەی واتادار و هەستیارە کە زادەی دڵ و خوێن و مێشکی خاوەنەکەیەتی . دەوجا بۆخۆت تێفکرە لە جوداوازیی میانی دوو هۆی زیهن بزێو کە یەکێکیان بەردی رەق و یەکێکیان خۆربەی هەناو بێ .

من لێرەدا ئەم لایەنەش ناکەمە یارمەتیدەری شیعر کەبڵێم لێی دەوەشێتەوە ببێتە رابەری مرۆڤ بۆ رێی چاکە لە حاڵێکدا شەترنج چ رێیان بەکەس نیشان نادا ، چونکە مومکینە بگوترێ شیعر لەوانەیە رێی خراپیش بە مرۆڤ نیشان دات نەك هەر هی چاك ، قسەکەش راستە بەڵام ئەم دوبەختییە وەنیە هەر لە شیعردا پەیدا

بێ ، هەرچی بەرهەم هەیە وایە یەك لەوان باروَت کە شتێکی زۆر چاکە بۆ رێگەبێ خۆش کردن تا بشڵێی بەدە بۆ پیاوپێ کوشتن . شەترنج بۆ خۆشی لەوانەیە بە رێك و پێکی بکرێ لە ژێر سەرپەرشتی کردنی لایەنی بەرپرسی دەربەستی چاکە و خراپەدا ، لەوانەیشە ببێتە قومارێکی ئاسایی کە هەر تەڵفاندنی کات و ماڵی لێ روَدەدات . من لەم بەیەکدی گرتنەی شەترنج و شیعردا خۆم ناکەم بە واعیز و قەمچی هەڕەشەلێ کردن بە دەستەوە بگرم وەك ماموِستاکانی سەردەمی سوختەخانە پەند و رەوشت و ئایین فیری خەلق بکەم ، تەنها لە روَی بایەخ و نرخی زیهنی و هونەری و مرۆڤایەتی سادەی رەنگ لێ نەدراوەوە بە یەکتریان دەگرم بە مەشدا بەلای شەترنجمدا شکاندوە چونکە شیعری پەند و دینداری تابڵێی زۆرە ، قسەی دژی یاری و خۆخافڵاندن ئەویش هەر زۆرە کە شەترنجیش دەگرێتەوە و دەیشکێنێتەوە .

کە بمانەوێ لە سەر ئەم بەیەکدی گرتنە بەردەوام بین دەتوانین چەند ئاڵقەیێکی تریش بخەینە سەر زنجیرەی ژمارەی راشکانی شیعر بەسەر شەترنجدا بەلام پێویست بەم ئەرکە نیە ، چی تازە لە گوتنی بوَمەوە بەسە و زیادیشە لە مەبەس . نیازی بنجی لە هێنانە ناوی شەترنج راکێشانی سرنجی ئەو خوێندەوارانەیە کە بێ‌پەروا و بەشانازییەوە شیعری نالی و ئەمسالی نالی بێ‌بایەخ دەکەن و دەکەونە دژی . چ گومانم نیە لەوەدا کە ئەم تەرزە خوێندەوارانە روَژەك لە روَژان خەیاڵیان بوَ ئەم لایەنەی یاری شەترنج و بایەخ پێدانی نەڕوِیشتوە

دەنا دەبێ یەك لە دوو کاران بکەن : یا واز بێنن لە دژایەتی ئـەدەبی کـۆن کە مەعلومە هەزار جاران لە شەترنج سوودبەخشترە یاخود بکەونە دژی شــەترنج و یاریەکانی وەك ئەویـــش ، ئەو حکومەتانە و رێكخراوانەش تاوانبار بکەن کە خۆیان و عالەم بە شەترنجەوە خەریك دەکەن . دەمێنێتە بڵێین ئەدەبی کـۆن مێشك و دڵی خەلق بۆ لای بیروباوەڕی کـۆنەپەرستانە رادەکێشێ کە ئەمە زیانی بەولای هـەموو سوودێکەوەیە لێـی وەربگیرێ ، لە زیانی یاریش پترە کە هەر بریتییە لە بەفیڕۆچوونی کات و چالاکی و کار ناکاتە سـەر بیروباوەڕ و دڵ و دەروون . بۆ بەرپەرچ دانەوەی گوتەیێـکی وەها کە رۆشنبیری ئەمڕۆ لە دژی ئەدەبی کۆن بە زیهنیدا تێپەڕێ دوو وەرامم هەیە لێرەدا دەیانکەم بە پـــاشگەزکەرەوەی رەخنەی ئەوتۆیی ، چـــەندین وەرامی تریشم هەن خوێنەریان پێوە خەریك ناکەم :

وەرامی یەکەم : رابردووی میللەتان هەر ئەدەب و شیعری تێدا نەبوە کە ئێستا ئێمە بیکەین بە نموونەی پاشکەوتوویی و بە شـــیر و خەنجەری رەخنە و نەفرین ئەنجئەنجی بکەین . شـــیعر و ئـــەدەب دێرێـــکین لە رووپەڕەی ژیانی کۆمەڵایەتی کۆن ، لە پێـــش ئەودا و بەدوا ئەودا چەندین دێڕ دێـــن رووپەڕەکە پڕ دەکەنەوە . کە ئێمە ئەوەندە خۆمان هەڵدەینەوە بە دژایەتی شتی کۆنەپەرستانە و لە پەنا ئەو خۆهەڵدانەوەدا ئەدەبی کۆن تاوانبار بکەین و لە نـاوی ببەین دەبێ ئەم دڵسۆزییە بیژۆکمان بە گـژ هەمـوو رابردوومانـدا بێنێ و

بەرماندداتە گیانی هەمو مێژوو بە هەمو ڕوداو و کردار و گوفتاریەوە نەك هەر تاکە میراتی شیعر ، یەخە گیری سەرلەبەری خەلقەکەشمان بکا بە مەلا و شێخ و کاسب و عەمەلە و فەللاح و توجاریەوە نەك هەر شاعیر . خولاسە ئێمە ئەگەر دەست درێژ کەین بۆ خنکاندنی شیعر و شاعیری کۆن دەبێ تێکڕای رابردو لەناو ببەین و بسڕینەوە چونکە بەو گەز و گرێیەی شاعیر دەکاتە کۆنەپەرست هەمو رابردو کۆنەپەرستە تەنانەت شیعر لەچاو زوربەی لایەنەکانی تری بیروباوەڕی کۆمەلایەتی لێرەبەپێشەوە زۆر بە پێشکەوتوش دەژمێررێ . تۆ بێنە شیعری نالی وەیا حافظ وەیا أبو العلاء المعری وەیا مەلای جزیری بخە تەنیشت وڕێنە و کڕوکاڵە جنۆکاویەکانی فەللاح و کاسبێکی ٢٠٠ ساڵ پێش ئەمڕۆ دەبینی شیعرەکان وەك شۆرش خۆ دەنوێنن لەچاو ئەو وڕێنە یەکجار دواکەوتوەدا ، گیانی نەسەلماندن و ریزلەخۆگرتنی شاعیرەکانیش وەك شیعرەکانیان دە جاران لە گیانی سەرکزەلانە و خۆبەکەمگرتوانەی چینی هەژاری ئەو سەردەمانە مەردانەتر و ئازایانەتر هەڵدەچەقن لەبەر چاوی بینەری ئەمڕۆدا . کە بێین و چینی هەژاری لەمەوپێشیش بکەینە بەرەوان و لە رەفتاری وانەوە حوکم بەسەر ئەو شاعیرانەدا بدەین ، ئەوساش شاعیرەکان لەچاو زوربەی میللەتدا هەر لەپێشەوە دێن چونکە چینی هەژار ریزیان لێ ناون و لە خۆیان بەپشتەوەتر داناون . من کە ئەم راستییە دەڵێم رقی خۆمی پێ هەڵناستێنم لە کرێکار و جوتیاری دوێنێ کە

نەی‌توانیــوە و نەی‌زانیــوە شـۆرشگێڕ بێ ، کە واقیعی کرێکار و جوتیاریش لە تەنیشت واقیعی شاعیری کـۆن دادەنێم بۆیەمە تاکو ئەو رۆشنبیرەی دەست درێژ دەکا بۆ کوشتنی شیعر و شـــاعیری لەمەو پێشـــان ج چـاری نەمێنێ و دەســت بـگێڕێتەوە لەو ستەمە چونــکە کە دەست نەگێڕێتەوە لە شاعیر و ئەدبی کۆن دەبـێ دەرحال خـــۆ بکاتە جەللادی بێ‌فێڵی عەمەلـــە و فەللاحی لێـرە بەپێشەوەش : هەرگیز رەوا نیە رێ بدرێ بە رۆشـنبیرێکی ئەمڕۆ شانازی بکا بە خۆپێف‌دانی دەست نەپاراستن لە کوشتنی شیعر و شاعیری لەمەوپێش بە ناوی دژایەتی بیروباوەڕی پاشکەوتو لە حاڵێکدا ماوەی بە خۆی داوە کوڕێنی بکا بە هەژاردۆستی و پرۆلیتاریاپەرستی کەچی هەرچی بیری پاشکەوتو هەیە لای ئەو هەژارە بێ‌چـارە هێلـکەی کردوە و جوجەڵەشی هەڵێناوە . دەبێ لەو رۆشـــنبیرە بکەیەنین بە کوشتنی شاعیر خۆی دەکاتە جەللادێـکی بێ‌داد و ستەمکار کە هیـچ عوزرێـکی بە دەستەوە نەبێ ، چونکە ئەو لەو کوشتنەدا پێشکەوتوترین تاقی مێژو دەکوژێ دواکەوتوترین تاقی مێژوش ئازاد دەکات کە ئەمە راستەوخۆ دەبێتە ( هەڵپەرستی ) بێ پێـچ و پەنا لـــەو روەوە کە هەمومان دەزانین بەڕواڵەت خـۆدانەپاڵ چینی هەژار بۆتە مـۆدەی ئەم رۆژانەمان بە زۆریش خۆدانەپاڵەکە چی تێ ناچێ وەك مەسەلە زۆر مەشورەکەی « خەنجەر لە کا » . کە عوزری شاعیری لەمەوپێـش نەسەلمێندرێ لەوەدا کە نەی‌توانیوە و نەی‌زانیوە شـیعری ئازایانەتر و

ئازادانەتر هەڵبەستێ دەبێ عوزری عەمەلە و فەللاح و کاسب و خەلقی تریش نەسەلمێندرێ لەوەدا نەیانتوانیوە و نەیانزانیوە ، هەر نەبێ ، بە قەدەر شاعیری سەردەمی خۆیان پێشکەوتوو بن . ئەم « بانێکە و دوو هەوا »یە میللەتی نەخوێندەواری لێرە بەپێشەوە نەیسەلماندوە چۆن ڕۆشنبیرێکی سەردەمی ئاتۆم لە خۆی دەسەلمێنێ وەیا بەخۆی ڕەوا دەبینێ ! ڕۆشنبیرێك کە شیعری نالی ڕەفز کا دەبێ ئایین و میرات و بازرگانی و مارەکردن و تەڵاقدان و جووتی گازەش و ئاوی ئاوبارە و ئاشی ئاو و دەستاڕی گەنم و کزەی چەڵتووك و هەمۆ سەروبەرێکی تری ژیانی سەردەمی نالی ڕەفز کا چونکە شیعری نالی بەشێکی پێشکەوتوە لە ناو پەراوێزی تێکڕای ئەو کەلەپۆرەدا . خەڕەکی خەڕەکڕێس و تەشی تەشیڕێس لە چاو سەردەمی خۆیاندا ناگەنە هیچ کامێك لە بەیتەکانی نالی ، ئەویش لە چاو سەردەمی خۆیدا کە هەر دەکاتەوە سەردەمی خەڕەك و تەشی . شیعری ئەحمەدی خانی لە ریزی پێشکەوتووترین شیعری سەردەمی خۆی و دوای خۆشیەوە دێت کە ئەوسا گەلی کوردی بێچارە لە باری ژیانی مادیەوە چی ئەوتۆی لە ژیانی سۆمەر و ئاکاد تێنەپەڕاندبوو . دەتوانم بڵێم ئێستاش ناوچەی ئەوتۆ هەیە لە کوردستاندا فەللاح و شوانەکانی نموونەی مرۆڤی چوار هەزار ساڵ لەمەوپێشمان نیشان دەدەن کەسیش ڕێی نیە بڵێ دەبێ ئەمانە لە ناوببرێن چونکە لەچاو ڕۆژگاری خۆیان دواکەوتوون . کە ئەمە وابێ بۆچی هەمان فەللاح و شوان

دەشێ فەتوای لەناوبردنیان دەرچێ کە هات و بوون بە شاعیر و یەك دوو بەیتی دواکەوتوویان بەسەر زماندا هات چونکە مەعلوومە ئەو شاعیرانەی پێیان دەگوترێ دواکەوتوو لەو فەللاح و شوانانە بوون کە بۆیان رێك کەوت لە رێی خوێندنەوە بوون بە شاعیر . چەند سەیرە رۆشنبیری کوردی ئەمڕۆ باری زیهنی و فەلسەفی و بیروباوەڕی لەو رادەیەدا بێ کەسێکی وەك نالی ببەخشێ و گلەیی لێ نەکا ئەگەر شاعیر نەبا و جووتیارێکی جنۆکەپەرست با ، جووتیاریش تاوانبار بکا ئەگەر شاعیر با . بەو پێیە دەبێ رابردوومان بە باهەڵدراوی خۆش بوێ و تا سەرەوبنی نەکەین ریزی لێ نەگرین . زۆر زەحمەتە دڵ و دەروون و بیروباوەڕی وەها لە هیچ کەلەبەرێکی منطقەوە ئاخاوتنی لەگەڵدا بکرێ ، بۆ کەسیش نالوێ تەپوتۆزی بە سەهوچوونی لێ بتەکێنێ تا لە خۆوە لێی دەتەکێ چونکە لە هەڵوەستێکدا نیە هیچ شت لە هیچ کەس بسەلمێنێ . ئەوەی چاوەڕوان دەکرێ لە بەسەهوچوونی قووڵ ، پتر تووڕە بوون و کیف بوونەوەیە لە بەرامبەر هەر راستکردنەوەیێك کە دۆستانە بەرەوپیری بچێ و لە ئاست هەر رەخنەیێك کە برایانە لێی بگیرێ . گوتەی کۆنینەی « کە گوترا حەق ئاو رادەوەستێ » بۆ مرۆڤی عادەتی بەڕاست دەگەڕێ ، مرۆڤێك بە سەهو چوونی لێ ببێتە فەلسەفە راستییان بە حەق نازانێ تا بۆی راوەستێ .. بە داخەوە .

وەرای دوەم : بیروباوەڕی ئەم تەرزە خوێندەوارانەش رۆژەك

دڵی ببێتە کەڵەپۆری رابردوو و چینی پاشەڕۆژ بە قینوبێزەوە سەیری بکەن و لچك و لێوی لێ هەڵێنن و بڵێن ئای لەم بیروباوەڕە دواکەوتوە قوندیلەیەی سەردەمی تاریکستانی کۆن ! کە ئەمە دەڵێم زۆرم حورمەتی ئەو خوێندەوارانە و بیروباوەڕەکانیان گرتوە بەوەدا کە بێبایەخ کردنیان دەخەمە بەر حوکمی دوارۆژ چونکە، راستییەکەی، لە ئەمڕۆوە ڕێی بێبایەخ کردنیان لە بەر هەموو کەسێکدا راستوڕەوانە نەك تەنها لە ڕووی ئاشکرایی بەسەهوچوونیانەوە بەڵکو بەهۆی کرداری خودی خۆیانەوەش چونکی کە حەلاڵ بێ بۆ وان ئەدەبی غەیری خۆیان نابوود بکەن حەلاڵیشە بۆ یەکێکی تر ئەدەبی وان نابوود بکات . زۆر بە ئاسانی و ئاسایی دەتوانم بەو کەسە بڵێم کە رابردوومان ریسوا دەکات و رۆژگاری ئێستاکەمان بە حەرامزادە لە قەڵەم دەدات : تۆ کە بێئینسافانە حازرمان لێ دەکەیتەمنداڵی بیژووی رابردوو، سەر لەنوێ، دوارۆژیشمان دەکەیتەوە بە منداڵی حەرامزادەی ئەمڕۆکەمان چونکە گومان لەوەدا نیە تۆ کە نەتوانی دەماری پەیوەندی ئێستاکە لەگەڵ رابردوودا بدۆزیتەوە و بیانکەیتەوە بە باوك و روڵەی شەرعی، هەر بەجارێ ناتوانیت دوارۆژێك پێك بێنیت کە بشێ پێی بگوترێ رۆڵەی شەرعی ئەمڕۆ . . ئەمە ناتوانیت بایی رازی کردنی خۆت چ جایی بێڕازی بوون و سەلماندنی خەلقی تر . خۆ تۆ خالق نیت لە بورجی عاجیتەوە رۆڵەی دوارۆژ لە دایکی ئەمڕۆکە بەوەلەد بێنیت بەپێی وەسیقەی مارەکردنی لە باوکێکی کە گۆڕانی مێژوویی راستەوخۆی بێ درۆ و

فێڵوفەرەج بێت . . تۆ کە خالق نیت ساحیریش نیت بە چاوبەستەکێ وەسیقەی ساختەمان بە دروست بێنیتە بەر چاو یاخود چاوی مرۆڤی دوازۆژ نابینا کەیت و ئەو هەڵەیەی پێ بسەلمێنیت کە خۆت مەبەستتە .

خۆ بە سەهۆبردن لە ئاست (ممکن و ناممکن) هەمۆ رێگەیێکی منطق و هەوڵش و لێکدانەوە پەك دەخات/ . خواهشت کردنی بیروباوەڕی مۆدێلی ١٩٧٠ لە شاعیری ١٨٥٠ ڕێ دەدا خواهشت بکرێ لە شاعیری ئەمڕۆمان فڕۆکمان بۆ دروست کا بە نۆکی ئەو خامەیەی لەو زیاتر شك نابا ، لە خەیاتیش خواهشت بکرێ بە دەرزیەکەی بیری نەوتمان بۆ لێدات/ . خولاسە هەمۆ ناموەکینێك خواهشت بکرێ لە هەمۆ کەسێك ، بەر لە هەموان ئەوان ڕۆشنبیرانەی خواهشتی ناموەکین دەکەن لە ڕۆژگاری ڕابردۆ .

باوەڕ هێنان بەوە کە شیعری کوردیی سەدەی نۆزدەم مردوە وەیا کاتی بەسەرچوە وەك باوەڕ هێنانە بە مردنی دوێنێی خۆت وەیا هەر نەبێ بەسەرچۆنی . من کە ئەمە دەڵێم هەرحیسابی بەسەرچۆنی ڕۆژەکەم کردۆیت لەوانەیە سەرەڕای بەسەرچونی پێنج شەمۆ و داهاتنی هەینیت ، بیروباوەڕی ئەمڕۆشت لە هی دوێنێت جودا بێت چ بە دوێنێی خۆشت ناڵێی مردۆ وەیا دواکەوتۆ رەنگە شانازیش بکەیت بە گوزانی قەناعەتەکانت لە دوێنێوە بۆ ئەمڕۆ و بڵێیت ئەمە بەڵگەی بەرەوپێشەوە چۆنمە . خۆ ئەگەر نەختێك نیگات فراوان .

کەیت و هەندێکیش ئینساف بخەیتە ناو نیگاکەتەوە دەتوانی فەتوای ( نەمردن و بەسەرنەچوون ) بۆ ئەدەبی لە خۆت بەپێشەوەش دەرچوێنیت وەك بۆ رابردوی شەخسی خۆت دەرچواند ، ئەوسا بە دڵێکی حەسایەوە و بێ گرێ و گاڵ خۆت بە میراتگر و رۆڵەی شەرعی ئەو رۆژگارە بژمێریت ، کە بەڕاستیش هەر وایت ، و هەوڵ دەیت میراتەکە دەوڵەمەندتر کەیت و بەرەوپێشەوەتری بەیت ، دواییش دەوری کەیتەوە بۆ دوارۆژێك کە ئەویش رۆڵەی شەرعی خۆت دەبێت .

میللەتانی تریش وەك کورد ، دە هێندەی کوردیش ، ئەدەبی کۆنیان هەبوە و پارێزراوە . ئەومیللەتانە جارێکی تریش لە کورد بەختیارترن لەوەدا کە رۆشنبیری ئەمرۆیان ئەدەبی کۆنیان تاوانبار ناکەن . بەڵێ راستە ئەو میللەتانە هەر خاوەنی ئەدەب نەبوون ، باری مادیشیان لەچاو رۆژگاری کۆن پێشکەوتوو بوە ، لەمەوە رەنگە بگوترێ لانی مادی پێشکەوتوو شەفاعەت دەکا بۆ ئەدەبەکەیان ئەگەر پاشکەوتوش بووبێ ، کەچی من دەڵێم دەبێ بزانین ئەم راستییە لەسەر ئەدەبی کورد دەکاتەوە نەك لە دژی دەوەستێت چونکە عوزرێکی گەورەی بەدەستەوە دەدا لە روی ئەوەوە کە دوا کەوتنی باری مادی و کۆمەلایەتی کورد رێی بڕیوەتەوە لە ئەدەبەکەی کە پێشکەوتوتر بێت ، رەنگە لە هەمان کاتدا گلەیێکیش بێنێتە سەر ئەدەبی ئەو میللەتە پێشکەوتوانە بەوەدا کە باری مادی دەوڵەمەند و پێشکەوتویان دەبوا ئەدەبێکی پێشکەوتوتر بەرهەم بێنێ لەوەی کە هەبوە . ئەگەر

چاومان رەشکەوپێشکە نەکات و مێشکمان لەق نەبۆبێت رێمان هەیە بڵێین ئەرێ ئەی بوێژی فارس و تورك و رۆس و عەرەبی پێش صەد ساڵ لێوە کە لە دەوروبەرێکی یەکجار دەوڵەمەندتر بوون و ژیان لەچاو هی کورد بۆچی هەڵبەستتان لە هی نالی و شێخ ڕەزا و مەولانا خالید پێشکەوتوتر نەبۆ ؟ کوا ئەو واتا و وێنە سیحراویەتان کە لە ژیانە دەوڵەمەندەکەتانەوە تیشکی دابێتەوە بۆ ناو هەڵبەستتان و هاوتای ئەو لە واقیمە هەژارەکەی نالی تیشکی نەدابێتەوە ؟ بۆ دەبێ حاجی قادر لێتان دانەبڕێ ودیا کەیفی جوانڕۆیی شان بەشانتان بێت ؟

لێرەدا سەرگوزەشتێکی کورتیلە دەکەمە پاڵپشتی قسەکانم :
چەند ساڵێك لەمەوبەر قوتابیەکانی کورد لە ( قاهرە ) پرسیارێکیان کرد لە شاعیرێکی ئێستاکەمان دەربارەی ( نالی ) و هێزی لە شیعردا .
لە وەرامدا پێیانی گوت بەسە بۆ دیارخستنی پایەی ( نالی ) کە بڵێم لە بەیتێکی دڵدارانەدا وەسفێکی خورما و دارەکەی کردوە بە خەیاڵی هیچ شاعیرێکی عەرەبدا نەهاتوە ، دەشزانین دار خورما ماڵی بێفێڵی عەرەبە و نالی لێی مێوانە :

× ئەتۆ قوربان نخیلی یا رطابی
وەها شیرین و سینە نەرم و دڵ رەق

بە دوا ئەو بەیتەدا بەیتێکی تری نالی دێنمە ناو قسەکانمەوە کە وەسفی بیابانی حیجازی پێ کردوە ئەویش تۆزی نەشکاوە لە لایەن شیعری هیچ شاعیرێکی عەرەب کە وەسفی بیابانی کردبێ . ئەمە

دەڵێم لە ئاست تێکڕای ئەو هەڵبەستانەی خۆم خوێندومنەوە ، کە شتێ تری زێدە نایاب هەبێ لە وەسفی بیاباندا و من چاوم پێیی نەکەوتبێ بەر ئەم قسەیەم ناکەوێ :

سماقی احمره ( یا قوت )ی روح و ئاوری نەفسە
حصاتی ابیضە یا شهبی نجم و رجمی شیطانە

بزانە لە مەقامی جەزبەگرتنی بەرەو کەعبە رۆیشتن نالی بەردە سماقی سوور و وردە چەوی سپیلکەی رێی حیجازی بۆ کوێی بەرز کردۆتەوە . تۆ خوا بە وردی سەیرێکی ئەم ریزکردنەی ( قوتی روح ) و ( ئاوری نەفس )ی نیوە بەیتی یەکەمی بکە کە لە وەسفی بەردەسماقدا هاتوە چۆن بە ئاسایی و بێ نەفەس سوارێ لە خۆوە بەرامبەر ( شهبی نجم ) و ( رجمی شیطان ) وەستاون ؟ قوتی روح لەگەڵ شهبی نجم جوت هاتوە ئاوری نەفسیش لەگەڵ رەجمی شەیتان !!! کاکە لێی وردبەوە جیهانێکی سیحری حەڵاڵ وا لە بەر چاوتە نە سەری دیارە نەبن .

من کە بە گەرمی لەسەر ئەدەبی کۆنمان دەکەمەوە یەك وشەی توانجم لە ئەدەبی ئەو کەسانە نەگرتوە بێ ئینسافی دەکەن لەگەڵ ئەو ئەدەبەدا . نەك هەر ئەمە و بەس ، هەرگیزیش ناڵێم ئەدیبی کورد دەبێ لەسەر شێواز و رێبازی شاعیری لێرە بەپێشەوەمان بڕوا و رێگەی تازە داهاتوو لە خۆی حەرام کات . ئەوەی راستی بێ پارچە هەڵبەستی نەوباوی ئەوتۆم دیوە سەد سڵەواتم بۆی لێداوە هەرچەند واتاکانی لە پشت پەردەیێکی ئەستووری رەمز و هێما و داپۆشراویدا

خۆیان بزر کردوە تا ئەو رادەیەی بەزەحمەت تێیان گەیشتوم یا هەر تێیان نەگەیشتوم . بە لای باوەڕی منەوە شاعیری نوێی ئەوتۆمان هەیە خەریکە هەنگاو هەڵێنێ بۆ بەرەوپێشەوەی (گۆران) و قۆناغەکەی چ لە ڕوی رواڵەت چ لە ڕوی ناوەرۆکەوە بێ. مەبەسیشم لە ناوەرۆك مەفهومی سیاسی و فەلسەفی نیە ، مەبەسم ڕژانی نەفسی شاعیرە بۆ ناو هەڵبەست جا ئەو نەفسە چی تێدا دەبێ بابێ . هۆیەکی زێدە ئافەرین کردنیشم لەو شاعیرە (وەیا ئەو شاعیرانە) ئەمەیە کە خۆی ناکاتە عەبدی شێواز و ناوەرۆکی یەکێکی لە خۆی بەپێشەوەی وەك (گۆران) بەڵام لە هەمان کاتدا هەزار حەیف و مخابنی بۆ دەڵێمەوە کە دەبینم هێندە بێڕەحمانە و ناشارەزایانە دەکەوێتە دژی رابردوێکی بێتاوانمانەوە . چەند سەیرە و چەند نامەفهومە لە ڕۆشنبیرێکی کورد کە منداڵێکی هەژاری بێ باوکی دیت بزەیی بۆی بجوڵێ بەڵام رقی لە رابردوی کورد هەڵستێ کە ئەویش وەك ئەو منداڵە بێ باوکە وا بوە بە درێژایی پتر لە دو هەزار ساڵ نەفەسی حەسانەوەی هەڵنەمژیوە و تێر بە زگی خۆی نەخواردوە و قەمچی ستەمکاری بێگانە لەسەر پشت و شانی هەڵنەستاوە . من لە وەسفی کوردا ئەمەی ژێرەوەم گوتوە لە ساڵی ١٩٦٠ ڕوی قسانیشم لە ڕۆشنبیرانی عەرەب بوە « فهو یخرج الیوم من جدث التأریخ أشعث أغبر ینزف جسمه من جرح عشرین قرنا أو یزید ، و تغوص فی عظامه سلاسل الأحقاب : لو اطلعت علیه لولیت منه فراراً و

لمثت منه رحبا » . ئەم پرزۆڵە لەش خوێناوییەی ناو گۆڕستانی مێژوَ ئەوە نیە رۆشنبیرێکی خۆی سەرلەنوێ ئەنجن ئەنجنی کا ..

پوختەی مەبەس و مرازی من لەم درێژەپێدانە و میسال هێنانەوە و رەخنە گرتن و رەخنە رەواندنەوەیە ئەوەیە چاوی رۆشنبیری کوردی ئەمڕۆی پێ بکەمەوە کە سەرگەرمی تەمەنی گەنجایەتی و مەستی کەف‌وکوڵی حەزارەتی تازەی ئەوروپایە و لە بەر تیژ ڕۆیی خۆی شوێن هەنگاوان نابینێ ، بە هۆی چاویلکەی خوازرایەوەش چەشمەندازی لێ لێڵ بوە . بێ‌گومان کە ئەمە دەڵێم لە خۆم و لە تاو و تەفسیری قسەکانم بێ‌ئاگا نیم : زۆر باش دەزانم رۆشنبیرێك ئەوەندە ئاوەژوَ بڕوا بێ دوێنێ بە ئیمڕۆ بکرێ وەك ئەوەی ئاسمان بە ئەرز بزانێ بە قسەی من نایێتەوە سەر باری ئاسایی تا ئاسمانەکە هەڵداتەوە بەرزایی و دوێنێش بخاتەوە پێش ئەمڕۆ . رۆشنبیرێك تا دەگاتە ئەو رادەیە لەسەهۆ چۆندا کە داوای مستحیل لە رابردوَی بەسەرچوَ بکا و قەمچی لە رۆژگاری تێپەڕیو بدا ، دەبێ لە سەهوەکەیدا ئەوەندە قوڵ رۆچوبێ کە شریت و دەولکەی بیروباوەڕ و نوسینی یەکێکی وەکوَ من نەیگاتێ . تاریکستانی ئەنگوستەچاوی یەخەگرتنی رابردوَی بێ‌گوناە و کوشتنی تارمایی بلیمەتی گۆڕستانی مێژوَ بە چرای کزی ئەم قسانەی من روَناك نابێتەوە . لەگەڵ ئەمەشدا خامۆش بونی من و هی وەك من چ خزمەتێکی راست کردنەوەی سەهوی ئەو رۆشنبیرانە ناکا ،

پتریشیان بە سەهو نابا . ئەمە لە لایێکەوە ، لە لایێکی تریشەوە ئەدەب و ئەدیبێکی کوردی کۆن کە لە نەزەر خۆمدا جێی شانازی پێوە کردن بێ دەبێ لە حاڵی هێرش بردنەسەریان لە لایەن رێی لێ شێواوێکی کوردەوە ، بە چەکی خامە بەرگرییان لێ بکەم . لە منیش بە پێشەوە نوسەران هەبون بەشێکی نوسینەکەیان تەرخان کردوە بۆ لەسەرکردنەوەی ئەو ئەدەب و ئەدیبەی لە بارەیان نوسیوە ، رەنگە هەندێك لە خوێنەرەوەی ئەم باسەش ناچاری لەسەرکردنەوە بون [ ئەوەی راستیش بێ میللەتی کورد پێویستی پتر هەیە بە لەسەرخۆکردنەوە تامیللەتێکی تری خاوەن سامانی مادی و مەعنەوی چونکە بە داخەوە کورد ئەوەندەی نیە هەندێکی لە ژێر پێی رەخنە و نەفرینی نارەوا بپلیشێتەوە و دەربەست نەبێ ، بە تایبەتی کە رەخنەکان دژی راستی و ئینسافیش بن و لە بەسەهوچون و بێباکی و وردنەبونەوەی رەخنەگرانەوە سەریان هەڵدابێ لەعاست مێژو و بەسەرهاتەکانی کە چ سوچێکی رەخنەلێ گیراوەکان نیە ئەو بەسەرهاتانە بە پێی زەوق و کەیفی مرۆڤی صەدەی بیستەم رویان نەداوە و حازرێکی باشتریان بۆمان بەرهەم نەهێناوە ، هەر وەك ناقۆلایی ژیانی چینی زەحمەتکێشی ئەمرۆی کورد بە ئارەزۆ و بە تاوانی ئەوان نەرسکاوە تا گلەیی بێسامانی و بێراحەتی و بێئازادی خۆیان لە خۆیان بکەین]. ئەدیبێکی وەك نالی کە بەلای بیروباوەری منەوە یەکێکە لە شاعیرە هەرە پێشکەوتوەکانی رۆژهەلاتی ئیسلام ، نەك تەنها هی

کورد ، گلەیی ئەوەی لێ ناکرێ بۆ کەیفی صەد ساڵ دوای خۆی شیعری هەڵنەبەستوە ، لەوەشدا سەرشکێن ناکرێ کە شێوازی شیعری کۆنی بەکار هێناوە ، لەم لایەنەوە دەبێ بڵێین نالی ئەگەر ئەوە نەبا کە هەبێ گلەیی لێ دەکرا و گومان دەچوە سەر شاعیریەتی چونکە دەبێ مرۆڤ کوڕی سەردەمی خۆی بێت ، کە ئەو کوڕە نەبێ دیارە ناتەواویێك لە نەفسی وەیا لە هونەریدا بۆتە لەمپەر لە پێشی و کردوەتی بە مرۆڤێکی تار بێ لە تێکڕای خەلق . نالی بێ وەیا یەکێکی تر بێ هەر ئەوەندەی لێ داوا دەکرێ بە پێی مەفهومی سەردەمی خۆی مافی ریزلێگرتنی هەبێ تا ئێمەش ریزی لێ بگرین چ رەوای هەق نیە ئێمە بێین دوای صەد ساڵ لەو سەردەمە هەمێ خەلق بە درۆ بخەینەوە لەو ریزەی کە لە یەکێکی وەك ( نالی )یان ناوە . وا دەزانم ئەم قسەیەی لێرەدا دەیکەم چ دەمەتەقە هەڵناگرێ لە منیش بەپێشەوە کەسانی تر گوتویانە ، هۆی دوبارە کردنەوەی لێرەدا زێدە پێویستی میللەتاکەمانە بۆ خۆبەسەهێنەبردن و خۆزەرەرمەندنەکردن . لە فەرزی میللەتی ئینگلیز خۆ گێل کا لە عاست ( شەکسپیر ) ئەوەندە شاعیر و ئەدیبی گەورەی تری دەمێنێتەوە دڵی خۆیان پێ خۆش کات ، سەروەت و سامانەکە و فابریقەو داهاتە زۆرەکەشی چی لێ کەم نابێتەوە بە نەهێشتنی ناوی ( شەکسپیر ) لە فەرهەنگی ئەدەب و هونەریدا . خۆ ئەگەر ئینگلیز لەم پلەیەی بێ ئینسافیەش تێ بەڕێنێ و هەمێ رابردوی خۆی بسڕێتەوە ـ کە هەرگیز نای سڕێتەوە ، حورمەتی رۆپەڕە بێحورمەتەکانیشی دەگرێ ـ حازرێکی

هێندە دەوڵەمەندی هەیە بۆی تێ‌بێنێتەوە لە سزانەوەی رابردوی .
بەڵام کورد چی ئەوتۆی نیە لە ئێستا کەی‌دا دڵی خۆی پێ خۆش
کات لە بەرامبەر کاری مندالانەی ریسوا کردنی رابردوی خۆی . کورد
لە بارێکدایە بۆی بپارێزێتەوە نەك لێی کەم‌کەیتەوە بەتایبەتی کە خۆت
کورد بیت ، خۆ هەر بەجارێ بێ عوزر دەبیت ئەگەر لێ کەم‌کردنەوەکەت
لە مەیدانی بایەخداری زێدە بە نەرخی شیعر و ئەدەبی کۆنی بێت
کە هیچی وەك ئەو بەنرخی نیە .

لەم گەشتەی ناو باغ و راغی هەڵبەستەکانی نالی‌دا چەند
نموونەیێکی ئەوتۆمان دیت کە لە ناو نموونەی هەرەپێشکەوتوی
ئەدەبی رۆژهەلاتدا پرشنگ بدەنەوە و نموونەکانی‌تر کزکەنەرە
لە نەزەر خۆیان‌دا . ئەم بەرزیەی ئەدەبی نالی جارێکی‌تریش
بەرزتر دەبێتەوە کە بە بیر خۆت بێنیەوە نالی رەوشتێکی پاك و نەفسێکی
ریزلەخۆگرتوشی هەبوە و لەو ئەدیبانە نەبوە عەیب و عاری رەفتاری
نالەباری لە ناو مەخمەلی هەڵبەستدا بشارێتەوە . چ نەهێنیان ئاشکرا
ناکەم بەوەدا کە بڵێم زۆر لە شاعیری ناسراوی خاوەن شۆرەت لە
کۆن و نوێ‌دا ئەگەر شیعر و هونەر شەفاعەتیان بۆ نەکەن لەوانە
نەبون بە برادەری خۆتیان قبوڵ کەیت نەوەکا ناوت بەد بێ پێیانەوە .
نالی سەرەڕای ئەوە کە چ عەیبێکی لێ نەدیتراوە تا بشڵێی راست و
دڵسۆز بوە لەگەڵ بیروباوەڕی‌دا ، چی لە دڵدا بوە ئەوەی گوتوە و
بە درێژایی ژیانی سور بوە لەسەر قەناعەتەکانی . بەڕاستی نالی یەکێکە

لەو شاعیرانەی قەناعەت گۆڕییان نەکردوە . هەرچەند ئەم نوسینە جێی ساغ کردنەوەی قەناعەت و بیروباوەڕی نالی نیە ، بەڵام جێی ئەوەندەی تێدا دەبێتەوە بە پێی داخوازی موناسەبە بڵێم دیوانەکەی سەروبن کەیت و شیعرەکانی بەو پەڕی وردییەوە بخەیتە بەر چاوی زیهن و مەنتیقەوە چ فەرقێك ناکەی بە قەناعەتە بنجییەکانی لە قەسیدەیێکەوە بۆ قەسیدەیێك وەیا لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی تر . وەك من لە نالی دەگەم ئەگەر پێمان بکرێ لیستەیێکی زەمەنی بۆ شیعرەکانی رێك خەین لێمان مەعلوم دەبێ ئەو لە تەمەنێکی مەیلەو زووەوە بەرەو پێك‌هێنانی قەناعەت و بیروباوەڕ چوە ، هەر ئەم زوو کردنەش بۆتە هۆی خێرا ڕۆیشتنی بۆ حەج ، تەنانەت نامەکەی بۆ (سالم) و پرس پێ کردنی لە بەرژەوەندی گەڕانەوەی بۆ سلێمانی ئەو ترسە پێی کردوە کە دوای گەڕانەوە دوچاری وەزع و ژیانێك بێ کە خۆی لێی رازی نیە ، دەمەوێ بڵێم پەرۆشی بۆ قەناعەتەکانی وای لێ کرد راستەوخۆ نەگەڕێتەوە ، لە حاڵێکدا ئەو دەزانێ بەسەرچوونی دەسەڵاتی بابان و هاتنی حوکمێکی بێ‌باکانەی عوسمانی لەوانەیە رێ لە ئازادی رەفتار و قەناعەتی بگرن و مەیدانی لێ تەسك کەنەوە بەتایبەتی چونکە ئەو لە سەردەمی حاکمەکانی باباندا هەرگیز ناچار نەبوە لە ئاوی باوەڕی لێڵ بخواتەوە ، دیارە لە حاڵی وەهادا تێك‌چوونی وەزعی سلێمانی بە نیسبەت نالییەوە ناخۆشتر بوە تا کەسێکی تر کە وا نە زۆر دەربەستی باوەڕ بێ و نە لە سەردەمی باباندا مەرحەبای دیبێ . نالی کە لە شام مایەوە و

دواییش ، پاش گەیشتنی وەرامی سالم پێی ، چوو بۆ ئەستەمبۆڵ بۆ ئەوە هیچ هۆیەکی گوزەرانی مسۆگەری هەبێ وەیا بە تەمای پەیدا کردنی هیچ پایە و روتبە و نیشانێك بێ ، خۆی دزیەوە لە گەڕانەوە بۆ سلێمانی لە ترسی بەرەنگار بوونی وەزعی بێ حورمەت بە دەست حوکمی کەم ئینسافی عوسمانیەکانەوە . ئەگەر ئەم ترسە بەرهەڵستی لێ نەکردبا دەیتوانی لە سلێمانی ئەو کەرتە نانە پەیدا کا کە لە شام و ئەستەمبۆڵ پێی قانع بوو . هەر جارە کە ئەم بەیتەی لای کۆتایی نامەکەی بۆ سالم دەخوێنمەوە ، لەگەڵ تەزوی سۆز و هەستی پەرۆشم بۆ نالی ، دیمەنی مرۆڤێکی جوانمەردی ریزلەخۆگرتوشم دێتەوە بەر چاو کە مەرگی غەریبانەی ریز لێگیراو تەرجیح دەداتە سەر ژیانی ناو کەس و کار بە بێحورمەتی و بێدەسەڵاتی :

ئایا مەقامی روخصەتە لەم بەینە بێمەوە

یا مەصلەحەت توقّفە تا یەومی نەفخی صور

دیارە نالی لەم مەصلەحەتەدا مانگانەی دوکان و قەیسەری و داهاتی زەوی‌وزارە نەبوەکانی مەبەس نیە ، پرسیاری ئەو لە بارەی بوونی وەزعێکەوەیە کە بتوانێ تێیدا گوزەرانی نەمرونەژی بکا لەگەڵ پاراستنی دڵۆپی‌ئابڕوودا . پێش من سالمیش لە مەبەسی نالی گەیشتوە بۆیەیە لە وەرامدا بەزۆری باسی بێدادی و بێحورمەتی تورکەکان دەکا نەك نەبوونی نان و گوزەران :

شارێکە پڕ لە ظلم و مەکانێکە پڕ لە شین
جایێکە پڕ لە شۆر و وڵاتێکە پڕ لە شەر
سالم صفەت لە بێکەسییا بانەبێ هەلاك
من کردم ئەو نەکا لە غەما خوێنی خۆی هەدەر

لێرەدا رەنگە پرسیارێك بکرێ و بگوترێ بەنیسبەت نالییەوە ئەستەمبۆڵ و شام و سلێمانی چ فەرقێکیان دەکرد؟ خۆ هەر عوسمانلی حاکمی هەموان بوون؟ پرسیارەکە بێ جێ نییە بەڵام بێ وەرامیش نیە . لە تەجروبەی خۆمان دەزانین ژیان لە جێگەیێکی تازە داگیرکراوی وەك سلێمانیدا بۆ کوردێکی شەرمبەخۆی موحتەرەمی وەك نالی سەختتر و جێ‌گومانترە تا ژیانی ئەستەمبۆڵ وەیا شام کە لەوێدا داگیرکەری عوسمانی پەلپی بێ حورمەت کردن بە غەریبێك ناگرێ کە لە هیچ روێکەوە نایێتە ناو حیساب و بەرژەوەند و چاکە و خراپەیەوە و چ لەمپەران لە بەر پێی هەڵنانێ . لەمەش بەولاتر ، شاری گەورە و قەڵەبالغ چاکتر دەبێتە حەشارگە بۆ کەسێکی بیەوێ بەرچاو نەبێ ، نالیش لەوە زیاتری نەویستوە ژیانێکی رەشۆکی بێ ئارایشت لە ناو ئاپۆرەی شاری گەورەدا چەپارەی بدا لە نیگای نازەزای میری و ئەو هەڵمەتەکاسانەی خۆ لە میری نزیك دەکەنەوە بە تێوەگلاندنی بابای وەك نالی ریزلەخۆگرتو .

ئەم بە قەناعەت نازینە و لە خۆ رازی بوونەی نالی لە گەلێك رەفتاری‌تری نالی سەر هەڵدەدەن . جارێ چەندێك سەیری

هەڵبەستەکانی بکەیت پاژانەوەی لەبەر کەس تێدا نابینیتەوە ، خۆ داوا کردنی یارمەتی و لۆتەخۆرێ هەر هیچ . تۆسەرێکی کورد لە پێشەکی دیوانە چاپکراوەکەی نالی خلیسکی بە خامەی خۆی بردوە و نالی شکاندۆتەوە بەو یەك دوو ناوبردنەی حاکمەکانی بابان کە لە چەند موناسەبەیەکدا هاتونەتە ناو شیعریەوە . بەرامبەر ئەم شکاندنەوەیە چەند وەرام دانەوە و راستکردنەوە و روونکردنەوە هەن :

یەکەم : گەلی کورد بە ئاواتەوەیە لە مێژووی خۆیدا هەڵکەوتی وەها پڕ شانازی بدۆزێتەوە کە ئەدیبێکی کورد مەدحی حوکمڕانێکی کوردی کردبێ . وەی کاشکی سەرلەبەری ئەدەبی کۆنمان مەدحی بەروبارەگا و دەست و قام و جوامێری حاکمە سەربەخۆکانی کورد بوایە .. کاشکی کورد خاوەنی ئەو حوکمڕانە بوایە بە درێژایی مێژوو مەدح کرابایە . نالی کە دڵی و مەدحی (تاقە مومتازەکەی شاه) دەکات تابلۆیێکی پڕ شەرافەتی مێژووە هەزارەکەی کوردمان بۆ دەکا بە نەمرێ دەستێکی سـوال و سەدەقەشی تێدا پان نەکردۆتەوە ببێتە لەکەکە لەو تابلۆیەدا . لاواندنەوە و پیرۆزباییەکەشی بۆ مەرگی سلیمان پاشا و حوکمڕانی ئەحمەد پاشا لە قەسیدەکەی (تا فەلەك دەورەی نەدا) ئەویش وەك هی (تاقی مومتازی شاه) هەستی بەخۆنازیمان زیندوو دەکاتەوە و گیانی کوردایەتیمان تیژتر دەکات ، بەشێکی زۆری هەتیوایەتی کۆنینەشمان لە بیر دەباتەوە بەوەدا کە پێمان دەڵێ ئەمیرێکمان هەبوە لە مردنیدا بۆی بگریەین

ویەکێکی تریشیان هەبوە لە هاتنی بۆ سەر تەخت پیرۆزبایی لێ بکەین .
لەم قەسیدەیەشدا نالی هێندە بڵند دەڕوانێ و خۆی بەرز دەکاتەوە لە
لایەنی چاوچنۆکیەوە دەتوانم بڵێم پێی دەگاتە شانی (ابو تمام و
بحتری و متنبی) . بەڕاستی ئەم گیانی بەرزبونەوەی نالی زۆروی
گومان لێ‌کردنی یارمەتی خواستن کە لەم دوو قەسیدەیەدا دەچنە
ناو بیبیلەی هەموو چاوێکی بیناوە ، دیمەنێکی یەکجار ئاشکرای
بەخۆنازینی نالی دێنێتە ناو هەڵبەستەکانەوە هەندی مەدح و
لاواندنەوەکە جێی خۆی کردۆتەوە . بە لێوردبونەوە دیار دەکەوێ
نالی لەم دوو قەسیدەیەدا بە پێی حوکمی سروشت و رەوشتی فیتری
لە تارمایی دەست پان کردنەوە دوور کەوتوتەوە نەك لەبەر
خۆپاراستنی دوای لێك‌دانەوە چونکە لە هەردوو قەسیدەدا تاکە یەك
وشە نادۆزیتەوە باسی سەخاوەت و بەخشینی مەدح کراوەکان بکات
چ جایی ئەوەی داوای یارمەتی بکات . بەمەدا دیارە نالی دڵ و دەروون و
فکر و زیهنی بە لای چاو چڕکردنەوەدا نەڕۆیشتوە ، هەر بیریشی لێ
نەکردۆتەوە ، چونکە ئەگەر لە گۆشەیێکی هەست و نەستی‌دا وێنەی
تارمایی خواهشت و نیاز هەبا ، خۆشی بێ و ترشی بێ ، سێبەرێکی
ئەو تارماییە دەکەوتە ناو هەڵبەستەکانەوە وەیاخود هەر نەبێ لە
وشەیێکیاندا ( ئحم )ێکی وەك هی کابرای گۆشەی مزگەوت دەبیسترا .

لێرەدا پێویستی روون کردنەوە و وەرام‌دانەوە باسی دوو قەسیدەی
هێنا ناوەوە کە مەدحی پاشای بابان و تاقی تایبەتی ئەوی تێدایە .

نالی لە تاکە بەیتێکی تریشدا مەدحی سلیمان پاشای کردوە ، هەڵبەت ئەم مەدحە دەبێ پێش مەرسیەکەی (تافەلەك) بێ . ئەم تاکە بەیتە چاوی هەمتو ئەو ئەدیبانەی لێ خلیسکاوە کە من لە بارەی شیعری نالییەوە ئاخاوتنم لەگەڵدا کردبێ وەیا نوسینیانم خوێندبێتەوە دەربارەی نالی . منیش بەینێکی دوور و درێژ لێی بێ ئاگا بووم تاکو لەخۆوە بە تێپەڕینی کات و کەڵەکە کردنی داهاتی ئاشنابوونم بە نالی لە ناو دەروونمدا واتای بەیتەکەم بۆ روون بۆوە بایی ئەوەی مەدحی سلیمان پاشای تێدا بخوێنمەوە :

هود هودی دڵ حەبسی بەلقیسی سەبای دیوە یەقین
خۆی کە دامەنگیری شاهی ئاصەفی ثانی دەکا

بێ گومان شاهی ئاصەفی ثانی[1] لەم بەیتەدا سلیمان پاشای بابانە چونکە دیارە شاهی ئاصەفی یەکەم سلیمان پێغەمبەرە بە خۆی و سەرگوزەشتە قورئانیە زۆر مەشوورەکەیەوە لەگەڵ هودهود و بەلقیس و سەبادا کە لەم بەیتەدا نالی کردوەتی بە مەبەسی هەڵبەست ، کە سلیمانێکی دوەم هەبێ وەك سلیمانی یەکەم پاشا بێ و نالی دامەنگیری بێ ، کەسێکی تر نیە لە سلیمان پاشای بابان بەولاوە . هەرچەند کەم و زۆری پەیوەندیی نالی بە دەرباری پاشاکانی بابانەوە بە چاکی نەزانراوە و نەبیستراوە بەڵام لەم بەیتە و مەدحەکانی تریشدا دەردەکەوێ نالی بە هۆی بوێژیی بێ مانەندیەوە لە پاشاکان نێزیك بوە و ریزی لێ گیراوە .

(١) باسی ئەم بەیتە بە درێژتری لە بەشی دوەمی ( حاجی قادری کۆیی ) هاتوە .

دەم و دوَی ئەو هەڵبەستانەی تامی ئاشنایی و دۆستایەتی لێ دەکرێ لەگەڵ مەدح کراوەکاندا واش رادەگەیەنێ نالی لە سەردەمی حوکمڕانی سلیمان پاشاوە بوە بە دۆستی نێزیکی بابان چونکە مەدح و پێداهەڵگوتنی بۆ سلیمان پاشا و ئەحمەد پاشایە ، لەوان بە پێشەوە چ مەدحێکمان لێی نەبیستوە دۆستایەتی و ئاشنایەتی رابگەیەنێ بە پاشاکانەوە .

دوەم : نالی ئەگەر مەبەسی لەم مەدحانەدا نان پەیدا کردن بوایە دەبوَ پاشتریش مەدحی خەلیفە و والی و وەزیر و پیاو ماقوڵەکانی عوسمانی کردبایە . کەچی نە ناوی هێناون نە لێشیان نێزیك بۆتەوە . سەیر لەوەدایە هەرچەند تورکیەکی باشیشی زانیوە بە دەگمەن نەبێ شیعری بە تورکی نەگوتوە ، رواڵەت وا رادەگەیەنێ نالی نەی‌ویستوە ، وەیا خۆی نەخستۆتە بارێك ، هەڵبەست بە زمانی دەسەڵاتداری بێگانە دانێت نەوەك بە خۆتێ‌هەڵسوَن لە سەری حیساب بکرێ و گومانی دەست پان کردنەوەی لێ بکرێ .

نەبونی مەدح لە هەڵبەستی نالی‌دا دیاردەیێکە سەربەخۆ ؛ جگە لەو دوَ سێ مەدح و ناو هێنانی بە موناسەبە کە بۆ میرەکانی بابانی کردوە تاکە یەك مەدحی‌تر لە دیوانەکەی هەیە ئەویش بۆ شێخ نوری ناوێکی روَدباری ( روَباری )یە :

لە چاوی روَدبارم نوری دیتن وەختە تاری بێ
ئەمیش با ماجەرای هیجرانی ( نوری روَدباری ) بێ

لە لاپەڕە (٧٨)ی دیوانەکەی - چاپی هەولێر - سەیرێکی ئەم هەڵبەستە بکە و نەختێک سرنج بگرە وشەکانی دەرحاڵ بۆت مەعلوم دەبێ نالی ئەم پارچەیەی بە موناسەبەی چونە حەجی (نوری رۆدباری) داناوە :

چ میعمارانە بۆ تەعمیری کەعبەی دڵ دەچێتە حەج
خودا یار و مەدەدکار و نیگەهداری عمـاری بێ

دیارە نالی لێرەدا مەدحی برادەرێکی خۆی دەکات کە دەچێ بۆ حەج و پیاوێکی خوایی و موسڵمانە هی دونیا و دەسەڵات و زەبر و زۆر نیە ، لە سەرانسەری بەیتەکانیش ، دیسان ، چ دەست پان کردنەوەیێک نادیترێ . من لە بارەی ئەم (شێخ نوری رۆباری)یەوە هەر ئەوەندە دەزانم بەینێك لە کۆیێ ژیاوە و پیاوێکی بەرچاو و ریزلێگیراویش بوە . بە پێی گێڕانەوەی دەماودەمی باوکم لە باپیرمەوە شێخ نوری نانی بە شێخایەتی پەیدا نەکردوە ، خۆی خاوەن بەخشین بوە و بە ماڵی خۆی خزمەتی خەلقی کردوە .

نالی لە زەمینەی مەدحدا ئەوەندە کنارەگیر بوە تەنانەت لە پیاوانی ئاینیش تەنها مەدحی پیغەمبەر (ص)ی کردوە ، هەر لە نێوان مەدحی ئەویشدا ناوی چوار خەلیفەکەی هێناوە . بە لای باوەڕی منەوە ئەو بڕە شیعرەی (عاشورا) کە لە لاپەڕە (٧٥) دیوانەکەی (چاپی هەولێر)دا چاپ کراوە نە هی نالیە و نە بە هیچ

کلۆجێك دەچێتەوە سەر شێوازی نالی : بڕە شیعرێکی بێ هێزی نابەڵەدانەی بێ تام و شـــام کە لە شاعیری ریزی دوەمی شـــیعری کوردیش ناوەشێتەوە چ جایی ئەوەی لایەق بە نـالی بـێ . نەختێك وردبونەوە لە بەیتەکان دەری دەخا خاوەنی قەسیدەکە کێیە . لە بەیتی چواردەمیندا شاعیر روی قسە لە خۆی دەکا و ناوێك دێنێ یا ناوی راستەقینەی خۆیەتی یا نازناویەتی . من لێرەدا بەیتی چواردەم شکڵ نوس دەکەم لە بەر دیوانەکەی نالی (چاپی هەولێر ١٩٦٢) :

عارفا ســەد عەقل کل حیرانە وا لەو عالەمــە
عالمی اعلم کە بۆ خــۆی هەم علیم و أعلمە

وشەی یەکەمی بەیتەکە ( عارفا ) بانگ هێشتنی ( عارف )ە لـە لایەنـ خاوەنی ناوەکەوە . لەمەدا چ گومانێك نیە و دەبێ بتۆژرێتەوە کام شـــاعیری کورد ناوی وەیا نازناوی ( عارف ) بوە . بەم پێیە دەبـێ کلۆتایی قەسیدەکەش ناوی ( نالی ) لێ دەرهاوێژرێ و عارفی بخرێتە جێیـــەوە :

لۆمەیی (عارف) مەکـەن یارانـ ئەگـەر بمرم لە غەم
خۆش ئەگـەر سەد پارە کـەم هێشتا لە غەم ئەمرۆ کـەمە

پوختەی گوتە لێرەدا ئەمەیە کە شیعرەکانـ ســەرەڕای بێ هێزی و بێ جوانی و بێ هونەرییان ، دژی تەبعی نالیشن لە روی ئەوەوە نالی لە مەیدانی دینداریدا ستایشی خوا و پێغەمبەری کردوە و

بەس سەیرێکی ئەم بەیتە قوندیلەیە بکە و پێم بڵێ بە کام کوێرە ڕێیدا بۆ سەر خەزینەی گەوهەرەکانی نالی دەبردرێتەوە ؟

احمد و اولاد و آلش در عرب شبهی گوڵن
حاصلی گوڵ خارە ئەی دانـــا دەلیلی محکمـــە

لە پێش چاوی زیهنی مندا نالی نەفسی لە بەرزیدا هاوتـــای شیعرەکانیەتی لە مەتانەتدا . بە خۆڕایی و بێ بنـج نیە نالی هێنـدە بە خۆی و شیعرەکانی خۆیدا هەڵدەڵێ : دیارە هەسـتی بە بـەرزی دڵ و دەروونی ئەوەندە بە هێز بوە چ کـەلامەی نەکردوە لە دەربڕینی ئەو هەستە چونکە بە لای خویەوە شتێکی وەك بەدیهیەی گوتۆتەوە لە هەمتو ئەو کـەسانە مەعلومە کـە دەی‌ناسن . مرۆڤی گومان لەخـــۆ کردو ناوێرێ لە خۆهەڵدانەوە و نازبەخۆکردندا خەڵـق بێ‌منەت کات لە ترسی بەدەمداهاتنەوە و عەیب دیار خســـتنی . وا دیارە نالی هیچی ئەوتۆی بە خۆی شك نەبردوە لە خەلقی بترسـێنی وەیا چاو شۆڕی کەسی بکات . کەسێك چ ڕۆژان هەڵوەستێکی بێ حورمەتانەی لە خۆی دیبێ ناتوانێ بەم شێوەیە زۆروی عالەم کەوێتەوە :

ئەم سەرسەری بازانە کە وا هەمسەری بۆمن
موشکیل بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکو من

من بەش بەحاڵی خۆم چەندێکی بڵێی ئەوەندە گەش دەبمەوە بەوەدا کـە دەبینم و دەزانم نالی لە ڕەوشت و بەرزی نەفسدا هاوتای نالی بوێژ و ئەدیبە ، چونکە بە ڕاســـتی فەلاکەتە ئەدەبی بـەرز

بخزێتە ناو نەفسی پەیوەستەوە . پێی ناوڵێ من بڵێم لەخۆوە دیارە پیاوی نزم لە گوتنی وشەی بەرزدا درۆزنێکی ئانقەستە . شاعیرێك وەیا ئەدیبێك کە ئاو و ناتۆرەی بە دواوە بێ لە هەمو گوتەیێکیدا تارمایی بەدناویەکەی لە بەر چاوان قوت دەبێتەوە و قسە خۆشکەڵەکانی بە درۆ دەخاتەوە یاخود هەر نەبێ لە بایەخیان کەم دەکاتەوە .

وا خۆشە دەست و زمان بە یەکەوە پاك بن . صەد شوکر ئەم خۆشیە لە شاعیریەتی نالی‌دا بە زیادەوە پێك هاتوە .

لە بەشێکی ئەم گوتارەدا لایەنێکی تایبەتیەکانی ئەدەبی نالی کە پارسەنگ بون و لەنگەر بەستنە قسەی لێ کرا بایی ئەوەی لە قەوارەی گوتاردا بگونجێ ، ئەوەش گوترا کەوا بەڕادەی بەشداربونی زات و بابەت ( هونەر و زانست ) لەو پارسەنگ بون و لەنگەر بەستنەدا توانا و دەسەڵاتی شاعیر خۆ دەنوێنێ ./ ئێستا کاتی ئەوە هاتوە بڵێم چەندێکی شاعیر بتوانێ لە گەڵ هێنانەوەی واتای وشك و وشەی سەختدا زرینگە و مۆسیقا و نازکی و پاراوی لە هەڵبەستدا بپارێزێ شاعیرتر و هونەرمەندتر و دەسەڵاتدارتر دەبێ/ . ئەم لایەنەی پاراستنی ئاو و تەئسیر و زەوق و شەوقی ئاخاوتن لە هەمو حاڵێکی لەبار و نالەباردا لە ( قرآن )دا زۆر بەرچاوە . کەسێك نەختێك شارەزایی هەبێ لە جوانی گوتە ، سەیرێکی ئەو ئایەتانە بکا کە لە دابەش کردنی میرات دەدوێن تێ دەگا دەسەڵاتی ( قرآن )

گەیشتۆتە کولێ چونکە لە باسی میرات و پشکی میراتگران وشکتر و وەڕسکەرتر نیە کەچی رستەکانی (قرآن) بە شێوەیێکی ئەدەبی ئەوەندە تەڕ و پاراو لێیان دەبێتەوە چ فەرقێکی نەبێ لەگەڵ ئایەتەکانی دوای سەرکەوتنی (بدر) کە جێگەی بەکارهێنانی رستەئارایی و هونەرکاریێ و رەوانبێژییە .[لێرەشدا چ گومانێك نیە کە نالی پەیڕەویێ قورئانی کردوە لە بەکارهێنانی وشە و واتای رەق و سەرکەش لە قاڵبێکی شەنگ و شلکدا]. من ناڵێم ئەگەر قورئانی نەدیبا نەیدەتوانی هونەر بەکار بێنێ لەو تەرزە جێگایانەدا ، هەر ئەوەندە دەڵێم نالی شوێن پێی قورئانی هەلگرتۆتەوە لە گەشتی ناو نغوردی وشە و واتای سەختدا . وەك لێرە بە دواوە ، لەم بەشەی گوتارەکەم بێ وەیا لە بەشی سێیەمیدا ، نموونەی بەیتەکانی نالی دەری دەخەن هەندێ جار واتا و رستەی راستەوخۆ لە قورئانەوە هەڵقوڵیون . پێشتریش جارێکیان نموونەم هێنایەوە لە شیعری نالی کە واتای قورئانی هۆندۆتەوە بەڵام وشەیێکی ئایەتەکەی قورئانی گۆڕیوە بە وشەیێکیتر بۆ پاراستنی مۆسیقای هەڵبەست ، ئەم جارەیان وێنەیێکیتر لە ئەدەبی نالی دێنینە بەر چاو کە لەوێشدا هەر پەیڕەویێ قورئانی کردوە ئەگەرچی بۆ مەبەسێکیتر بێ ، کە بریتییە لە سەر نەرم کردنی وشە و واتای سەخت بۆ ناو قاڵبی هەڵبەست . وردە وردە بە دەم شەرح دانەوە دەگەینە نموونەی ئەم بابەتە لە هێز و دەسەڵاتی نالی .

کۆمەڵ کردنی وشەی نازك و تەڕوتۆڵ و زرینگەدار لە ناو هەر نووسینێك بێ ـ هەڵبەست یا پەخشان ـ لە خۆوە رەونەقێك دەدا بە نووسینەکە ، رێگەش هەموار دەکا لە پێش هەنگاوی نووسەر بۆ ئەوە بێ زەحمەتێکی زۆر زەنەی دەروَنی بخاتە ناو زەرفێکی جوانەوە . شاعیر هەیە بەشێکی زۆری دیوانەکەی وشەی بژاردە و تریسکەدارن کەلەبەری بێواتایی پێ پڕ کردۆتەوە . بێ گومان نالی لە بەکارهێنانی وشەی جواندا مەبەسی تێ‌بردنی بێواتایی نەبوە چونکە وەك دەزانین واتا لە شیعری نالی‌دا تەنگی بە وشە هەڵچنیوە . لە هێنانەوەی نموونەی شیعری نالی لێرەدا مەبەس دەرخستنی دەوری وشەی جوانە لە هەڵبەستدا بێ ماندوَ بوونی شاعیر :

دیدەت وەکو گوڵ سوورە پڕی شەبنمی ئەشکە
یا لالەیی پڕ ژالەیە دوَ نەرگسی شەهلات
بەو گریەیی تۆ رەنگە منیش هێندە بگرییێم
گەوهەر بڕژێنم بە بلندیی قەد و باڵات

نموونەی دوەم :

ئەوە لێوی ئەتۆیە پڕ لە خەندە
کەوا شەککەر دەباری گوڵ دەپشکووت

نموونەیێکی تر :

من گریە ئەتۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین
من لەعلی بەدەخشان و ئەتۆ لوئلوئی لالا

یەکێکی تر :

دیدە وو دڵ هەردویان جۆبار و جۆیای قەددی تۆن
سەروی دڵجۆی عەرعەرە دڵ جۆی نەمای دیدە جۆی

ئەمەشیان :

تیپی شکۆفە خیمەیی داوە لە هەر تەرەف
یا شاهی نەوبەهارە هەڵیداوە هوردوێ

لەم نمونانەدا وشە و قاڵبی شیعرەکان هێندە شلك و ناسکن هەر دەڵێی لە مەیدانی واتادا ئەو ولاغە ئازمودە خۆش جڵەوە پشت نەرمەیە کە نالی وەك سوکە سوارێکی ولاغ‌ناسی دەست مەعلانی پێ و رکێف مەحکەمی شارەزا بێ‌ترسی ساتمە و خلیسکان ، جلیت‌بازی و غارێنە و مەقەسەی پێ دەکا . بەڕاستی وشەکان ئەوەندە تەڕ و پاراون بەبەریانەوە هەیە بیان‌گوشی ئاویان لێ بێ .

لە شیعری وەها وشە نەرم‌ونۆڵدا تەنها ئەرکی رێك‌خستنی لەبار و ریز کردنی دەست‌رەنگینانە دەکەوێتە ئەستۆی شاعیر ، پێویست بەوە نیە شاعیر زرینگە و تەڕایی و شەنگی و شلکی لە شیعرەکە پەیدا بکا چونکە وشەکان پەیدایان کردوە .زێدە وەستایی و هونەر و زەحمەت لەوەدایە وشەی سەخت و سەرکەش نەرم بکرێ و سەر دانەوێنێ بۆ ناو میحرابی هەڵبەست .

هێنانی وشە و رستەی زەحمەت و رەق لە دەسەلاتی هەمو

شاعیرێکدا هەیە ، بەڵام چ سوود ئەو وشـە و رسـتانە وەك ئێسکە ماســی لە ئەوکی بەیتەکان گیر بن . ئـەم دەســەڵاتەی تـێ بردنی رەقایی وشــەی ســەخت لە نێو شیرازەی هەڵبەستدا بە زیادەوە لای نالی هـەیە ، بەڵام بۆ هەسـتکردن بەو دەســەڵاتە و زەوق لێوەرگرتـنی ، یاخـود چاکتر ئەوەیە بڵێم بۆ ســودمـەندبوون و سامانپترکردن و خۆچەسپاندن لە مەیدانی ئەدەبدا بە هۆی هەستکردن بەو دەسەڵاتەی نالی ، دەبێ خوێنەری کوردی تازە پێگەیشتوو دڵ و مێشکی خۆی رزگار بکا لە تەم و تاریکایی هەموو ئەو دەنگ و باس و حیکایەتە سەرلێشێوێن و بەهەڵەبەرانەی کە خوێندەوارییە ناتەواوە لاساییکەرەوەکەی ئەوروپا لە رێی ئەدیبە نەوژەسەکانمانەوە چەشمەندازی بیر و ئەدەبی لێڵ کردوە یاخود خەریکە لێڵی بکات . ئەدیبی تازەی کورد بۆ ئەوە ستەم لە خۆی و ئەدەبەکەی هەڵەنکێوێ دەبێ یەکجارەکی لە دەستە ستەمکارەکەی دوشمنایەتی رابردوو رزگار بێ ؛ ئەگەر بمانەوێ ناوی راست بۆ ئەو دوشمنایەتیە دانێین دەبێ پێی بڵێین نەخۆشی نەفسی ، چونکە ئەم رق هەڵـگرتنەی ئەدیب لە « تراث » چ فەرقی نیە لەگەڵ رق هەڵـگرتن لە باوك و دایکی بەدوا ئەوانیشدا لە نەفسی خۆی چونکە لە دوازۆژدا خۆی دەبێتەوە بە باوك و دایك ، ئەدەبەکەشـی دەبێتەوە بە « تراث » . . کە حاڵ وا بێ چ چار نامێنێ دەبێ بڵێـین ئەدیـبی رقهەڵـگرتوو لە رابردوو دوچاری نەخۆشـی نەفسـی بوە . بێ و لەم دەست نیشانکردنەی هۆی رق هەڵگرتنەکە نیشانمان نەپێکابێ و بە سەهوو

چوبین ، ئەوسا هەر ئەوەندەمان بۆ دەمێنێتەوە بڵێین ئەو تەرزە ئەدیبە لە قەبێلـکی زات و باوەڕەکانی خۆیدا خەریـکی دەروێشی و صۆفیەتیە چاو و گوێی خۆی لە تیشـك و دەنـگی حەقیقـەت بەسـتوە و زەرکوەشینی دەکا لە سەر تەرمی رۆژگارە بەدبەختەکەی گەلی کورد .

من کە ناوی لاسایی کردنەوەی ئەوروپا دێنم مەبەسم بەسەهوچوونی ئەوان لاسایی کەرەوەن کە لە ئەنجامی چـاو هەڵاتنیان بە شارسـتانەتی ئەوروپاوە راستەوخۆ دەکەونە دژی رابردوَمان کە دەبینن ئەو رابردوە بە گەز و گرێی فکری نوێـی ئەوروپا « رجعی » و پاشـکەوتو دەردەچێ ، لەمەشدا تا ڕادەیێك شوێن پێـی تیرێژێـکی تەسـکی ئایدیالیزمی پڕ لە کوژێنی هەڵدەگرنەوە کە ئەوروپاش پێیەوە نەختێك ناڕاحەت بوە ، لە حاڵێـکدا ئەوروپـای راسـتەقینەی مێـژوَیی لە سەرخەتی حەزارەتی رەسەن هەڵسـتاو ، هەرگیز ئەو حاپۆلەی رقهەڵـگرتن لە رابردوَی نەهاویشتوە بەلکو ڕۆژ بە ڕۆژ لە حورمەتی شتیکـۆنینەی زیاد دەکات تا گەیشتە پلەیێك لە بایەخدان بە رابردوَ یاسـا دەردەچوێنێ بۆ هێلانەوەی کـۆلانە تەسـك و تاریکەکانی صەدەکانی ناوەڕاست نەکا دەستەی شارەوانی بە ناوی نوێ کردنەوە و سازگـار کردن دەستیان تێبدات . کە کـۆلانەی تەسك و خانوە شڕی کـۆن بپارێزێ دیارە ئەدەب و هەمو بەرهەمێـکی فکری کـۆن بەولای پاراستنەوە دەبات . ئەوروپا ئەو دەبەنـگە نیە مەوجـودی کـۆنینەی وێران بکات لەبەر تاکە هۆی رق لێ بونـەوە و کەیف

پێ‌نەهاتن . ئەوروپا لە مەوجوودی کۆنی زیاد دەکات و رۆژکاری نوێــی دەداتە بەر درێژەکێشانی سەرکەوتووی رابردوو ، دوارۆژیش لە سەر بنجی ئێستایەوە بەرەژوورتر دەبات . ئەم تێكبەستنەی کۆن و نوێ و ئایندە بە چەشنێك خۆی سەپاندوە لە وڵاتە پێش‌کەوتوەکان و وەهـــاش لە هەمتو تەجرەبەیێك دەرچوە ، وای کردوە بزووتنەوەی شۆرشگـێڕانەش بکشـێتەوە لە کەلێـــك هەنگاوی کاڵ و کرچی چەپڕەوانەی بەزاهیرپێش‌ڕەو کە ( لینین ) کاتی خۆی دلێرانە تاوانباری کرد و بە هەمتو توانایێـکیەوە بزووتنەوەی بۆلشەفیـکی لێ‌گێڕایەوە . خۆ ئەوەی راســـتی بێ کەلەپووری ئادەمی‌زاد یەکێ لە ســـەر ئەوە نەکەوتوە ئەوروپا و ( لینین ) لەسەری بکەنەوە بۆ خۆش‌ویســـتن و پایە لێنانی . گریمان بۆ ماوەیێك هەمتو جیهان هێندە خوالێ‌گۆڕیو بتو کەوتە دژی رابردوو ، ئەوساش ئەم رابردوە هەمان تاکە سەرچاوە دەبێ کە ئێمەی لێ هەڵقوڵیوین ئیتر بایی حـورمەت و نرخی ئێمە ئەویش بە حورمەت و نرخە . هەرگیز نایێتە عـەقڵی راســـت و دروستەوە مەرحەبا بکرێ لە تف‌هاویشتنی سەرەوژوور .

/ کە قسەمان گەیشتە ناوهێنانی ئەوروپا با ئەوەش بڵێم رۆشنبیرانی ئەوروپا ، چ سۆشیالیست چ سەرمایەدار ، لەوەندە راناوەستن بایەخ بە رابردووی خۆیان بدەن ، ئـەوان لەجیاتی ئێمەش خەریکی رابردووی ئێمەن و ریز لە کەلەپوورمان دەنێن . کە نەختێـــك بگەڕێینەوە بۆ رابردوو دەبینین بەشێکی زۆر لە زانا و ئەدیبەکانی ئەورپا خۆیان تەرخان

کردوە بۆ رۆژهەلاتناسی و بە هۆی خەریك بون و لێکۆلینەوەی ئەوانەوە خەلقی رۆژهەلات شارەزای رابردوە زۆر کۆنەکەی خۆیان بونەوە کە هەزاران سال بو لە بیری کەسدا نەمابو . پیاوێکی وەك ئۆسکارمانی ئەلمان لەسەر تەکلیفی قەیسەری ئەوسای ئەلمانیا بەر لە ٧٠ سال هاتۆتە کوردستانی ئێران و بەند و بەیت و حیکاتە کۆنەکانی کوردی نوسیوەتەوە لە دەمی شایەر و حیکایەتبێژی کوردەوە . تازەبەتازە کۆڕی زانیاری کورد خەریکە ئەو کارە تەواو کات کە ئۆسکارمان شەقلی بۆ شکاندین لە جەرگەی ژیانی مەعنەویمانەوە . زوربەی ئەنتیکە و ئاساری کۆنی رۆژهەلاتی نێزیك زانا ئاساریەکانی ئەوروپا دەریانخست و خوێندیاننەوە . بەلامەوە یەکجار سەیرە ناوناوە کە دەبیەم ناوی ئەو زانایە ئارکایۆلۆجیانە بە (دز) دەبرێ ، گۆیا بەشێکی زۆر وەیا کەمی ئەنتیکەکانیان بردەوە بۆ ناو مۆزەخانەکانی ولاتی خۆیان . لەم قسەیەدا خەلقەکە ئەو راستییە لەبیر خۆیان دەبەنەوە کە ئێمە بە درێژایی هەزاران سال خەریك بوین شوێنەوارەکانمان کوێر دەکردەوە و ئەنتیکەکانمان وردوخاش دەکرد و ئەو نوسینانەی بەسەر بەردانەوەبون هەموومان دەسڕینەوە . دەك دەستی ئەو دزە خۆش بێ کە نایەلێ مێژوو بە دەست نەفامانەوە سوڕکوم بێ . مەسەلەی کتێبە دەسخەتە کۆنەکانمان ئەویش وەك ئەنتیکەکانمان زوربەیان لە کتێبخانەی رۆژئاوا پارێزران ، بەشێکی زۆری دەسخەتی نرخدار لە ولاتی خۆمان بونە خۆراکی مشك و مۆرانە و سیسرە . ئێمە بەداخەوە

لە ماست کتێب و شوێنەواری کۆنمان وەك ئەو ئەهرەمەنە بڕین کە بەیتە شاکارەکەی پیرە مێرد لە موناسەبەیێکی جەرگبڕدا ئیشارەی بۆ دەکا :

شەوێ دەست ئەهرەمەن کەوت خاتەمی مولکی سلیمانی
کەچی میر و گزیری پێ دەکرد قەدری وەها زانی !

[ چەندین جار دیومە مەردی دڵسۆزمان هەر هێندەی عەقڵ بە دونیا شکاوە کە پەڕە شڕی کتێبی دەسخەتی دیوە لە ناو خۆڵ کەوتوە کوتوەتی دادەی خێرا بی‌سووتێنن نەکا بێ‌حورمەت بێ ]. رەنگە پەڕە شڕی ئەوتۆیی گەوهەرێکی واتا وەیا خەزنەیێکی دەنگ و باسی رابردوو لە پەراوێزێکی نووسرابێتەوە و بە سووتاندنی لەناومان بردبێ . هەر ئەو پەڕە شڕانەن ئێستا لە کتێبخانە زلەکانی رۆژئاوا جانخانەی بۆ دروست کراوە لە خانوی بە کۆندیشندا ، ژمارەشی خراوەتە سەر وەك ئەوەی سامانێکی نرخدار بێ . ئێمە خەریکین لە وانەوە نرخی ئەو کتێبە زەردە پەڕبووتانە و پەڕە شڕانە بزانین و بە چاولێکەری وانەوە بیانپارێزین . سەیر لەوەدایە دوای [کرانەوەی مێشك و چاومان بۆ نرخی ئەوان ئاسارانەمان لە رێی پەند وەرگرتن لە میللەتانی پێشکەوتووەوە ، ئەدیبی نەوباوی کورد خەریکە بە هۆی بەسەهەوچوونیەوە لە لاسایی کردنەوەی نابەڵەدانەی رۆژئاوا سەرلەنوێ دەست‌کاتەوە بە لەناوبردنی کەلەپوور و رابردوومان] : جاران پاشکەوتوو بوین رابردووی خومان دەکوشت ، ئەمجارەیان

رابردوَمان بە پاشکەوتوێی تاوانبار دەکەین و دیسانەوە دەیکوژین ..
سەیرە لە کـۆیێ !!

بە هەمە حاڵ هەڵوەستی ئەو ئەدیبانە لە ئاست کەلەپۆر هەرچـی دەبێ بابێ، من کە خـۆم بە رۆڵەیێـکی سەدی سەدی نیوەی دوەمی سەدەی بیستەم دەزانم و چاوم بڕیوەتە ئەو هەنگـاوە هەڵنەهێنراوانەی زوَتر بەرەو سەدەی بیست و یەکمان دەبەن، ریزی زۆرم هەیە بۆ ئەو کەسانەی بە پێی سـەردەمی خۆیان نەختێـکیان لە روَناکایی رۆژگارە تاریکەکەیان زیاد کردوە، مەرجیش دانانێـم ئەو روَناکاییـە لە گلۆپی کارەباوە وەیا لە چرای لۆکسەوە بێ، چرا قۆدیلە و شاپلیت و مۆمێش بێ پێـی رازیم. من کە لۆکسـم چنگ نەکەوت چرا قۆدیـلە و مـۆم ناکوژێنمەوە چونـکە چـیترم نیە ئەشـکەوتەکەی پێ روَن کەمەوە، کە کارەباشـم بێ دەرحاڵ شەوقەمەنیە کۆنەکان بەلاوە دەنێم بێ ئەوە زەرّەیێك لە ریزم بۆیان کەم بێتەوە: ئـەم شـەوقـە کزانە لە کاتی خۆیاندا کاری کارەبایان بـۆ کردوَم ئیتر بـۆ لێیان نارازی بم ئەگـەر چیترم بەبەرەوە هەبا دەبێ لەکاتی خۆیدا بە کاری بێنم. من تۆزە نابم لەو شەوقەی هەمبوە، بە پەرۆشم بۆ شەوقێك کە نەمبوە.

من دەستی وێران کردن و لەنـاوبردن بۆ هیـچ شـتێـکی لێرەبەپێشەوەی کورد درێژ ناکەم کە بزانم بایی تۆسقاڵێك لە سـامانە یەکجار کزەکەمانی زیاد کردبێ چ جایی شیعری کەلە شـاعیرێکی وەك نـالی کە بە هەمتو گـەز و گرێیەکی سـەردەمی خـۆی لە ریزی

هەرەپێشەوەی تێکڕای شـیعری رۆژهەڵات دێت . من کاتێـك
لەبەر خۆمەوە دەخوێنمەوە :

ئـەم غەزالانە کە نەقشـی دیدەمن
تەن سپین و دیدە کاڵ و مۆ سیان

هەست دەکەم نالی سەرەڕای پڕاندنی رەنك و بێنی بەهەشـتی
هەڵبەست بە رۆماندا ، وێنەیێـکی هونەریی ئەوتۆشـی لە لۆلۆی
وشە و ئاوریشمی هۆنینـەوە نەخشاندوە هاوتای تـابلۆی رەسـامە
زلەکانی جیهـان بێت : کورد کە کەسی نەبوە بە (ریشـە) وێنە
بکێشێت نالی هاتوە بە هەڵبەست وێنەگریی کردوە ، بەڵـکەی
سەلماندنم ئەم نموونانەن کە بـە رێـکەوت لە خەرمانی تابلۆکانی نـالیم
هەڵـگرتنەوە :

١ ـ دەس‌بەندییـانە دێن و دەچن سەرو و نارەوەن
خاوەن کولاه و سـایە وو بەرگن وەکـو ملوك
کانی دەزێن بە تاو و درەخت ئاوسـن بە با
شـادیی بەهارە بولبولە داماد و غونچە بووك
وەك چاوی وشـکە صوفییە کانی لە دار و بەرد
دەردێن بە صەد (ترنّم) وگریان و نـۆکە نۆك
رایێڵی تار و پۆدی کڵۆی بەفـرە ئابشـار ،
با بای دەدات و ماسی پیـا دڵی وەکو مەکـۆك

شەبنم کە (نظم و نثره) لە ئەوراقی غونچەدا
گۆیا بوە بە زار و زمان دداں و پۆك

٢ ـ هێند مونتەزیری تۆ بۆ هەتا چاوی سپی بۆ
نەرگس کە لەسەر یەك قەدەم و دیدە چەقی بۆ

٣ ـ سروشکم ئاو و دانەی نارەکی دڵی
بە گەری داوەری بەم تەرزە تەرزە

٤ ـ گەه تاوس و گەه کەبکن و گەه بۆقەلەمۆن
گەه ئاتەش و گەه شوعلە وو گەه دودی سیاهن
لالەن بە بەدەن ئەتلەسی ئەخزەر کە لەبەر کەن
نەوڕەستە گوڵی بەستە لەگەڵ دەستە گیاهن

٥ ـ مەستی خەیاڵی ئەوە لەحزە ژمێری شەوە
دوشمنی خەونی خەوە دیدەیی بیداری من
دیدە نیگەهبانییار تیپی سروشکم هەزار
ناڵەیی دڵ نەیسەوار ئاهە عەلەمداری من

٦ ـ تا سەری زولفی لەسەر رۆ حەلقە دا
من وەکو ماری سەر ئاور خەم دەخۆم

٧ ـ سەراپا گوارە زەردی ترس و لەرزە
دەڵێی ماسی بوە لەو جێگە بەرزە

٨ ـ بۆ تۆ کە بیکر و تازە وەکو حوری جەننەتی
قەیدی چیە عەجوزەیی دونیا بدەم تەڵاق

٩ ـ ئەژدەهای زولفت لە دەوری گەنجی حوسنت حارسە
حەلقە حەلقە چین بە چین سەر تا بە خواری گرتوە
خۆش لەسەر سینەت سەری هەڵداوە دوَ گۆی سەربەمۆر
مات و حەیرانم کە چۆن عەرعەر هەناری گرتوە

١٠ـ عاشقی صنمی حەقم قوربانی دەستی قودرەتم
چاوی ماوێ خاڵی شین کوڵمی سپی زولفی سیا

١١ـ دەسرۆکەیی هەوری چ حیجابێکە کە تێیدا
شمسُ فلك الحسن انارت فتوارت

١٢ـ بەچەیی بەرچەمیی و پرچی سیا
هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا
لادە دەسرۆکەیی هەوریَ لە جەبین
دەرکەوێ شمس و قمر نور و ضیا(٢)
فەرشی کەففی بەری پێتە نەرگس
سەری داخستوە وەك چاوی حەیا

١٣ـ نالی ئاسوَدە نیە توَلە نەمامی عومرت
بە نەفەس دێت و دەچی ئەسلی لەسەر بایێکە

١٤ـ تا نەگریائامان و تەم ولاتی دانەگرت
گوڵ چەمەنئارا نەبوَ هەم لێوی غونچە وا نەبوَ

---

(٢) لە قرآندا رۆژ بە ( ضیاء )و مانگیش بە ( نور ) تەشبیە کراوە .

١٥ـ تەنی حاجی لەسەر چارچێوەیی ناجی دەڵێی نەعشە
لومابی خۆر لەسەر ئیحرامی وەك كافوری ئەكفانە

تابلۆ كانی نالی بەبەریانەوە هەیە ، لەبەر زۆری ، نیمچە دیوانێك پێك بێنن .

لەم عنوانانەدا نالی شاعیرێكی مادەتی نیە ، لەگەڵ شاعیریدا وێنەگریشە . هەر جارە لە خوێندنەوەی بەیتی وێنەگرانەی نالیدا عینوانە ژیرە خۆشكەڵەكەی دیوانی « الرسم بالكلمات »ی نزار قبانیم بە بیر دەكەوێتەوە . بێگومان ئەم دەسەڵاتەی وێنەگرتنی « شت » سروشت بێ یا مرۆڤ ، تجرید بێ یا مادە ، بەڵگەی تێكەڵ بوون و تفاعلە لەگەڵ دەروبەردا ، لەم مەیدانەشدا نالی لە ریزی پێشەوایەتی و رابەری دێت . ئەم ئامادەییەشی بۆ (تێكەڵ بوون و تفاعل) پاڵپشتێكی گەورەیە بۆ ئیمكانی گەیشتنی بە پلەی تكامل چونكە لە هەمو پەروازێكی بەرەو ئاسمانی واتا و جوانیدا شریتەی بەسترانەوەی بە « واقیع » درێژ دەبێتەوە و زۆرخان و ژێرخان بەشدار دەكا لە سازدانی تابلۆی هونەر . پێی ناوی من بڵێم ، پچڕانەوەی مرۆڤ لە زەوی و نشیمەن و دەروبەر پتر لە نیوەی جیهانی مرۆڤایەتی لەناودەبا بەو پێیەش بەرهەم دادەشكێ و دادەلەنگێ . تۆ سەیری نالی لە وصفی بەهاردا چەند واقیعیانە ژیانەوەی روەك بە ژیانەوەی رۆژی مەحشەر تەشبیە دەكا :

دایەی زەمـین کە حامیلی ئەبنایی مەحشـەرە
هـــەر تۆیەکی تیـا کە ئەمانەت بتۆ دایەوە

لەم تابلۆیەدا لایەنی ژیانی ئێستاکە پشکی پتر وەرگرتوە لە قیامەت ، بەلاّم قیـــامەت تێیدا بۆتە فەرمانبەرێـکی بێدرێغ لەو روەوە کە ژیانەوەی سەرلەبەری تۆ و گیاوگوڵی زەمینی راگەیاندوە چونکە لە مەحشەردا هەمو گیانلەبەرێك دەژیێتەوە .

ئەم دەسەلاّتەی نالی لەم هونەری تابلۆکێشان و لە هەمـــو هونەرەکانیتر کە بەدرێژایی ئەم نوسینە لە بەشی یەکەم و دوەمیدا باس کراون ، ئا ئەم دەســـەلاّتە هەر خۆیەتی جارێـکیتریش لە سەرنەرمکردنی وشەی سەخت بۆ ناو چارچێوی هەلبەســـت بەو پەڕی هێز و تەواوییەوە دەردەکەوێت . ئەم راگەیشتنەی نالی بەسەر هەمو لایەنێك و حەق و حسێبێـکی شیعردا ، ئەویـــش بۆ خۆی یەکـێکە لە تایبەتیەکانی هونەری نالی کە وا بە دەگمەن نەبێ پەیدا نابێ بۆ مرۆڤ . گـەلێك لە شاعیری گەورە و لێهاتو هەن کە بەرزییان لە یەك دو مەیدانی هەڵبەســـتدا دەردەکەولێ ، لەچەنـد مەیدانێـکیتریدا ون دەبێ . بێ گومان ئـەم دیاردەیە دەگەڕێتەوە بۆ نوقســـانی یەکێك لە دو ســـەرچاوە بنجییەکانی هەڵبەست : زات و بابەت ، ئەگەر نوقسانیەکە لە هەردوکیاندا نەبـــێ . دیارە لێرەشدا مەبەس لە زات و بابەت دو لایەنەکەی بەهرە و پێگەیشتنە .

لێرەدا مەودای گوتار بە پایان دەگات و خامەم بە دیار داهاتنی کاتی بەرگی چوارەمی گۆڤاری گۆڕ دەمی خۆی دەبەستێ ، وەك شەهرزاد ، داستانەکانی ناوەرۆك و سەرنەرمکردنی وشەی سەخت و باسیتریش کە هەبێ هەڵدەگرێ بۆ بەشێك لەو هەزار و یەك پەڕەی گۆڤارەکە کە بەر خۆی دەکەوێت .

* * * * *

# باقة ورد من حديقة الشاعر الكردى «نالى»

العضو العامل : مسعود محمد

## القسم الثاني

ورد في القسم الأول من هذا المقال ذكر لموضوع « المضمون » في العمل الأدبي والفني بصورة عامة وعلى غاية الاختصار رعاية لما يقتضيه اختزال التفصيل في المواضيم المتفرعة من الأصل . والمنتظر ان يتناول هذا القسم شرح المضمون في ادب ( نالى ) بصورة خاصة ، ولكن ليس مما يعود بالنفع على القارىء وعلى الموضوع نفسه استعجال الوصول الى « المضمون » بطيّ النظرات والخطرات التى تنبعث هنا وهنا من أبيات ( نالى ) العميقة العريقة ولكل منها نكهة تزيد الاديب الكردى ثراءاً وصقلا ونضجاً ويكون فقده لها خسارة عليه لاتعوض . لذلك تركت القلم يرتاد رياض نالى على رسله يقطف ويضم ويشم .

والذى يجب بيانه قبل الوصول الى « المضمون » هو أنه مما يرقى الى مستوى البديهية ان يكون شاعر مثل ( نالى ) قد طوى جميع الميادين التى

يدور حولها الكلام ويثور الجدل عادة في بحث ادبي جادّ من مثل احاطة المترجم له بعلوم عصره وأدبه وامتلاء نفسه بصور المجتمع وتشرب وجدانه للطبيعة وامتلاكه ناصية المهارة الأدبية واللغوية وتكوين القناعات في مجمل امور الحياة والعقيدة وما اليها ، اقول انه يكون قد طواها يقيناً قبل ان يبلغ في الشعر مبلغ القدرة على شحن النظم بالجمال واللطافة والمتانة والمعنى حتى لتخاله يكاد ينفجر بما فيه فان الشاعر المشهود له بالرسوخ قد يتعثر دون هذه المقاصد وربما مكّنته قدرته على الخلق من الأتيان بالدرّة الواحدة في صدفة واحدة من أبياته على حين تجد بيتاً لنالى قد حوى الدرتين والثلاث واكثر من دون أن يظهر عليه عناء أو لهاث في تهيئة الدرج لكل درة ، وقد يتبارى الادباء في استخراج المعانى الكثيرة في بيت له حتى اذا استراحوا من استقطار كل ما فيه من معنى وجمال خايلهم امر جديد من روائعه على حين غرة فكأنه قد ازاح عنه طاقية اخفاء . ومثلت لذلك ببيت واحد من بين عشرات مثله عثر فيه حتى الآن على اربعة معان مستقلة وقد يكشف منه المستقبل غير ذلك . والعجيب من أمر هذا التزاحم انه خال من التكلف لم يصرف فيه مجهود ينم عن التلمس ولا يضيق مجاله بوجه المعانى المتعددة فكل معنى منها مستريح في مراح فسيح ، ثم ان البيت بعد هذا كله متدفق بالتأثير الشعرى والعاطفى .

ومما يميز نظم نالى ظاهرة من ظواهر الكمال الفنى سميتها بالتوازن والاستواء بين المعانى المتعددة والمضمون المادى والمضمون الشعرى في البيت ، فالحق انه لما يحمل على الاكبار هذه القدرة الفذة على حفظ التوازن في البيت اذا ظهر فيه أمر قوى بخلق ما يساويه من معنى قوى أو صورة رائعة أو مفارقة بارزة في البيت تحفظه من الميل إلى احدى جهاته ، ولربما وقع في وهمك

مخرم تنفذ منه الى نقد النظم فلا تلبث ان تعثر من خلال سبكه العام أو احدى جمله او كلماته على رد يسد ذلك المخرم . وقد يتطوع نـالى ، بلا تظاهر ، بعرض مطعن ملحوظ في أحد أبياته ولا يـكون ذلك الا فخاً يصيد به فطنة الاديب ليلقنها درساً أدبياً مستنبطاً من موضع الطعن ذاته لا موضع آخر في البيت ، كل ذلك في سلاسة وعذوبة يقل نظيرهما في اى أدب . ولقد نبه نالى ، اكثر من مرة ، الاذهان إلى تلك الاحابيل فقد قال ، ضمن اقوال اخرى متعددة مشابهة ، ما معناه « لقد نسج نالى بخيوط الشعر الدقيقة من خيال الشعر مئة شبكة لكل من هو شاعر » واتيت في المقال بشاهد من ابياته على ظاهرة « التوازن والاستواء » لايتأتى توضيحه في العربية الا في مقال مستقل وعبر معاناة من التوضيح والتفسير يضيق عنها المجال في هذا المقال . ولربما امكن هنا تقريب المفهوم من احد ابياته الأخرى التى ورد في المقال تمثيلا لأحد هاتيك الفنون وذلك بترجمته الى العربية في العبارة الآتية ، والبيت ورد في وصف أحد مظاهر الربيع : « عجباً نسـج من ( قطعة قطن ) السحاب هذه بغزول المطر قطيفة خضراء في سعة وجه البسـيطة » .

لەم ( پارچەلۆکە ) هەورە بە قەد ڕوی هەمـوو زەمین

بەم ڕایەڵـە قەدیفـەیی سـەوزی عەجـەب تەنی

والذى ورد في صدر البيت من اللفظ الموضوع بين قوسـين قد وضع مثيله أيضاً في العبارة العربية بين قوسين ، وهو يعنى في الكردية شيئـين مستقلـين من كل وجه فهو اذا اعتبر كلمة واحدة كانت صيغة التصغير لكلمة ( پارچه ) بمعنى القطعة الصغيرة ، واذا اعتبر صيغـة تركيبية لـكلمتي ( پارچه ) بمعنى القطعة و ( لۆكه ) بمعنى القطن افاد معنى ( قطعة القطن ) في العربية . فهـذا

اللفظ على المعنى الاول ( قطعة صغيرة ) من السحاب يصور مهارة الربيع في نسج الشيء الكثير من الشيء القليل ، وتتأكد مهارة الربيع هذه مره أخرى فى قلب بياض ( قطن ) السحاب الى خضرة القطيفة ، وهى العشب الاخضر ، دونما استعمال ادوية القصر والصبغ . والبياض هنا مستفاد من لفظ القطن نفسه وليس مستماراً على سبيل التسامح من غلبة اللون الابيض في احتمالات الوان السحاب المتعددة من ابيض وادكن وأدهم واسود واحمر . وهو على المعنى الثاني اي ( قطعة القطن ) يناسب بين قماش القطيفة والمادة الاولية المصنوعة منها القطيفة وهو القطن . ويلاحظ من حيث المضمون ألاجتماعي أن البيت لم ينحصر في اطار المعنى الجمالي العام المجرد المأخوذ من وصف الطبيعة ، رغم امتلائه بالجمال سبكاً وعرضاً وبياناً ، فقد مزج بين الطبيعة ( الربيع ) وبين منتوج اجتماعي ( القطيفة ) في رسم الصورة الفنية شأنه في ذلك شأن اي شاعر موثق الصلة بالواقع في تحليقاته وابداعاته .

وبينت ضمن ما بينت من خصائص ادب نالى قدرته النادرة على تطويع الكلمة العصية في بنية البيت دون نبوّ او قلق وكذلك تسويغه التعبير الصعب في مذاق القاريء ، وقد تابع في هذا اسلوب القرآن في احتفاظه بجزالة التعبير وموسيقى اللفظ وهو يسوق آياته الرنانة في اقل المواضيع حظاً من الطلاوة والرنين كموضوع المواريث مثلا ، فالملحوظ ان عبارات القرآن في تفصيل الأرث ثرية بالجزالة و الرنين والطلاوة كثراء الآيات التى نزلت بعد انتصار ( بدر ) حيث المجال فسيح لفنون البلاغة والافاضة والنشوة .

ولقد يكون في مقدور كل شاعر ان يأتي باللفظ العصي ، ولكن ما جدوى ذلك اذا كان اللفظ شجي في حلق البيت ، فان شرط الابداع

سلاسة اللفظ ويُسر مجاورته لغيره من الالفاظ في النظم .

ولكي يتسنى للمتأدب الكردي الناشيء تذوق ما في هذا الفن الصعب من البراعة عليه ان يتخلى كلية عن النظرة التى بدأت فى الذيوع بين قسم من شباب الكرد والتى تعتبر التراث فى مجموعه ضرباً من التخلف يجب مسحه واعدامه . ولقد فصلت في المقال الأصلي هذا الامر على حسب إكباري للتراث باعتباره الذروة التى بلغتها الحضارة الفكرية الكردية وقلت ضمن ما قلت ان من يعدم نالى وادب نالى عليه ان يعدم قبل ذلك كل الماضي الكردي بجميع طبقاته ومقومات حياته فان شعر نالى منسوبا الى عصره ارقى بمراحل من المغزل والمحراث والجرشة والرحى كل اولئك منسوبة الى عصرها أيضاً . ولا يجوز قطعاً ترك هذا النمط من المتأدب الحديث يستمرىء المباهاة بعدائه للتخلف عن سبيل تشديده النكير على التراث على حين يستبقى لنفسه الفخر بمجاملة البروليتاريا التى كانت متخلفة عن شأو التراث من كل وجه فانك اذا قارنت شعر نالى او حافظ الشيرازي أو البحتري أو احمدي خاني الى افكار العامة وعقائدها لوجدته في المقارنة اقرب الى الثورة بجانب ذلك التخلف الفاجع في تلك الافكار والعقائد . وعلى المتأدب الحديث ان يربأ بنفسه عن طلب الفخر بالهجوم على تراث لا يستطيع المصاولة وبافتعال حب الطبقات البائسة وهو حب أصبح بمثابة « موضة » هذه الأيام ولا يكلف مدعيه شيئاً . والذي يجب فهمه وادراكه هو انه لا لوم على شاعر كردي عاش قبل قرون مضت فى ادبه الذى قد لا يوافق ذوق جماعة من ابناء هذا العصر كما انه لا لوم على فلاح او عامل او كاسب عاش في الماضي ولم يستطع ان يكون ثوريا او تقدمياً او على حظ من رفض الذل يقارب حظ الشاعر الذي عايشه على الاقل .

ان النتيجة المباشرة للنظر الى الماضي على هذا النحو من الاتهام والكراهية هى حتمية الحكم بكون الحاضر ابناً غير شرعي للماضي ، ويأتي من ذلك مباشرة سبق الحكم بعدم شرعية ولادة الغد من الحاضر ، ذلك لان من يعجز عن رؤية اواصر النسب بين الماضي والحاضر هو اشد عجزاً من ان يكون فى برجه العاجي الاهاَ يستولد الحاضر غداً شرعياً في زيجة سليمة بين الحاضر و بين عوامل التطور الأصيلة فيه حسب رؤيته . والقول هنا منداح بما يزيد عن حجم التلخيص اجتزيء منه مابينته في المقال الكردي من ان مرد هذا الخطأ الفادح عند المتأدب الكردي هو تأثره بشريحة ثقافية مثالية اوربية تلتبس بشيء من الجرأة واللامبالاة واللامسؤولية على حين تتصف اوروبا المتطورة من جذورها التأريخية بنقيض ذلك كله فهي بلغت في رعاية التراث وصونه مبلغ سن الشرائع لمنع المؤسسات البلدية من هدم البيوت القديمة وتعديل الازقة الملتوية باسم التجديد والتصحيح ، وهى بالبداهة اكثر اعتناءاً بتراثها العقلي بل إنها تتوسع في هذا الباب حتى تتسع باهتمامها لتراث الشرق ومن الامثلة الحية على ذلك ان المجمع العلمي الكردي يستكمل اليوم في حفظ الفولكلور الكردي عملا بدأ به ( اوسكارمان ) الالماني قبل سبعين سنة مضت . وغنى عن البيان ان البقية الباقية من اثار الشرق التأريخية كانت ستزول مثل القسم العظيم الذي اندثر منها عبر القرون لولا اعتناء علماء اوروبا بها خلال القرنين الأخيرين . واعجب للقول الذي يتهم اولئك العلماء بسرقة بعض الاثار فهذا القول ينسى في ذلك دورنا الذي امتد مع التأريخ في هدم الآثار وتفتيتها ومسح كتاباتها . وشأننا مع المخطوطات القديمة كان كشأننا مع الاثار من حيث قلة الاعتناء فلقد شهدت الرجل المخلص بين قومى يبادر الى

حرق الورقة المخطوطة القديمة صوناً لها من الهوان . وهنا نصل موضع العجب فى المفارقة : فلقد كنا قديماً نهدم الماضي لاننا كنا جهلاء واليوم يأتي المثقف الكردي الجديد فيماود هدم الماضي لاتهامه اياه بالتخلف . . ولله في خلقه شؤون .

على اني في دفاعي الحار عن التراث لم اوجه كلمة نقد واحدة للادب الكردي الحديث واساليبه الطريفة في التحرر من القيود والقواعد ولم ادع احداً ابدا للتمسك بالقوالب القديمة وتحريم الابتكار على نفسه في المبنى أو المعنى . كل همي الا يظلم التراث عبثاً .

المتعمق في شعر نالى يستيقن من وجود نواح كثيرة فيه للتفوق من جملتها انه متفوق فى كل ميدان على عكس ما يلحظ في شعر كثير من مشاهير الشعراء من حيث انحصار بروزهم فى حلبة دون حلبة فقد يجيد احدهم الوصف ولا يبلغ في العاطفة شيئاً أو قد تلتوي عليه السبل في الحكمة أو التصوف . ويرتفع مقدار نالى مرة أخرى في ملاحظة احترامه لنفسه وارتفاعه فوق مزالق الزلفي والتوقع ، وتلك واقعة تريح وجدان القاريء فانه مما يبث الطمأنينة في نفس المكبر لشعر شاعر متفوق ان تكون معانيه الجميلة قد نبعت من روح نظيفة فاننا نعلم من شأن كثير من مشاهير الشعراء قديماً وحديثاً انه لولا شفاعة ادبهم فيهم لما استراح ذو حياء الى صحبتهم خشية علوق رذاذ من صيتهم المجرح بأذيال عصمته . لقد بالغ نالى في مجال الارتفاع فوق مواطن الشبه الى حد التحنف والتزمت ، فانك اذا نظرت في ديوانه بالمجهر لا بالعين المجردة لم تعثر فيه على كلمة واحدة يشم منها ريح الارتزاق وليس فيه غير قطعتين من بضعة ابيات وغير بيت واحد مستقل مدح فيها امراء بابان

وذلك في بواكير نبوغه . والابيات هذه خالية هي ايضاً من اية كلمة أو ايماءة تحمل على التوقع حتى انها لم تحو لا صراحة ولا اشارة اي معنى من معاني جود الممدوح وذلك يدعو الى الاقتناع بان نالى مفطور على الزهد والنزاهة وليس معانياً لهما ، ولهذا السبب اختفى من شعره مطلق الوجود للتعشم .

ندرة المديح هذه ظاهرة بارزة فى شعر نالى فهو في النعت لم يجاوز شخص الرسول (ص) وجاء ذكر خلفائه الاربعة الراشدين في خواتيم نعته للرسول (ص) . وهذه الظاهرة تنسجم مع ظاهرة أخرى ملحوظة في ادبه وهى الثقة بالنفس والاكبار لها . وليس ادراك ذلك بالأمر العصى على فهم من يفصل بين العظمة المتأصلة وبين الدعوى التي لا غناء فيها ولا اغتناء وراءها .

ومما جاء في بعض مناسبات المقال استشهاد بنماذج من شعر نالى توضح مكان الكلمة الطلية الرنانة في تكوين موسيقى البيت مستقلا عن مهارة الشاعر وكيف يتداعى من ذلك معنى المهارة الفائقة في الاحتفاظ برنين النظم وسلاسته عند استعمال الكلمة الصعبة والمعنى العصي .. واستشهدت في موضع آخر من المقال بأكثر من عشرين بيتاً كل منه يسوغ اعتباره لوحة فنية لقوة ما فيه من براعة التصوير والتمثيل حتى قلت اني اذكر لدى تلاوة امثال تلك الابيات في ديوان نالى عنواناً وضعه الشاعر ( نزار قباني ) لأحد دواوينه حين سماه ( الرسم بالكلمات ) .

وختمت المقال بالاعتذار عن طرق موضوعي ( المضمون ) و ( تطويع الكلمة العصية ) في شعر نالى وما اليهما من المواضيع الاخرى وذلك لضيق

المجال في هذا القسم الثاني ووشك انتهاء المساحة المخصصة له فيمسك القلم هنا مثل ( شهرزاد ) عن الكلام المباح بانتظار ما سيقع في حصته من الالف ورقة والورقة من صفحات العدد الرابع من مجلة المجمع العلمي الكردي .

* * * * *

# ئەدەبی کوردی

ئەندامی کارا : عەلائەدین سەجادی

جارێ پێشەکی مەبەست بە ئەدەب ئەو قسـە و بیر و باوەڕە جوانانەیە کە لە دەروونی ئەدیب و هۆنەرێـکا پەیدا بووە و بە وتەی جوان و ئاوازەدار لە دوو لێوەی ئەو ئەدیب و هۆنەرەوە دێتە دەرەوە، وەکـو بڵێیت ئەو قسانەی ئەوان ئەبن بە ئـاوێنەی نەتەوەکەیان .
جگە لەمە دیســـان وەنەبێ ئەدەب هەر بڕێتی بـێ لەوە ، بەڵـکو بەرهەمی رەنگینی دەسترەنگینێك ، پیشـەی پیشەگەرێك ، نەخشەی نەخشەســـازێك ، وێنەی وێنەکێشێکیش هەر ئەدەبە و بە ئەدەب دائەنرێ . ئەوەندە هەیـــە ئەوەی کە ســـرنجی زانایانی ئەدەب رائەکێشێ و رایکێشاوە بەتایبەتی هەر ئەو گەوهەرانەیە کە شاپەڕی ئەندێشەی ئەدیب و هۆنەرەکە بۆی کشاوە و پاشان بە وشەی جوانی بە سۆز و سرنج راکێشەر پیشانی داوە .

ئەمە بەجۆرێکی تێکڕایی بەرانبەر بە هەمــوو نەتەوەیەك ، بۆیە ئەڵێین بەرانبەر بە هەمو نەتەوەیەك چونکە چەمکی ئـەم ئەدەبە بەم جۆرە وەکو دیمەنی کۆمەڵە تورێـکی تیشکدارە کە لە شـوێنی خۆی ئەبریسکێتەوە و ئەدرەوشێتەوە ، کەسی لێ بێبەش نەکراوە بۆ وەرگرتنی ڕوناکیەکەی، مەگەر یەکێك کە لە توانایا نەبێ شـت ببینێ ، واتە بێچاوێك ! . ئەو کە نابینێ لەبەر ئەوە نییە کە شەوقەکە ناتەواوی تێدا هەیە بەڵـکو نەبینینەکەی لەبەر ناتەواوییەکە کە لە خۆیدا هەیە ، کاتێ ئەو ناتەواوییەی تێدا نەما ئەویش وەکو کەسانی تر شـەوقەکە ئەبینێ . سەمەرەی ئەدەبیش بەو جۆرەیە ؛ گەوهەرێکی زانیارییە ، هەر نەتەوەیەك ، هەر تاکێك لە نەتەوەیەکدا ئەتوانێ وەری بگرێ و ڕێی لێ ناگیرێ ! . ئەگەر وەری نەگرت لەبەر ناتەواوی گەوهەرەکە نییە ، بەڵـکو لەبەر ناتەواوی خۆیەتی ، ناتەواوییەکەی خۆیشی ئەوەیە کە بەرهەڵستی بۆ پەیدا بووە و بۆ ئەوە هێنراوەتە پێشـەوە کە لەو گەوهەرە وەر نەگرێ ، ئەگـەر بەرهەڵستەکە نەما بە بێگومان ڕێگـــای بۆ تەخت ئەبێ بۆ چـونە پێشـــەوە بۆ ناو جەرگـەی گەوهەرەکە . ئەمەیە بەشـــی هـەمو عیلم و زانیارییەك بەرانبەر بە هەمو کەس .

ئەمجا بێینە سەر ئەدەبی کوردی :

کـورد نەتەوەیەکە چونـکە زمانێـکی هەیە ، گومانی تێدا نییە کە ئەو زمانە کەسیەتییەك و بناغەیەکی سەربەخۆی هەیە و بە هەمو جۆر

لە زمانێکی تر جیابوەتەوە ، ئەگەر زمانێکی تر بوایە لە زمانەکانی تر
ئەوان لەم و ئەم لەوان تێ ئەگەیشتن ، کە لەیەك تێ نەگەن ئەوە
ئەگەیەنێ کە جیاوازییەکی هەیە . ئینجا لەسەر ئەم دەستورە ئەگەر زمانی
کوردیی زمانبێ ـ وە زمانیشە ـ ئەبێ ئەدەبێکی هەبێ چونکە ئەدەب
شان بە شانی زمان دێتە خوارەوە ، ئەدەبیش ئەو زمانەیە کە پێی
ئەدوێن ، ئیتر هەندێکی بە پێزە و هەندێکی بێ پێز ئەمە شتێکی
ترە !

ئەمە و دیسان ئەو قسەیەش نایەتە پێشەوە کە بۆترلی لەبەر ئەوە
کە ئەدەبەکە لە هەمو روویەکەوە کۆ نەکراوەتەوە ئەم کۆ نەکردنەوەیە ئەبێتە
هۆی بێ هێزیی وەیا نەبونەکەی ! ئەمە نایەتە پێشەوە چونکە کۆ
نەکردنەوەکەی و بەردەست نەخستنەکەی نیشانەی نەبونیەکەی نییە ؛ واتە
مەرج نییە شتێك کە ئێستە لەبەر دەستا نەبو ئەو شتە لە راستیشدا
هەر نەبێت !! جا ئایا شتەکە مادی بێ یا مەعنەوی . لە مادیاتا وڵاتێکی
وەکو ئەمەریکا پێش دۆزینەوەکەی دیارە هەبووە بەڵام نەدۆزرابووەوە ،
نەدۆزرانەوەکەی ئەوە ناگەیەنێ کە لە راستیدا وجودی نەبووە ، بەڵکو
هەبووە ، ئەگەر نەبوایە نەئەدۆزرایەوە ! . . لە مەعنەویاتا خۆ ئەوە وێنە
ئیجگار زۆرە ؛ ئەدەبی دەروێشی و عالەمی « تصوف » پێش ئەوە کە
ئەربابەکانی خۆی دەمی بۆ بەرن وجودی هەبوە ئەگەر نەبوایە ئەوان
نەئەکەوتنە ئەو عالەمە و نەئەکەوتنە خولیای . ئەدەبی کوردیش ئەو
سەمەرەیەی هەیە ؛ لەسەرەتای نەتەوەکەوە هەبوە بەڵام قسەی لێوە

نەکراوە و دەمی بۆ نەبراوە ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نەبوە ا .

ئەوەندە هەیە ئەتوانرێ ئەو پرسیارە بکرێ : کە بۆچی قسەی لێوە نەکراوە ؟ . گومانی تێدا نییە زمانی کوردی لەو زمانانە نەبوە کە بنەبڕ بوبێت و وەکو هەندێ لە بنەماڵەی زمانەکان کە بڕاونەتەوە بڕابوبێتەوە ، ئەگەر لەو زمانانە بوایە ئێستە ئەم نەتەوەیە ئەم ئاخاوتنە چییە کە ئەیکەن ا . کەوا بو هەیە و وجودی هەیە . بەڵام لە لاپەڕەی مێژوویا گەلێ کۆسپ و تەنگ و چەڵەمەی هاتوەتە رێ بۆ ئەوە دەستی بۆ درێژ نەکرێ ا . یەکێ لەوانە کوشینی فیکرەکەی بووە لە لایەن غەیری خۆیەوە . یەکێکی تر لەوانە پەرت و بڵاوی نەتەوەکە بووە کە نەیتوانیوە پێلکێ به خۆیەوە ا . بەشێك لە ئەدەبی پێش ئیسلامەتییەکەی ئەو ئەدەبە بو کە لە ئاوێستا و کتێبە ئایینیەکەی پێشویا هەیبو . لە پەلامارەکەی ئەسکەندەری مەقدۆنی و پاشان پەلاماری عەرەب ئەوانە هەمو تیاچون ، نەوەك هەر هی تەنها کورد بەڵکو هی گەلێ نەتەوە . لەپاش هاتنی ئیسلام شاڵاوی مەغولیش دەستێکی گەورەی هەبو بۆ لە ناوچونی فرەیەکی فرە لە علوم و ئەدەبی ئیسلامي .

پاش ئەوە کە ئەستێرەی ئیسلام تیشکی تەواوی دایەوە ، کورد وەکو گەلێ لە نەتەوەکانی تر چوە ژێر ئاڵای ئەو ئایینەوە ، بەڵکو بیر و باوەڕی ئایینی کارێکی وای کرد کە رێگایەکی وای نەهێشتەوە کورد وەکو ئەو دەستەی درێژی کرد بۆ زانیارییەکانی تر درێژیشی بکا بۆ بەخێوکردنی ئەدەبەکەی خۆی ا .

راستە لە سەدەی چوارەمی کۆچی‌یەوە شتی لێ بەجێ ماوە کە قسەی بە زمان و ئەدەبەکەی خۆی کردبێ بەڵام ئەو شتە بەتەواوی لەوانە نییە کە بتوانرێ بوترێ لە هەمو سوچێکەوە بۆ ئەو رۆژە بەهێز بووە، بەڵکو بەهێزیەکەی لەوەدایە کە لە دوای ئەو رۆژە بێ بە بەڵگەیەك بۆ زانایانی ئەدەبی کوردی کە قسەی لێوە بکەن و بکەونە لێکۆڵینەوەی! . بەڵام کە کەوتە سەدەی پانزەهەمی میلادی - وەیا زایینی - ئەدەبی کوردی بەتەواوی لە رەوی روخسار و ناوەرۆکەوە، وەیا بڵێین لە رەوی وشە و گوزارەوە دەستی بە خۆیا هێنا و جێگایەکی تەواوی بۆ خۆی تەرخان کرد، ئیتر لە دوای ئەو رۆژەوە بەرە بەرە ئەم ئەدەبی کوردی‌یە هەنگاوی ناو کەوتە سەر زاری هۆنەر و ئەدیبەکانی کورد هەتا گەیشتە ئەم رۆژەی کە تیایاین . .

ئەمجا لێرەدا ئەدەبەکە بوو بە دوبەشەوە ؛ ئەدەبێکی کلاسیکی کە لە سەدەی پانزەهەمەوە بە تەواوی کەوتە مەیدانەوە ، ئەدەبێکی رۆمانتیکی کە لەم سەدەی بیستەمەدا دەستی پێ‌کرد. جا ئەم دوو جۆرە ئەدەبە پێویستە تۆزێ بچینە ناوەرۆکەکەیەوە بۆ تێگەیشتنی لە چۆنیەتییەکەیان .

جارێ ئەدەب وەکو لایەنی گوزارە - کەمەعنایە - ئەگرێتەوە لایەنی وشەش زیاتر ئەگرێتەوە . ئەدەبی کوردی لەو رۆژەوە کە کەوتە رو زۆرێکی زۆری، وەکو لایەنی وشەکەی گرتۆتەوە و بە زمانی

کوردی وتراوە هەروەها لایەنی گوزارەشی بەتەواوی گرتۆتەوە کە لە ناوچەیەکی کوردەوە هەستاوە و ئەو مەعنایانەی وەرگرتوە کە لە ناوچەکەدا باویان هەبوە ، وە یا بڵێین لە دیمەنی ناوچەکەوە هەستاون ، ئەمە بێجگە لەوە کە بە حوکمی تەبیعەتی بڵاوبوونەوەی زمانێکی تری لاوەکی لە ناویانا هۆنەر و ئەدیبەکانی کورد لەمەعنای ئەو زمانەشیان دیسان وەرگرتوە و هێناویانە رژاندویانەتە ناو زمانی کوردییەوە لەم لایەنەوە دیارە زیادە دەوڵەمەندییەکی تری پەیدا کردوە .

بە وێنە زمانێکی وەکو زمانی عەرەبی لە سەردەمەکانی پێشودا ؛ واتە لەسەردەمی ئەدەبی کلاسیکی کورددا بە هۆی ئایینەوە کەوتۆتە سەر زاری هۆنەر و ئەدیبەکانی کورد و هێناویانە موفرەداتی ئەو زمانەیان بە تەواوی لەگەڵ زمانی کوردیدا جۆش داوە و لە قاڵبی هۆنراو وە یا رستەدا دایانڕشتووە ، ئەو موفرەداتانە وایان لێهات بون بە پاژێکی زمانەکە و لەوانەیە بوشبن بە کوردی ، بەڵام چەمکەکانی ئەو موفرەداتانە بە پێی چەرخ و رۆژ گۆڕان . وشـەیەکی عەرەبی کە لە سەدەی پانزەهەمدا ـ بەوێنە ـ هۆنەرێکی کورد لە نـاو هۆنراوەکەی خۆیا بەکاری ئەهێنا هەر ئەو وشەیە لە سەدەی شانزەهەمدا کە هۆنەرێکی تر بەکاری ئەهێنا چەمکەکەی ئەم جیا بو لە چەمکی ئەوەی پێشو ا . هەروەها بەم جۆرە تا کەوتە ئەم سەدەی بیستەمە . لەم سـەدەیەدا کە ئەدەبی رۆمانتیکی پەیدا بو لەوانەیە چەمکی ئەدەبی کلاسیکی وای لێ بێ باڵ بگرێتەوە و لە مێشکی هۆنەری رۆمانتیکیدا نەمێنێ و بفڕێ ا .

بەڵـکەی هۆنەر و ئەدیبەکانی رۆمانتیك بۆ ئەم ئیشـەیان ئەوە بێ کە وتیان : سـەردەمی خۆ خەریك کردن بە وشەوە بەسەرچێ ، ئەبێ کۆشش بخرێتە سەر گوزارە و گوزارە فراوان بکرێتەوە ، وشـەکان خۆیان لە خۆیانا قەڵەو وە یا لاواز بن مەبەست نییە ، بەڵکێ وتیان کەرەستەیەکی زۆر لە بازاڕی مەعـانیدا پەیدا بووە ؛ ئەم کەرەستەیە لە گوزەری پیشەسازیدا و لەراز و نیازی گەیشتنەوەیەکی تەنگی زەوی ماوەی نەهێشتەوە بۆ ئەوە کە بیر ئیتر خۆی بە وشەوە خەریك بکا ، بەڵـکێ هەر فریای ئەوە ئەکەوێ کە گوزارەکان کـۆ بکاتەوە و وەریان بگرێ ! .

ئەم قسەیە راستە تا ئەندازەیەك ؛ راسـتە کە جیهانی گوزارە زۆر بێ ؛ کارگەکان کەوتنە گـەڕ ، رۆژنامە زۆر بێ و کەوتە برەو ، رۆژهـەڵاتی و رۆژئاوایی وەکێ مێروولە پێکا ئاڵان ، ئادەمیزاد لە سەر زەوی‌یەوە باڵی گرتەوە بۆ ئاسمان و لە سەر مانگەوە نیشتەوە ، تەنك و چەڵەمەی مەردم بە هۆی زۆری‌یانەوە زۆر بـێ ، جەنـك زیاتر لە جاران پەیدا بێ ! . ئەمانە هەمـێ بـێن بە کەرەسـتە بۆ باسـکردن و بۆ لێ دوان ، ئادەمیزادەکە ئیتر فریای ئەوە ناکەوێ خۆی خەریك کا بۆ دۆزینەوەی وشەی بە توێـکڵ و پەیـدا کردنی خەیاڵاتی خەیاڵی و ترنجاندنی ئەو بیرانە لە ناو وشە بە توێکڵـەکانا ! . ئەمانە هەمێ راستن ، راستن تا ئەندازەیەك کە کەرەستە زۆر بێ بۆ قسە لێوە کردن ، بەڵام راسـت نییە بۆ ئەوە کە ئەبێ ئەو ئەدەبە

کلاسیکە ئیتر لاپەڕەکەی فڕێ بدرێ و بخرێتە گۆشەی لەبیرچوونەوە و گوێی نەدانەوە ،/چونکە ئەدەبی کوردی بەتایبەتی بناغەکەی لە سەر ئەو ئەدەبە کلاسیکە داڕژاوە ، ئەگەر ئەو ئەدەبە نەمێنێ و بڕۆخێنرێ ئەدەبە رۆمانتیکەکەی بەهیچ دەرئەچێ و بە بێ بناغە ئەمێنێتەوە/. بەتایبەتی لەسەر قسەی رۆمانتیکەکان کە ئەڵێن ئەدەبی کلاسیك لەبەر ئەوە کە هەر بۆ چینێك بووە، وە چینایەتیش بازاڕی بەسەر چووە ئەدەبەکەشی ئەبێ وەکوو خۆی لێ بەسەر بێ ! . ئەمە ئەڵێین بەڵام ئەگەر بچینە بنج و بناوانیەوە لە راستیدا وا نییە ، چونکە ئەدەبی چینێك ئەدەبەکە لە ئەدەب دەرناکا ؛ چینەکەشی هەر دەستەیەکە لە نەتەوەکە . هیچ ئەدەبیك نەوەك لە ناو کورددا بەڵکوو لە هەموو جیهاندا نییە کە هەموو چینێ بگرێتەوە لەم سەردەمەشدا زۆر ئەدەبی رۆمانتیك هەیە کە هەر یەك چین ئەگرێتەوە ، کەچی پێشی ئەڵێین ئەدەب . چەشنی قسە و بەڵگە ئەتوانرێ بکرێ بە بەڵگەی ئەدەبە کلاسیکەکەش . نەتەوە وەنەبێ هەموو زەردویدار ، وە یا چەوساوە بێ . ئەو ئەدەبەی کە چاری چەوساندنەوەکە ئەکا بەرانبەر بە چینی زەردویدار هیچ نرخێکی نییە چونکە ئەوی نەگرتۆتەوە، لەگەڵ ئەوەشا لە ئەدەب بوونی خۆی نەکەوتووە .

جا لەبەر رووناکی ئەم قسانە بۆمان دەرکەوت کە لە ناو ئەدەبی کوردیدا دوو جۆرە ئەدەب هەیە ؛ یەکێ ئەدەبێکی کۆن ، یەکێ

نوێی ؛ کۆنەکە ئەو هۆنراو و بەرهەمانەیە کە لە هۆنەرە کۆنەکانمانەوە بۆمان ماونەتەوە ، نوێیەکەش ئەم ئەدەبی تازەیەیە کە ئێستە هەیە .

ئەدەبە کۆنەکەمان بەرهەمی ئەو هۆنەرەمانن کە لە سەردەمەکانی پێشوودا بۆمانیان بەجێ هێشتوە و بۆیان کردوین بە ئازۆخەیەکی تێر و تەسەل بۆ ئیمڕۆی ئێمە . بەرهەمەکانی شێخ ئەحمەدی جزیری و نالی گەلێ داستانمان لە هێز و پێزی ئەدەبی کوردیدا بۆ ئەگێڕنەوە . ئەو ئەدەبەی ئەوان و ئەو ئەدەبەی کە لە هۆنەرانی هاوچەرخەکانیان و هۆنەرانی پاش ئەوانیش ماوەتەوە وەنەبێ هەر ئەدەبێك بێ کە تەنیا سەلیقەی ئەوانمان پێشان دەن ، بەڵکو چۆنیەتی ڕۆژەکانیان و چۆنیەتی کار و باری ڕۆژەکانیشیانمان هەر پیشـــان ئەدەن . بۆیە ئەمــە ئەڵێم چونکە پارچـــەیەکی با لە ڕواڵەتـــا ئێمە هــەر بــە ئەدەبی ڕوتی تێبگەین لەراستیدا مێژوی سەردەم و وارمان بۆ ئەگێڕنەوە . کەوابێ لە بەردەســت هێنانی ئەوانە ئاگاداری پەیدا کردنمان ئەبێ بە سەر هەمو چەشنە بیر و باوەڕێـکی ئـەو ڕۆژەدا . لەبەر ئەمــە چۆنە بنـج و بناوانی ئەو جۆرە ئەدەبە وەنەبێ هەروا شتێکی ســـانایی بێ ؛ ئەو جـۆرە داڕشـتنە کە ئەوان لەو ڕۆژەدا هۆنراوەکانیان پێ داڕشتووە بێگومان گـەلێ جیایە لە داڕشتنەکانی ئیمڕۆ ! .

بەوێنە ئەوان وشـەی عەرەبی‌یان لەگەڵ وشـــەی کوردیـــدا جۆش داوە و هۆنراویان پێ دروست کردوە ، بەڵام ئایا ئەو وشـــە عەرەبی‌یانە وە تەنانەت ئەو وشە کوردی‌یانەش کە ئەوان بەکاریان هێناوە و

ئەدەبەکەیان پێ دروست کردوە هەر ئەم وشە عەرەبی و کوردی‌یانەی ئیمڕۆژن یا شتێکی تر ؟! . . ئێمە کە سەیری رواڵەتەکانیان ئەکەین وا ئەزانین هەر لەو وشانەن کە ئێستە بەکاریان دێنین ، لەگەڵ ئەوەشا وا نییە !. هەر چەندە بە رواڵەت یەکن ، بەڵام لە راستیدا جیان ؛ جیان لە چەند رویەکەوە .

یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئەگەر ئەوانەی ئیمڕۆ بۆنایە ئێمە ئەمانزانین کەچی ناشیانزانین ! . نەزانینەکەمان بۆیان بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوان جیان و مەفاهیمی عیلمی ئەو موفرەداتانەی ئەو رۆژەی ئەوان غەیری مەفاهیمەکەی ئیمڕۆژە . لە ئیمڕۆژدا ـ کە عەرەبی‌زانیش ئێستە زۆرترە لەو رۆژە ـ کەچی وشەکانی ئەوان نازانێ ! . کە وا بۆ ئەو وشانەی ئەوان قسە لە عەرەبیەتەوە ئەکا نەك لە عەرەبی‌یەوە !! . هەر وەها وشە کوردییەکانیش کە ئەوان بەکاریان هێناوە هەرچەندە بە رواڵەت وشەکانی ئێستەشن بەڵام لە راستیدا جیان و مەفاهیمێکن کە ئیمڕۆژ ئێمە جۆرە مەفاهیمێکی تر لەو وشانە وەر ئەگرین . مەفاهیمەکانی ئەوان هەمو رەوانبێژی‌یە کەچی ئێمە ئیمرۆ رەوانبێژی‌مان خستۆتە ئەو لاوە و وا ئەزانین کە شتێکی زیادەیە . کە ئەڵێم بەلامانەوە زیادەیە بەلای بیر و باوەڕی ئەو کەسانەوە کە ئەدەب هەر وا بە شتێکی سادە دائەنێن ! . لەگەڵ ئەوەشا ئەو مەفکورەیە کە بەرانبەر بە ئەدەب ئەوان بەو جۆرە بە سادەی دائەنێن ئەتوانین بڵێین ئەوە لەراستیدا ئەدەبێکە لە پلەی پێنجەم و شەشەمی ئەدەبدایە

نەوەك لە پلەی یەکەمدا ! هەر وا بۆ وێنە شێخ ئەحمەدی جزیری ئەڵێ :

تعـــالی الله زهی حســـنا مبـــارك[1]
تبارك ســـەد تبارك ســـەد تبـــارك

مگـەر شـــیرین بڤی شـــیرانیێ بـــو
ألا شمـــس الملاحـــة قـــد تشـــارك

ژغنجـین غونچەیـــا وی گـــولعزاری
دهـــەر غونچه د دڵـدا مایـــه خارك

لتـــای عـرعـری مەســـتانه نـــازك
ژ لونی عەنبـەری مخمـــۆر بـــارك

لتەخـــتی دلبـــەری رۆنی بشـــاهی
لتـــه شـــاهی مبـارك بت مبـــارك

دبیـژم تـــا بحـــالی من بزانی
ژبـــەر حبا تـه بی حـــالم بجـــارك

ژدیـــدارا مرادا من ببخشـــی
مرادا من ژتـــه دیـداره جـــارك

ددلـــدا یێ‌و دیســـا دل دصـوژی
« اتحرق یا ملیك الحسن دارك ؟! . »

---

(١) زیاتر ئەم پارچەیە لە شێوەی نۆسینەوەیا شێوەی گۆن گیرا .

تە جەرگی من ژ دل کر پارە پارە
« فجارك یا بدیع الحسن جارك »
عذاری گەر لمن دی تو لدلدە
« لان القلب قد یهوی عذارك ! »

وەرە خانم بکوژ بەستو بخنجر
ملا اما بدستی خوە مبارك ! .

وەیا « نالی » ئەڵێ :
دڵ سیە سەنگ نەبێ مائلی خاکی وەتەنە
خاڵی لەعلی حەبەشە ساکنی بوردی یەمەنە

بەرچەمی سونبولی و قەدی « قضیب البانی »
زوڵفی بەهلوڵی و خەت زەنگی و وەجهی حەسەنە

تەلعەتی مەزهەری جان ، مەنتیقی ئیعجازی بەیان
لەب و روح و دەهەنی سڕو کەلامی عەلەنە ! .

دەس لە خوێنم مەدە ئالوودە مەکە دامەنی پاك
خوێنی من سابتە باتل نییە وەك رەنگی خەنە

وەکوو گوڵ ئاتەشی خەملیوە بە بەرگی چەمەنی
قامەتی نارە بەرە ، نارەوەرە ، نارەوەنە ! .

رەوشەنی دیدە بە ئینسانە کە مژدەی قەدەمت
رەوشەنی دیدەی غەمدیدەی « بیت الحزنە ! . »

دڵی « ناڵی » کە ئەنیسی قەرەداغە ئێستەیش
داخی « سەرچاوە » و « دێوانە »ی دار و دەوەنە !.

تەماشا ئەکەین ئەم دوو جۆرە ئەدەبە کە دوو شێوەی لە ئەدەبی کوردی گرتۆتەوە و بە ئەدەبی کلاسیك دائەنرێن وە لە راستیشدا ئەدەبی کلاسیکی کوردین گەلێ جیان لەو ئەدەبە کە ئیمڕۆژ هەیە و هۆنەران و ئەدیبەکانی کورد لە سەری ئەڕۆن .[یەکێ لە جیاییەکە ئەوەیە کە لەو رۆژەدا ئەو هۆنەرانە کە مەشخەڵی ئەدەبەکەیان بە دەستەوە بووە هێناویانە وشەی غەیری زمانەکەی خۆیان تێکڵاو بە زمانەکە کردوە و لە بۆتەیەکی بتەودا دایانڕشتووە ؛ بە جۆرێك دایانڕشتووە کە ئەو وشە بێگانانەش هەر بوون بە ماڵی زمانی کوردی]و لە مەفکورەیەکی کوردییەوە هەڵقوڵاون ، بەم ئیشەیان بۆ ئەو رۆژە زمانەکەیان دەوڵەمەند کردوە .[یەکێکی تر لە جیاییەکەی ئەوەیە ئەو چەمکانە کە بۆ ئەو رۆژە لە موفرەداتی کوردی و عەرەبیەکەدا هەبوون ئیمڕۆ زانینی ئەو چەمکانە زۆر بە گرانی ئەزانرێن] . جگە لەمانەش ئەوەمان بۆ دەر ئەخەن کە ئەدەبی کوردی بە پێی رۆژ و چەرخ لە گۆڕانا بووە و لەگەڵ زەمانەکەدا هاتۆتە خوارەوە ، کارەساتی ناهەمواری رۆزگار نەیتوانیوە ئەوەندە کار بکاتە ئەم بە ئەندازەی ئەو کارە کە کردویەتە زمانەکانی تر .

جا لەبەر ئەمانە نابێ ئێمە لە سەر ئەو باوەڕە بین کە ئەدەبی پێشوی ئەدەبی کوردی ئەدەبێکی وشکی وا بووە کە دەسەڵاتی بڵاو ـ

بۆنەوە و پەلهاویشتنی نەبوە ، بەلی هاویشتووە خۆی چەسپاندووە ، خۆی پیشان داوە . ئەگەر لە رۆژێکی وەکو ئیمڕۆژدا ئەو جۆرە ئەدەبانە نەزانرێن سۆج ناچێتە ئەستۆی ئەدەبەکە بەڵکو سۆج ئەچێتە ئەستۆی ئەدیبەکانی کورد کە خۆیان لەگەڵ ئەوانەدا بۆ لێکۆڵینەوە خەریك نەکردوە وەیا ناکەن ! . دیارە شتێك کە خەریك بونی لەگەلا نەبێ وا ئەچێتە دڵەوە کە ئەو شتە وشك و بێقلەتە .

لەم رووەوە ئەگەر ئیمە بەراوردی خۆمان لەگەڵ نەتەوەکانی ترا بکەین ئەتوانم بڵێم ئیمە زۆر دواکەوتوین ؛ چونکە نەتەوەکانی تر ئەدەبە کلاسیکەکەیان جێگای شانازییانە و وەکو پەیوولە هەمو دەم بە خامە و بە نامە و بە زمان بە دەوریا هەڵئەسوڕێن ، وە بە راستی لایان وایە ئەگەر ئەو ئەدەبە کۆنەیان نەبوایە نەدەگەیشتن بەم ئەدەبە تازەیانە . لەگەڵ ئەوەدا من لام وایە ئەدەبی کۆنی کوردی لە باری ئەدەبییەوە گەلێ دەسەلاتدارترە لە ئەدەبەکانی ئەوان .

ئەدەبی مەعنا لە ئەدەبی کوردیدا بەرزە . راستە ئەدەبی مەعنا لە ئەدەبێکی ـ بەوێنە ـ وەکو ئەدەبی فارسیدا ئەویش زۆر بەرزە بەلام زیادە بەرزییەك کە لە ئەدەبی کۆنی کوردیدا هەیە لە لایەن مەعانی خەیالاتەوە جگە لەوە کە لە خەیالاتی ئەوانیشی گرتۆتەوە خەیالاتی ناوچەکەی خۆیشی گرتۆتەوە . ئەمە لەوانا نابینرێ ، چونکە ئەدەبەکەی ئەوان هەر لە ناوچەی خەیالاتەکەی خۆیانان .

ئینکاری بەرزی ئەدەبی فارسی ناکرێ وەکو ئینکاری عەرەبیش ناکرێ ، بەڵام جیاییەکی زۆر هەیە لە نێوانی ئەدەبی کوردی و ئەدەبی عەرەبی و فارسیدا ؛ ئەدەبی فارسی لە پاشماوەی ئیمپراتۆریەتێکی بەرز بو ، کە ئەو ئیمپراتۆریەتە ئەما ماوەیەك سیس بو بەلام لە ئەنجاما بۆژایەوە و شیر و قەڵەمی کەوتە دەست . ئەدەبی عەرەبی جگە لەوە کە زمانەکەی زمانێکی پاراوە بە درێژی گەلێ سەدە گەلێ نەتەوە خزمەتێکی بێپایانی کرد ؛ لە لایەن مەعناوە گەلێ خەیاڵات هێنرا و لە قاڵبی ئەو زمانەدا دارێژرا ، ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی بە هەمو جۆر لە لاپەڕەکانی مێژوویا هانەهانەی ئەو ئەدەبەی ئەدا . ئەدەبی کوردی کێ هانەهانەی بدا ! . کێ بە تەنگیەوە بێ ؟ . کێ بوبێت نەیهێشتبێ لە ناو بچێت ؟ . ئەمانەی هیچ نەبووە ؛ حوکمی نەبووە ، مەیدانی بازرگانیەکی فراوانی نەبووە ، نەفسی ئەدەبەکە ئاینێکی نەبووە تا بیپارێزێ . جگە لەمە وەکو ئەمانەی نەبووە هەمو دەمیش کۆششی ئەوەی بۆ کراوە کە بیری ئەدیبەکانیان نەچێت بەلای خۆیانا ، وەیا بلێین فیکریان کوشێنراوە بۆ ئەوە ئاوڕ لە خۆیان نەدەنەوە ! . لە گەڵ ئەم هەمو تەنگ و چەڵەمە و کۆسپانەشا ئەم ئەدەبە وەکو یەکێکی « عصامی » هەر خۆی پێگەیاندوە و چەرخ بە چەرخ کەلەپوری بەجێ هێشتووە . کە وا بو لەم رووەوە و لەم سوچەوە ئەتوانم بلێم لە چاو خۆیا ئەم لەوان بەرزترە ؛ چونکە لەوانیشی وەرگرتوە و خۆیشی هەیبوە .

جا لەبەر ئەمە پێویستە لە سەر ئەدیب و هۆنەرانی کورد هی ئێستە و

هی لەمەودواش بەچاوێکی بەرێزەوە سەیری ئەدەبە کۆنەکەیان بکەن و کۆشش بکەن بۆ بوژاندنەوە و بەخێوکردنی ئەو ئەدەبەیان کە بنچینەیەکی بەهێزە بۆمان بۆ بونمان . بەڵکو بەلای منەوە وایە کە قوتابخانە و خوێندنگای بەرز دانرێ بۆ دراسەی ئەو جۆرە ئەدەبەمان ، بەم ئیشەمان ئەتوانین ئەوەی پێشو زیندوَ بکەینەوە و لە بەلای لەناوچون رزگاری بکەین ، وە هەم ئەدەبە تازەکەشمانی پێ پتەو بکەینەوە . لەگەڵ شتا وا دیارە ئێمە چاو لە خەڵك ئەکەین با لەم رووەشەوە وەکو ئەوان چۆن ئەدەبی کۆنی خۆیانیان زیندوَ کردۆتەوە ئێمەش زیندوَی بکەینەوە . وە ئەبێ ئەوەش لە دڵ فرێ دەین کە گوایە هەر کەسە ئێستە هەر شێوەیەك لە شێوەکانی ئێستەی زمانی کوردی بزانێ ئەدەبی کوردی ئەو شێوەیە ئەزانێ ! . ئەبێ ئەمە لە دڵ فرێدەین چونکە :

ئەو ئەدەبە کۆنە گەلێ جیایە لەگەڵ قسەکردنی ئەو شێوەیەی ئێستە و لەگەڵ ئەدەبی ئێستەدا !! .

بەڵێ ! . هەیە لە ناومانا کە لە شێوەی قسەکردن و ئاخاوتنی ئێستە ئاگادارە و قسەی پێ ئەکا بەڵام ئەمە ئەوە نادا بە دەستەوە کە لە ئەدەبە کۆنەکە ئاگادارە چونکە مەفاهیمەکەی بۆ دەرناکەوێ . هەیە شێوەی بادینی وەیا کرمانجی زۆرو ئەزانێ ، هەورامی ئەزانێ ، موکری ئەزانێ - با ئەو کەسە خوێندەوار و رۆشنبیریش بێ - بەڵام بەرهەمی شێخ ئەحمەدی جزیری و مەولەوی و نالی نازانێ ! . زانینی ئەوانە دراسەی ئەوێ ، هەر شێوەکە نییە

کە بیزانێ . مەسەلەیەکی کوردیێ هەیە ئەڵێ : « هەر کە ریشی سوور بێ هەمزاغا نییە » ! . . دراسە کردن جیایە شێوە زانین جیایە . ئەو بەرهەمی ئەدیب و هونەرانی پێشوو لە ئاسۆیەکی ترەوە هەستاوە ئەمانە ئیمڕۆ لە ئاسۆیەکی ترەوە . نە ئاوێنەی بیر و باوەڕی ئەو سەردەمە هی ئێستەیە ، نەهی ئێستەش هی ئەو سەردەمە .

* * * * * *

# الأدب الكردى

العضو العامل : علاء الدين سجادي

قبل البدأ في الموضوع ـ اى الأدب الكردي ـ قال علماء الادب :
الأدب عبارة عمّا أثر عن كتاب اللغه و شعرائها من الاقوال البديعة المشتملة على تصوير الأخيلة الدقيقة ودرك المعانى الرقيقة التى تهذب النفس وترقق الحس وتثقف اللسان . كما انه يطلق على كل ما صنف ودون في اية لغة من البحوث العلمية والفنون الادبية . فأذن يشمل الادب كل ما انتجته خواطر العلماء وقرائح الشعراء والكتاب وايادي المهرة وتفكير الصناع والعاملين فى حقل الاعمال اليدوية المبدعة . وهو ـ اى الأدب يتطور فى صوره كما تطور المجتمع في اوضاعه ، فعلى هذا المقياس ليس الادب سوى ظاهرة اجتماعية تنشئها العوامل الطبيعية التى تنتج كل الظواهر الاجتماعية الاخرى . وهو كاي علم آخر جوهرة مشعة كاشمة الشمس لاتمنع عن اية ملة أو اي فرد الا ان امة من الامم اذا عرض امامها عارض تكون محرومة من تلك الجوهرة فاذا ازيل العارض ورفع الحاجز تستقبلها كاية امة اخرى .
هذا موقف الادب بصورة عامة لكل امة . واما بالنسبة الى الامة الكردية فلها شأن خاص في ادوارها التاريخية ومراحلها التطورية .

ان الشعب الكردي شعب قائم بذاته ومنذ فجر تأريخه ، صمد امام هجمات الدهر وقاوم كل نكبات الزمن ، حافظ على نفسه وشخصيته في احقاب التأريخ الى اليوم ، كما انه صاحب لغة قائمة هى في حد ذاتها من حيث الجذور والاصوات ، فلغته ليست من اللغات التى انقرضت ، فاذا كانت منها فما هى اللغة التى يتكلم بها ابناؤها !! . فأذن هى ثابته وقائمة كقيام اللغات الاخرى . فاذا ثبت الحكم بوجودها لابد ان نحكم بوجود ادبها ايضا لان الادب صنو للغة القوم . فالأمم التى هيأ الزمن الظروف لها لخدمة ادبها نالت ما ارادت ولكن الشعب الكردي لم يستطع للعوامل الزمنية ان يخطو بامانيه ويوفق الى خدمة ادبه كغيره لنفس الغاية ، الا ان عدم امكانيته لتنمية أدبه لايدل على عدم وجود ذلك الادب ؛ لانه كما قلنا صنو للامة يتطور بتطور صاحبه صعودا ونزولا .

ان هجمات الاسكندر المقدونى امحت اكثر العلوم والاداب التى كانت قائمة في البلاد التى تعرضت الى الحملات ، ففى ضمنها الادب الكردي الذي كان جزء من الاداب الآرية التي تبرهن عليها نصوص آفستا الباقي قسم منها فى المكتبات العالمية ، فاما بعد ظهور الاسلام فقد انشغل الشرق الاسلامى آنذاك بتثبيت الدين فلم يبق مجال للامم الطائعة للدين الا صرف الجهود لبث الروح الديني ونبذ الآراء التى كانت قائمة قبل ذلك التأريخ . فبعدما وطد الدين الحنيف اركانه فى البلاد فسحت الطبيعة المجال لالتفاف الامم حول احياء تراثها الادبى والعلمي ، ففي خضم ذلك العصر الذهبي ظهر المغول فجرفوا كل رطب ويابس فكانما عاهدوا معاهدة صادقة مع الجهل ومع امحاء كل التراث الذي يتعلق بالعلوم والفنون والآداب ! . شاء القدر ان ترى البلاد الاسلامية

والمكتبات الزاخرة بالعلم والادب الاضمحلال والفناء والتأخر من كافة الجهات . فطوى الزمن أذياله ورمى القدر سهامه فتنفست البلاد وقامت من نومها العميق فشمر العلماء والكتاب والادباء عن الساعد مرة اخرى لاحياء التراث وايجاد خلق جديد في هذا المضمار فخدموا العلوم والفنون مرة ثالثة فازدهر الادب والفن بالنسبة الى الاقوام الخاضعة والطائعة للدين الاسلامى كل حسب طاقاته و ظروفه المحيطة به .

فالشعب الكردى بسبب الاوضاع الشاذة التى كانت موجودة فى اطرافه واكنافه غارق فى سباته بالنسبة الى احياء ادبه وابراز شخصيته الادبية حيث انه انهمك بالمسائل العلميه الاخرى وخاض في ميادين العلوم العربية والفارسية التى كانت قائمة فى محيطه ؛ الاولى من الناحية الدينية والثانية من الناحية الادبية والسلطة الزمنية ، فمع وجود هذه العوامل الملتوية ظهر منهم افذاذ قليلون كانوا يعتنون بادب اللغة من بداية القرن العاشر الميلادى الى القرن الخامس عشر فمنذ هذا التأريخ برز الادب الكردى ادب اللغة وادب المعنى - بروزا رائعا بصورة متسلسلة مع تسلسل القرون وغير منقطعة الى اليوم . فكلما خطا الزمن الى الامام شاطره الادب جنبا الى جنب . ففى ضمن تلك المشاطرة اتجه الى قسمين : الى الادب الكلاسيكي والادب الرومانتيكى . فيعد عصره الكلاسيكى من بداية القرن الخامس عشر الى بدايه القرن العشرين ، فمن بداية القرن العشرين ظهر الادب الرومانتيكى رويدا فرويدا .

اما عصوره الكلاسيكية فعصور ذهبية بالنسبة اليه ؛ ذهبية لا فقط بالنسبة الى اللغة بل الى اللغة والمعنى ايضا ، فاما بالنسبة الى اللغة

فانه احتوى على نقاوة مفردات اللغة الكردية النابعة والمفسرة للاخيلة التى تتبرج حول مناظر خلابة واساطير رائعة تزهو وتدور فى سماء كردستان . واما بالنسبة الى المعانى الزائدة عن المعانى المتدفقة في المحيط فهي ان ادباء وشعراء تلك العصور بحكم طبيعة الجوار كانوا يتشوقون الى فهم آداب الامم الاخرى وبالاخص العلوم العربية والادب الفارسى فيأخذون منهما المعانى السامية والاخيلة الرقيقة فيصبونها فى العبارات الكردية ، فهذه ثروة زائدة عن ثرواتهم حيث اغنوا بها ادبهم كما انهم وسعوا آفاق مواهبهم بها .

هذا من جهة ومن جهة اخري فان مفردات الكلمات غير الكردية الواردة في نتاجهم الادبى عدا انها تتبدل مفاهيمها بتبدل الزمن فان صياغتها في ثنايا العبارة او الاشعار الكردية صياغة كانها كردية من حيث اللغة يتفهمها كل من عاصر الاديب او الشاعر في حينه . واما بعد عصره فلربما انها بعيدة عن فهم قارئها او سامعها ولا يأخذ المطلوب منها . فسبب هذا الغموض لا يرجع الى ظواهر الكلمات بل يرجع الى تطور وتبدل مفاهيمها التى تغيرت بواسطة تغير الزمن السابق وهكذا شأن الكلمات الكردية البحتة ايضا تتبدل مفاهيمها بتبدل الزمن .

فالكلمات الوارده في اشعار الشيخ احمد الجزيرى - على سبيل المثال - سواء كانت هى كردية ام عربية انما هى نفس الكلمات التى يستعملها الجيل الحاضر من حيث الظواهر غير ان الجيل بعيد عن تقبلها فيتهمها بالكلاسيكية البالية البائدة ! . فما السر في هذا ؟ . السر هو تطور وتبدل مفاهيم الكلمات حسب تطور الزمن والجيل غير دارس لتلك المفاهيم اذ يقارن بين الكلمات والمفاهيم

بمقياس زمنه الحاضر فيرى انه لا يوجد التطابق بينهما فيحكم بالغموض اوعدم الانسجام ! لاشك ان هذه المقارنة ليست مقارنة سليمة ولا منصفة لوجوه : منها انه اذا طبقت الكلمات الدارجة في العصر الذى مضى على المفاهيم الحاضرة لتلك الكلمات يزول التدرج في عالم الوجود ولا تبقى معالم علم النقد بالنسبة الى الادب . ومنها انه لا تبقى الحيوية ايضا لا للكلمات ولا للمعانى في حين ان الكلمات بمعانيها وبالاخص الظواهر الادبية تعد من الكائنات الحية ، فحيويتها عبارة عن تلك التطورات التى تطرأ عليها .

على ضوء هذه المعلومات فاذا كان شـخص يتقن اللهجة الهورامية او المكرية او البادينية في وقتنا الحاضر فانه لا يشترط فيه او لا يطلب منه ان يلم بمفاهيم اشعار المولوى او الجزيرى او نالى ؛ وانما لا يشـترط منه هذا لأن الالمام بمفاهيم اشعار هؤلاء الشعراء منوط بالدراسات العميقة و بالخوض في اعماق مفاهيمها وليس بمجرد معرفة اللهجة الكلامية لان اللهجة الكلامية او الدارجة معرضة للتبدل امام سرعة التطور ، نعم انها ولو كانت لغة الامثال والاساطير الزمنية ولكنها ليست لغة العلم والحكم .

فامام هذه الآفاق الكلاسيكية من النـاحية الادبيـة ظهر الأدب الرومانتيكى منذ عهد قريب ، مستندة هذه المدرسة الى ان متطلبـات الزمن من وفرة المعامل وكثرة وسائط النقل التى ربطت الشـرق بالغـرب ومن طي الطرق النائية بين انسان وانسان آخر بدرجة انه لم يرض بطي الأرض بل مـد

يده الى سطح القمر ! . كل هذه العوامل هيأت آفاقا غير متناهية ومادة واسعة الاطراف جدا لانشغال الانسان بها و البحث عن اطرافها ، فلم يبق المجال له لالهاء تفكيره بانتقاء الكلمات الرنانة وحشوها بالمعانى المرموزة التى لاتتحمل الكلمة عبئها بها . فاذن لابد من حصر الافكار للم تلك المعانى المترامية الاطراف التى اوجدها الزمن ودرجها في الكلمات مهما تكن ظواهرها بديعة او غير بديعة .

هذا رأي المدرسة الرومانتيكية بالنسبة الى الالفاظ امام المدرسة الكلاسيكية .

هذا الرأي له وجاهة الى حد ما من وجود المادة للمعانى و كثرتها الكثيرة . فاما من الناحية الأخرى فلابد ان نعترف ونقر بأن اساس تلك المادة الرومانتيكية هى الكلاسيكية ، فهي التى تبنى عليها الأبراج وتكون اساسا محكما لبناء هيا كل الرومانتيكية فاذا تركت الكلاسيكية وشأنها لم تبق ايضا حساسية الجوهرة في الرومانتيكية في الادب او في غير الادب . واخص بالذكر العالم الادبي اذ الكلمات المستعملة في معانيها في عصر من العصور كانت مركز اشعاع في حينها ومحطة انظار لكل متطلع الى الأدب والفن ، فاذا نبذناها او أهملناها تكون النتيجة حرماننا من تلك الكنوز وضياعنا تراثا ذا شأن عظيم في حق ادبنا وآراء أمجادنا وأخيلة أدبائنا الأفذاذ الذين ترقد اجسادهم تحت الرمس ولكن افكارهم تحلق في السماء .

فأذن لابد لنا ولأدبائنا ان ننظر الى تراثنا الكلاسيكي نظرة احترام وتقدير وان ندرسه في الجامعات ونتعمق في مراميه واغراضه . لاشك ان هذا التعمق العلمي لن يتحقق الا بصرف الجهود وتحمل المشاق والعكوف على التدريس والثبات على جهد الطاقة الفكرية لاستحصاله ، فبعملنا هذا نشد ايضا ازر ادبنا الجديد ونساعد على توسيعه اكثر مما يقال في حقه .

* * * * * *

# ئی. ئا. ئۆربیلی و کوردناسی

ئەندامی کارا : پرۆفیسۆر قەناتی کوردۆ

کۆڕین و لێدوانی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف

/ ئەکادێمی یوسف ئابگارۆڤیچ ئۆربیلی لە لێکۆڵینەوەی زمان و کولتوری میللەتی کورددا دەورێکی تایبەتی بوە و هەر ئەم زانایەش بناغەی کوردناسی لە یەکێتی سۆڤیێتدا داناوە/و هەر ئەویش بوە کە مەرکەزی لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەب و مێژو و کولتوری کوردی لە لێنینگراد دامەزراندوە.

کاتێ لە نێوان کۆڕە زانستێکانی ئەرمەنستانی سۆڤیێتدا لە بارەی پەیوەندی کورد و ئەرمەنەوە قسە دێتە کۆڕێ، بێ گومان ناوی هەندێ رۆڵەی ئەرمەن یادداشت دەکرێت، [وەك : خ. ئابۆڤیان ـ کە بۆ یەکەم جار لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە نوسیویتی[1] ؛

---

(۱) خ. ئابۆڤیان ، کورد ، رۆژنامەی « قەفقاس » ، ژ ٤٦ ، ٤٧ ، ٤٩ ، ٥٠ ، ٥١ ، تفلیس ١٨٤٨ (نوسەر) . سالی ١٨٤٧ لەسەر لاپەڕەکانی رۆژنامەی « قەفقاس » ، کە لە تفلیس دەردەچو=

ی. ل. لالایان ـ کە لە یادداشتنامەی گەڕانەکانیدا گەلێك نموونەی جوانی لە بارەی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری کوردەکانی ئەرمەنستانی تورکیاوە هێنـــاوەتەوە[2] ؛ پرۆفیســـۆر س ئـا. یەگیزارۆف ـ کە کتێبی « مێژوویەکی ئەتنۆگرافی کورتی کوردی موحافەزەی یەریڤـان »ی بلاو کردۆتەوە[3] ؛ ئاکۆپۆف کازاریان ( لازۆ ) ـ کە یەکەم کتێبی بە زمانی

= زنجیرەیەك وتاری خ. ئابۆڤیان لە ژێر ناوی « کورد »دا بلاوکرایەوە. لەم وتارانەدا گەلێ شتی بەکەلك و نوێ لە بارەی ئەتنۆگرافیا و مێژوو و ژیانی کۆمەلایەتی و رەوشت و نەریت و فۆلکلۆر و زمانی میللەتی کورد بەرچاو دەکەوێ. هەرچەندە ئەم زنجیرە وتارەی خ. ئابۆڤیان دەوروبەری ( ٣٠ ) لاپەڕەیەك دەبێت ، بەلام لەگـەلێ ئەوەشدا کارێـکی زانستی و وردە و بۆ یەکەم جارە لە مێژووی کوردناسی رووســدا دەربارەی ئەتنۆگرافیای کورد بەو شێوە فراوانە نووســرابێ . ئەم نووسراوەی خ. ئابۆڤیان لە بارەی زمانەوانییەوە کاری کردە سەر بیر و رای زانایانی رووس ـ پ. لێرخ ، ف. یوستی ، س. یەگیزارۆف ... لە سەلماندنی ئەوەی کە زمانی کوردی زمانێـکی ئێرانییــە و لە خێزانی هینــد و ئەورووپاییە . نووسەر لە وتــارەکەیدا گرنگییەکی زۆری بە فۆلـکلۆری کوردی داوە و گـەلێك بیر و رای جوانی دەربڕیوە . ( وەرگێڕ ) .

(٢) بڕوانە : رۆژنامەی « ئازگـاگراکان ئاندیس » ( بە زمانی ئەرمەنی . ( نووسەر ) .

(٣) بڕوانە : راپۆرتەکانی بەشی قەفقاسی کـۆمەلی جوگرافی ئیمپراتۆریی رووسی ، تفلیس ١٨٩١ ، ب ١٣ ، ژ ٢ . ( نووسەر ) . ســالی ١٨٩١ س. ئا. یەگیزارۆف کتێبێـکی لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە=

کوردی بۆ قوتابخانە کوردییەکانی ئەرمەنستان داناوە ؛ ئی. ئا. ئۆربیلی کە دامەزرێنەری مەدرەسەی کوردناسی سۆڤیێتە/.

بەراستی بۆ گەلی ئەرمەن جێگای شانازییە کە رۆڵەکانی لــە پێشخستنی کولتوری میللەتاندا دەوریان بینیوە ، وە بەش بەحاڵی گەلی کوردیش ئەوەیە کە رێزێکی زۆری ئەو زانایانە دەگرێ و لــە ناخی دڵیەوە سوپاسیان دەکا و ناویان لە رێزی پێشــەوە دادەنێ و بەرانبەر بەو هاریکاری و هاوبەشی‌یەی کە وەك زانا و تێکۆشەر لە خزمەت کردنی کولتوری کورد و پتەوکردن و چەسپاندنی دۆستایەتی ئەرمەن و کورددا کردوویانە هەرگیز لە بیریان ناکات . ئاشــکرا و روونە کە هاوسێتی و دۆستایەتی نێوان ئەرمەن و کورد هاوسێتی و دۆستایەتی‌یێکی کەوناراى لە مێژینەیە و مێژووی ئەم دوو گەلە لــە زۆر ســەرەوە لە یەك دەچن ، هەردوکیان زۆرلێکراو و چەوساوەی سوڵتانەکانی عوسمانی و شــاکانی ئێران بوون ، بەڵام بەداخەوە

= بلاوکردەوە . ئەم زانــایە ســوودی لە نوسراوەکانی خ. ئابۆڤیان و پ. لێرخ و هەروەها ئەو کەرەستە زۆرەی کە خۆی لە ماوەی دوانزە ساڵدا لە ئەنجامی ژیانــدا لە نــاو کوردەواریدا کــۆی کــردۆتەوە وەرگرتوە . نوسەر سەبارەت بە ژیانی کــۆمەلایەتی و رەوشت و شین و شایی و ئایین و بیر و باوەڕ . . . ی گــەلی کورد دواوە . جگە لەوە لەم کتێبەدا بە هاوکاری ل. پ. زاگورێتسکی لە هەندێ مەســەلەی گرنگی رێزمانی کوردی کــۆلیوەتەوە و وەك پاشکۆش دوو فەرهەنگیان داناوە : کوردی ــ رووسی ، وە رووسی ــ کوردی . ( وەرگێڕ ) .

زۆردارانی تورك چمکێکی ئەو دۆستایەتی‌یەیان بەوە تێك دا کە بە ناوی دینەوە.کوردە موسڵمانەکانیان بەگژ ئەرمەنەکاندا دا و کردیانن بە دوژمنی دۆستەکانیان و ئەمەش تارادەیەك بۆ بە هۆی لاوازبوونی خەباتی کورد و ئەرمەن دژی جەور و ستەمی سوڵتانەکانی تورك . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەو دوو گەلە (ئەرمەن و کورد ـ وەرگێڕ) لەسیاسەتی دوژمنانیان گەیشتن و دۆستایەتی‌یە لە مێژینەکەی خۆیان نەدۆڕان . بێ‌گومان خۆ بە مەسەلەی کوردناسی‌یەوە خەریك کردنی زانایانی ئەرمەن (خ. ئابۆفیان ، ی. لالایان ، س. یەگیزارۆف ، ئی. ئا. ئۆربیلی..) بەڵگەیەکی دیار و ئاشکرایە. ئەکادیمیەی زانستی لە ساڵانی ١٩١١ ـ ١٩١٣دا ئی. ئا. ئۆربیلی بۆ ناوچەی مۆکس (ئەرمەنستانی تورکیا) نارد فێری لێکۆڵینەوەی شێوەی مۆکس بێت لە زمانی ئەرمەنیدا . ئەم زانایە کە تا ئەو سەردەمەش تەنیا هەر بە کاری ئەرمەنناسییەوە خەریك بۆ لە سەر راوێژی ن. یا. مارر کەوتە سەرنجدان لە زمانی کوردی ئەو کوردانەی کە لە ناوچەی مۆکس لەگەڵ ئەرمەنەکاندا دەژیان .

ئی. ئا. ئۆربیلی لەو ناوچەیەدا هەندێ تێکستی کوردی تۆمار کرد، فەرهەنگێکی کوردی ـ رووسی دانا، کە پانزە فۆرمەیە و وەك پاشکۆش چۆنێتی گەردانی کار (تصریف الفعل)ی نیشان داوە. بەداخەوە شەڕی جیهانی و شەڕی ناوخۆ بوون بە هۆی ئەوەی ئەم کارانەی ئەو زانایە پشت گوێ بخرێن و لە چاپ نەدرێن .

/ ئی. ئا. ئۆربیلی لە ساڵی ١٩١٤ەوە تا ١٩٣٥ لە زانکۆی پیتربورگ - لێنینگرادا دەرسی زمانی کوردیی دەوتەوە /

دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن ئی. ئا. ئۆربیلی هەرچەندە زۆر بە کاروباری کارگێڕیی و کۆمەڵایەتی‌یەوە خەریك بوو ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە وتنەوەی دەرس و لێکۆڵینەوەی فۆلکلۆر و زمانی کوردیدا درێغیی نەکرد [ساڵی ١٩٢٧ گەشتێکی بە ناوچە کوردیەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێتدا کرد و هەندێ تێکستی فۆلکلۆری کوردیی ، وەك « مەم و زین » و « لەیل و مەجنون »ی تۆمارکرد.]

لە دەستنووسەکانی ئی. ئا. ئۆربیلیدا فایلێك بە ناوی « کەرەستە بۆ لێکۆڵینەوەی شێوەی ئەرمەنیی و کوردیی مۆکس »ەوە هەیە .

جا بەشێك لە دەستنووسی ئەو فایلە لەژێر ناوی « فەرهەنگی کوردیی - ڕوسیی لەسەر بناخەی ئەو کەرەستەیەی ساڵی ١٩١٢ لە مۆکس کۆکراوەتەوە » بەرچاو دەکەوێ [ ئەم فەرهەنگە بە ئەلف و بێی ڕوسیی نووسراوە]. بە پێی ئەو باسەی ن یا. مارر لە کۆبوونەوەی ئەنجومەنی زانایانی مۆزەخانەی ئاسیادا لە تشرینی دوەمی ١٩١٢دا کردوویەتی وا دەردەکەوێ کە فەرهەنگەکە ئەو دەمە بۆ لە چاپ دان ئامادە کراوە. ن یا مارر بەو بۆنەیەوە وتی : ئی. ئا. ئۆربیلی فەرهەنگێکی کوردیی (شێوەی مۆکس) - ڕوسیی داناوە و داوای پێداچوونەوە و لە چاپ

دانی کردوە[٤] .

ئی . ئا . ئۆربیلی ئەو ماوەیەی کە لە ناوچەی مۆکس بوو ، زۆر بەگەرمی خەریکی فێربوون و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بوو . هەر سەبارەت بەمە نووسیوێتی دەڵێ : « بە یارمەتی چەند کەسێك دەستم بە فێربوونی زمانی کوردی کرد . بەراستی ئەوەی پتر لە هەموویان سوودم لێ وەرگرتبێ عەلی ئاغای کوڕی یوسف ئاغای خەڵکی دەربەندی دالان بوو . عەلی ئاغا زمانی ئەرمەنی (شێوەی ئەوناوچەیە )ی زۆر باش دەزانی و هەر ئەمەش بوو یارمەتی ئەوەی داین کە لە وتوویێژ و ئاخاوتندا ئاتاجمان بە وەرگێڕ نەبێت . . . بەم جۆرە وشەی کوردیم لە زاری کورد وەرگرتووە و کورد بۆی دەرکاندوم ، نەك لە زاری ئەرمەنێکی کوردی زان . جارێ بەو رەنگە هەموو وشەکانی ئەو فەرهەنگە ئەرمەنییەی خۆم دام نابوو وەرمانگێڕایە سەر زمانی کوردی . دوایی فەرهەنگەکەی ژابا و یوستی ، وە فەرهەنگەکەی یەگیزارۆڤیشمان کرد بە کوردی . . . »[٥]

ئەوەی لە فەرهەنگەکەی ئی. ئا. ئۆربیلیدا پتر لە هەموو شتێك گرنگتر بێت ، ئەوەیە کە کەلێك لەو وشانەی تێدایە کە پەیوەندییان بە کولتوور و کشت و کاڵی کوردی ناوچەی (مۆکس)ەوە هەیە ـ ئەو ناوچەیەی کە شێوەکەی سەر بە دیالێکتی سەروی رۆژئاوای (کرمانجی

(٤) بڕوانە : دەنگوباسی ئەکادیمیەی زانستی ئیمپراتۆریی رووسی ، ب ٦ ، ١٩١٥ ، ل ٤٩٧ . (نووسەر) .

(٥) بڕوانە : ئەرشیفی ئی. ئا. ئۆربیلی ، ز ٥٦ . (نووسەر) .

ژۆرۆ ) زمانی کوردییە). ئەو شێوەیە لە ڕوی موفرەدات و تایبەتێتی ڕێزمانەوە لە کرمانجی ناوچەی حەکاری‌یەوە نزیکترە .

ئەم فەرهەنگەی ئی. ئا. ئۆربیلی لە نێوان ئەو فەرهەنگانەی کە ڕۆژهەڵاتناسەکان لە سەرەتای ســـەدەی بیستەمدا دایانناون کارێکی بەرز و نایابە . ئەم فەرهەنگە وشەکانی بە گوێرەی زنجیرەی ئەلف و بێ ریز کراون . جاران لە فەرهەنگەکانی لێرخ و یەگیزارۆفدا کار ( فعل ) یان بە ڕێختی نهۆ ( حاضر ) نیشـــان دەدا ، بەڵام لە فەرهەنگەکەی ئۆربیلیدا واز لەمە هێنراوە و لەباتی ئەمە لە پاشکۆی فەرهەنگەکەدا بە دوَر و درێژی باس کراوە و باش شی کراوەتەوە . پاشکۆکە خۆی ( ١٣٤ ) لاپەڕەیە . لە لاپەڕە ١ وە تا لاپەڕە ١٠٥ گەردانی کاری نیشان داوە و لەم ڕێختانەی خوارەوە دواوە : نهۆ ، رابوردوی بەردەوام ، رابوردوی دوَر ، فەرمان (أمر) .. لە لاپەڕە ١٢٠دا جەدوەلێکی بۆ کاری تێپەڕ ( الفعل المتعدي ) وکاری تێنەپەڕ ( الفعل اللازم ) ڕێك‌خستوە . جا لەم جەدوەلەدا وا دەردەکەوێ کە ئی. ئا. ئۆربیلی ڕێختی کاری تێنەپەڕ و تێپەڕی لە یەك جیا کردۆتەوە و هەروەها گەلێك تایبەتێتی کاری تێنەپەڕ و تێپەڕی کوردیشی ئاشکرا کردوە . جگە لەوە لەم بەشە ڕێزمانەدا چاومان بە کاری سادە و لێکدراویش دەکەوێ . بەڵام ئەوەی لێرەدا سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە کە هەندێ کاری نوسیوە لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتدا نین و بەم شێوەیە نامۆن ، بە نمونە :

پنژین - ( وەنەوزدان - وەرگێڕ )

پەرچڤین - (ئاوسان - وەرگێڕ)
هێلان - (هەڵبڕین - وەرگێڕ)
ڤییان - (حەزکردن - وەرگێڕ)
سوالوین - (خلیسکان - وەرگێڕ)
ئاخافتن - (ئاخاوتن - وەرگێڕ)
..... وەکەلێکی تر .

ئەو وشانەی لە سەرەوە ناومان بردن هەرچەندە لە بەشە دیالێکتی کوردی ئەرمەنستاندا نابینرێن ، بەڵام لە بەشە دیالێکتی کوردی سوریا و عێراقدا بەرچاو دەکەون .

/ بە یارمەتی ن. یا. مارر ئی ئا. ئۆربیلی لە ساڵی ١٩١٤دا کرا بە مامۆستای زانستگەی رۆژهەڵاتناسی لە زانکۆی پێتربورگ . هەر لەو ماوەیەدا ئی. ئا ئۆربیلی کتێبێکی بۆ خوێندنی ئەدەب و زمانی کوردی بە ئەلف و بێی لاتینی دانا/ ، بەڵام نازانم بۆ بڵاو نەکرایەوە! تەنانەت ئەو نوسخەیەی کە بۆ چاپ نوسرابۆوە تا ئێستاش هەر لە ئەرشیفی ئی. ئا. ئۆربیلیدا پارێزراوە . ئەم نوسراوە گەلێك تێکستی فۆلکلۆری تێدایە . بەشێکیان هەرچەندە هەر ئەو تێکستانەن کە ئی. ئا. ئۆربیلی خۆی تۆماری کردوون ، بەڵام بەشێکی زۆری لە کتێبەکەی س ئا. یەگیزارۆف - « مێژوویەکی ئەتنۆگرافی کورتی کوردی موحافەزەی یەریڤان »ەوە وەرگرتوە ، وەك :

چیرۆکی مەحەمەدلی نێچیرڤان ، ئەسەدلی دەوەدار ، ئەحمەد بەگ ، هەڤال ، سێ برا و بزنێ وان .... هتد .

کارێکی تری کوردناسێ ئەو دەمەی ئی. ئا. ئۆربیلی ئەو هەوڵ و کۆششە بوو کە بۆ دانانی ئەلف و بێی کوردێ دای ... مێژووی ئەم کارەش بەم جۆرە بوو : لە ساڵانی ۱۹۱۱ - ۱۹۱۲دا لە کوردستانی تورکیا چەند کۆمەڵە و رێکخراوێکی جیا - جیا هەبوون ، بە ئەلف و بێی عەرەبی رۆژنامە و گۆڤاریان بڵاو دەکردەوە . ئەو کۆمەڵە و رێکخراوانە زۆریان گرنگی بەپێشخستنی رۆشنبیری کوردێ دەدا ، بەڵام قورسێ ئەلف و بێی عەرەبی و دژواری بە کارهێنانی بۆ نووسینی زمانی کوردێ تا رادەیەك بوو بە کۆسپ لە رێگای هێنانەدی ئامانجەکانیاندا لەبەر ئەوە لە نێوان ئەو کۆمەڵە و رێکخراوە سیاسی‌یە کوردیانە و لە ناو رووناکبیرانی کورددا کێشە و بەرەی ئەوە هاتەپێشەوە کە چۆن ئەلف و بێیەکی سانا و باش و گونجاو بۆ زمانی کوردێ دابنێن و هەموو کوردان لەسەری بڕۆن و یارمەتی ئەوەش بدەن کە خوێندەواری‌یان زوو لەناودا بڵاوببێتەوە . لە ساڵی ۱۹۱۳دا رێکخراوێکی رۆشنبیری کوردێ لەناوچەی « خۆی » نوێنەری خۆی - عەبدولرەزاق کە لە نەوەی ئەمیر بەدرخان بوو بۆ پێتربورگ نارد و تکای دانانی ئەلف و بێیەکی کوردێ کرد .

بە گوێرەی باسەکەی ئی. ئا. ئۆربیلی ، عەبدولرەزاق کوردێکی

تەواو بۆ ، مرۆڤێکی بالا بەرز ، تێکسمڕاو ، چوارشانە ، وەك هەڵۆ دەیڕوانی ، لە ئاخاوتندا وریا و زانا ، رەوشت بەرز و خوێندەوارێکی هەڵکەوتە بۆ . گەلێ بەیتی « مەم‌وزین »ی ئەحمەدی خانی لەبەر بۆ ، بە تایبەتی ئەو بەیتانەی مێژوی خوێناوی و خەباتی سەخت و چارەڕەشی میللەتی کورد دەگێڕنەوە . وەکو کوردێکی راست و نیشتمانپەروەر لە کاروباریدا ئازا و چالاك بۆ . ئەو کۆت و زنجیرەی لە بەندیخانە لە دەست و پێیان کردبۆ لەگەڵ خۆی هێنابۆ . بە یارمەتی چەند هەڤاڵێکی کە دژی زۆرداری و ستەمی سوڵتان تێدەکۆشان توانی لە بەندیخانە رابکات . عەبدولڕەزاق سەبارەت بە کۆت و زنجیرەکەی وتی : « ئەم کۆت و زنجیرە هەمیشە لەگەڵ خۆم هەڵ دەگرم و بۆ گشت شوێنێکی دەبەم ، بۆ ئەوەی هەرگیز ئەوە لە بیر نەکەم کە میللەتەکەم لەم کۆت و زنجیرەی زۆرداری عوسمانی و ئێرانیە دایە ، کوردستان خراوەتە ناو زنجیری سوڵتانی عوسمانی‌یەوە . هیوا و ئامانج و ئاواتی ئێمە ئەوەیە کە گەل و وڵاتمان لە کۆت و زنجیری زۆردار و داگیرکەر رزگار کەین . جا بۆ وەدیهێنانی ئەم ئامانجە پیرۆزەش گەلەکەمان پێویستی‌یەکی زۆری بە خوێندەواری هەیە . کلیلی ئەمەش ـ رەخساندنی ئەسبابی فێربۆن وخوێندەواری‌یە بۆ گەلی کورد . لەمەدا یارمەتیمان بدەن . ئەگەر بە من و هاڤالانم گەل رزگار نەکرا خۆ کە هەر کاتێ بۆ بە خاوەنی دەست و قەڵەم و خوێندەواری خۆی ئەوسا دەتوانێ بە خۆیدا بێتەوە و ئازادی خۆی بسێنێ .

جا بە فەرمانی وەزارەتی هەندەران ، ئەکادیمیەی زانستی رۆسی داوای لە ئی. ئا. ئۆربیلی کرد کە ئەلف و بێیەکی کوردی دابنێ . کاتێ بە دانانی ئەلف و بێکەوە خەریك بوو ئی. ئا. ئۆربیلی چەند جارێك بیر و رای خۆی گۆڕی . لە پێشا کە دەستی بە کارەکە کرد نیازی وا بوو لە سەر بناخەی نوسینی ئەرمەنی دایمەزرێنێ ، وا دیارە ئەمەش رەنگە لەبەر ئەوە بووبێ ، چونکە لە تۆمارکردنی تێکستی کوردیدا و لە لێکۆڵینەوەی رێزمانی کوردیدا خەریکی شێوەی مۆکس بوو و هەر ئەلف و بێی ئەرمەنی بەکار هێنابوو .

جا ئەو ئەلف و بێی ئەرمەنییەی کە ئی. ئا. ئۆربیلی بۆ زمانی کوردی دابنابوو ، یەکەم جار ئاکۆپۆف کازاریان (لازۆ) بە کاری هێنا و ئەوە بوو کە لە ساڵی ٢٠دا یەکەم کتێبی قوتابخانەی لە ئەرمەنستانی سۆڤێت بێ نوسی [ ئەلف و بێ ئەرمەنییەکەی ئی. ئا. ئۆربیلی کە بۆ زمانی کوردی داینا بریتی بوو لە (٨) پیتی بزوێن و (٢٨) پیتی کۆنسۆنانت] . ئەوەی شیاوی باسە ژمارەی دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەرمەنی نزیکەی هێندەی یەکن ؛ جا لەبەر ئەوە کە پیتی تەواو بۆ نیشاندان و کێشانی وێنەی دەنگە کۆنسۆنانتەکانی زمانی کوردی لە ئەلف و بێی ئەرمەنیدا هەبوون بۆیە لە دیارکردنی دەنگە کۆنسۆنانتەکاندا کۆسپ و تەگەرە نەهاتە رێ . بەڵام پاش ماوەیەك لەبەر چەند هۆیەك ئی. ئا. ئۆربیلی ئەو ئەلف و بێیەی کە لە سەر بناخەی نوسینی

ئەرمەنی داینابو رەت کردەوە و وازی لێ هێنا و لە سەر بناخەی نوسینی روسی ئەلف و بێیەکی نوێی بۆ نوسینی کوردی دانـا. لە ئەرشیفی ئی. ئا. ئۆربیلیدا تەواوی ئەم کارەی پارێزراوە.

[ ئەلف و بێ کوردییەکەی ئی. ئا. ئۆربیلی کە لە سەر بنـاخەی نوسینی روسی هەڵیچنیوە لە (٣٨) نیشانە، کە (٩) یان بزوێن و (٢٩) یان کۆنسـۆنانتن پێـکهاتوە] نوسەر بۆ دیارکردنی تێـکڕایی دەنگەکانی زمانی کوردی هەندێ پیـت و نیشـانەی وای داناوە کە لە ئەلف و بێـی روســیدا نین و بەمــە ئەو کەم و کورتیەی پڕکردۆتەوە. لە جــەدوەلی ئەلف و بـێکەدا وا دەردەکەوێ کە دەنگەکانی زمانی کوردی بریتین لە (٩) بزوێن و (٢٩) کۆنسۆنانت.

بەڵام ئەم ئەلف و بێیە بـڵاو نەبۆوە. ئی. ئا. ئۆربیـلی تەنانەت خۆشـی بەکاری نەهێنـا. جگە لە فەرهەنگێـکی کوردی ـ روسی کە بەو ئەلف و بێیە نوسیویە ئیتر هـەرچی نوسـینی تری هەیە لە بارەی زمانی کوردیەوە هەموی بە ئەلـف و بێـی لاتینی نوسیوە. ئەو کـتێبی ئەدەب و زمانی کوردیەی کە لە ساڵی ١٩١٤دا بۆ چاپـی ئامادە کردبو و لە پێشەوەش ناومان برد بە پیتی لاتینی نوسیبوی. وا دیارە لەو سەردەمەوە ئی. ئا. ئۆربیلی هاتبوە سـەر ئەو رایە کە بەکار هێنانی ئەلف و بێـی لاتینی بۆ نوسینی کوردی پڕ بەپێستی خۆیەتی. دەربارەی گونجانی ئەلف و بێـی لاتینی بۆ نوسینی کوردی دەڵێ: « چۆن کاتی خۆی ئەو ئەلف و بێ ئەرمەنییـەی بۆ

نوسینی کوردی چاککرا و لە تەجروبەدا سەرنەکەوت ، هەروەها بەکار هێنانی ئەلف و بێی رۆسیش سەرکەوتنێکی ئەوتۆ وەدەست ناهێنێ . بێگومان بەزۆر سەپاندنی ئەلف و بێ و نوسینمان ئاکامی بە کەڵك و بە پێزی لێ ناوەشێتەوە . سەرکەوتنی نوسین و ئەلف و بێ بۆ زمانی کوردی لەوەدایە کە تا چە ئەندازەیەك لەبار و ئاسانە و چەند دەست دەدات و تا چە رادەیەك سود بەو کەسانە دەبەخشێت کە ئەلف و بێکەیان بۆ دادەنرێ .[لەبەر ئەوە بڕیاری هەرە بە پێز و بە سود بۆ دانانی ئەلف و بێیەکی رێك و پێك و ئاسان و یەکخراو ، کە بتوانێ کورد لە کۆمەڵی میللەتان نزیك خاتەوە ئەلف و بێی لاتینیەو ئەمەش رێگایەکی پیرۆز و چاکە و مەگەر بەمە رادەی کولتوری ئەو میللەتە زۆرلێکراو و هەرە چەوساوەیەی رۆژهەڵات بەرزکرێتەوە و دەست بە کاری نوێ و پێشکەوتن بکرێ و لە میللەتانی جیهان نزیك بێتەوە[6]]

[لەسەر خواستی ئی. ئا. ئۆربیلی ئەوە بو ل. مارۆکولۆف لە ساڵی ١٩٢٨دا ئەلف و بێیەکی نوێی کوردی لەسەر بناخەی ئەلف و بێی لاتینی دانا و کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤێت بەم ئەلف و بێیە کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانیان]

ئێستا کارگێڕانی بەشی کوردی ئامۆژگای رۆژهەلاتناسی لێنینگراد

(٦) بڕوانە : ئەرشیفی ئی. ئا. ئۆربیلی ، دەستنوسی « ئەلف و بێی کوردی » . ( نوسەر ) .

کار و بەرهەمەکانی ئی. ئا. ئۆربیلیان بۆ چـــاپ ئامادە کردوە و بەرهەمەکانیشی بریتین لە : فەرهەنگی کوردی (شێوەی مۆکـــس)ـ روسی ، ژمارەیەك تێـکستی فۆلـکلۆری کوردی کە لە مۆکس و چەند شوێنێـکی ئەرمەنستانی سۆڤێت تۆماری کردوَن ، گەردانی کار لە زمانی کوردیدا ، بیر و رای ئی. ئا. ئۆربیلی سـەبارەت بە مێژوَ و کولتوری میللەتی کورد . . . وە هـەندێـکی تر .

/ سالی ١٩٢٨ دەستەیەك لە لاوانی کورد ، کە یەکێـکیان نوسەری ئەم وتارە بـو ، لە لایەن کۆمیتـەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیســتی ئەرمەنـستانەوە بۆ خوێندن نێرران بۆ شاری لێنینـگراد ./

هەر کە گەییشتینە لێنینـگراد ، یەکســەر چوین بۆ لای ئی. ئا. ئۆربیلی و نامەی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمـۆنیستی ئەرمەنـستانمان گەیاندە دەستی . ئی. ئا. ئۆربیلی زۆر بە روَخۆشییەوە پێشوازی لێ کردین ، جارێ لە پێشا بۆ مالی خۆیانی بردین ، لە لێنینـگرادی دوَر بو ، مێواندارییەکی رۆژهەلاتانەی تەواوی کردین ، بە دەم نان خواردنەوە ، باسی ئەو شوێنانەی بۆ دەکێڕاینەوە کە لە کوردستان بینیونی ، لە نەریت و رەوشتی کوردان دەدوا ، پەنجەی بۆ نان و خوانەکەی بەردەمان درێژ کرد و بەینێـکیش بەشان و باهوی خزمەت و میوانداریاندا هەلیدا و لە ناخی دلیەوە کەوتە پەسنی پیاوەتی و میهرەبانی و پاکی (مۆرتۆلا بەگ)ی گەورەی مۆکس و یادی دۆستایەتی ئەو سەردەمەی دەکردەوە کە ئەوسـا لە مۆکس لەگەلیدا گرتبوی . بە دەم قسەی خۆش و سەرنج راکێشیەوە

کە دەربارەی کورد و مێژوی کورد و ژیانی کورد دەیکرد ، دەیوت مێژوی کورد سەرانسەر خەباتە لە پێناوی سەربەخۆیی و ئازادیدا ، کەچی بە داخەوە ئەم گەلە ، نەك هەر خوێندەوار ، بەڵکو کۆلکە خوێندەواریشی هەر کەمە ، بەڵام وا ئێوەی لاوانی کورد لە سایەی ئۆکتۆبەرەوە دەرفەتتان بۆهەڵکەوت کە لە لێنینگراد ، لە گەورەترین مەرکەزی زانستی سۆڤێتدا بخوێنن و ببنە چرای دوارۆژی میللەتەکەتان . بەراستی ئەو وشە جوان و راستانەی مامۆستامان لە دڵ و مێشکماندا جێگیربۆن و هەرگیز و هەتا هەتایە لە بیریان ناکەین .

ئیتر هەر لەو دەمەوە ئی. ئا. ئۆربیلی بۆ بە باوك و مامۆستا و هاورێیمان . کاتێ لە زانستگەی کرێکاران دەمانخوێند هەمیشە چاوی لێمان بۆ ، زۆر جار دەهاتە زانستگە بۆ لامان ، لێی دەپرسین لە خوێندندا چۆنن ، پێویستیتان چیە ، ئامۆژگاری دەکردین . ساڵی ١٩٣١ کە زانستگەی کرێکارانمان تەواوکرد ، من و چەند هاورێیەکی کوردی ترم بەختەوەری روی تێکردین و لە زانستگەی ئادابی زانکۆی لێنینگراد وەرگیراین ، کە لێرە یەکەم مامۆستای زمانی کوردیمان ئی. ئا. ئۆربیلی بۆ . بەراستی مامۆستایەکی باش بۆ ، زانیارییەکی زۆری دەربارەی مێژوی کولتوری کورد و زمانی کوردی دەزانی ، جگە لەوە رێبەرێکی هەڵکەوتو و سەرکەتوش بۆ ، لە دەرس وتنەوەدا هەمیشە هەست و چەشەی زانستی بەرامبەر بە

ڕێزمانی کوردیی دەبزواندین ، پێی دەوتـین کە لەچی وردبینەوە ، چۆن کەرەستە کـۆ بکەینەوە ، چۆن سەرنج بدەین و ئەنجام وەدەست بهێنین . بەراستی ئەم دەرسانەی ئی. ئا. ئۆربیلی کاری تەواوی لـە چارەنوسی خۆم و هاوڕێـکانم و ( یو. ئاڤلیانی ، ئی. تسوکەرمان ) کرد و کردینی بە کوردناس .

هەندێ جار لە دەرس وتنەوەدا پرسیار و رای وا دەهـاتنە پێشەوە کە ئی. ئا. ئۆربیلی بەپێویستی دەزانی وەبەرباری سـەرنجمانی بدات ، جارێـکیان لـە گەردانی کاری زمانی کوردیی دەدواین ، ئی. ئا. ئۆربیلی داوای لە قوتابیـان کرد کە هەرچی کاری کوردیی هەیە بینوسن . من بەشبەحاڵی خۆم ، لە بیرمە سێ دەفتەری مـام ناوەندیم پڕکردەوە . کاتێ ئی. ئا. ئۆربیلی روانییە کارەکەم فەرمووی هەرچی کاریتر دەزانی تۆماری بکە و دواییش دابەشیان بکە و لێـکیان هەڵاوێرە و ئینجا بزانە چەند جۆرە کار لە زمانی کوردیدا هەن . . . بەم جۆرە بۆی دەرخستم کە چەند جۆرێك کار لەزمانی کوردیدا هەیە .

/ وەهەر کەرەستەی ئەو کارانەشم بوون کە لە ئاکامدا بوون بە سەرچاوەی نامەی دوکتۆری یەکەم « دروست بوونی کاری لێکدراو لە زمانی کوردیدا[٧] » /

(٧) بڕوانە : قەناتی کوردۆ ، کورتەی نامەی دوکتۆری ، دروست بوونی کاری لێـکدراو لە زمانی کوردیدا ، لێنینگراد ١٩٤٢ . ( نوسەر ) .

لە وتوویژی باسی « ناو »دا کیشەی جینس هاتە گۆرێ ، ئی. ئا. ئۆربیلی داوای لێ کردم نموونە نـاوی وا بێنمەوە کە بە شێوەی جیاواز بەکار بهێنرێت . ئیتر هەروا بە دەم وتوویژەکەوە بۆم روون بۆوە کە لە زمانی کوردیدا جنسی جیاواز هەیە ؛ بۆیەکە یەکسەر هەر لەو دەرسەدا رای خۆمم دەرکاند . ئی. ئا. ئۆربیلی وتی : « دەربارەی بوون و نەبوونی جینس لە زمانی کوردیدا هێشتا کەس هیچی نەنووسیوە ، من بەش بە حاڵی خۆم هیچم لەم رووەوە نەبیستوە و هیچ نازانم » وە داوای لێ کردم نموونەی تر بهێنمەوە . بە زەردەخەنەوە وەڵامم دایەوە کە نموونەکانم جوان نین و وشەی لاکۆڵان و بازارین ، مامۆستا فەرمووی : کورم گوێی مەدرێ ، لە زانستدا شەرم و مەرم نییە » چەند نموونەیەکم بۆ هێنایەوە و هەموشیان نیشانەی جیاوازی جینسییان بە روونی تێدابوون و هاورێکانم دایانە پرمەی پێکەنین . ئی ئا ئۆربیلی دۆش داما و هێندە نەمابوو لە گێژاوی بیر و خەیاڵا نوقم بێ ، لە پڕ کێشای بە ناوچاوانی خۆیدا و لە هاورێکانی خوڕیم ! « بێدەنگ بن » ، ئینجا روی کردە من و فەرمووی « ئێ ، ئیتر » منیش چەند نموونەیەکی ترم بۆ هێنایەوە کە لە حاڵەتی ئیزافەدا بە ئاشکرا جیاوازی جینسی نێر و مێیان تێدا دەردەکەوت . ئینجا ئی. ئا. ئۆربیلی کە بۆی روون بۆوە جینس لە زمانی کوردیشدا هەیە ، پێشنیاری کرد کە لەگەڵ ئی. ئی. تسوکەرماندا وتارێک دەربارەی ئیزافە لە زمانی کوردیدا بنووسین . ئێمەش لەبەر رۆشنایی

/ ئەو کەرەستەیەی کە خۆم کۆم کردبۆوە دوو وتارمان نووسی : « ئیزافە لە زمانی کوردیدا » و « نێر و مێ لە زمانی کوردیدا » . جا هەردوو وتارەکمان لە ساڵی ۱۹۳۳دا بە هاوکاری عەرەبێ شەمۆوە بڵاوکردەوە/، یەکەمیان لە گۆڤاری « شۆڕش و نووسین » و دووەمیان لە کتێبی « نووسین و شۆڕش »دا/ وە هەر بە هۆی بڵاوبوونەوەی ئەم دوو وتارەشەوە بوو کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردناسیدا هەست بەوە کرا کە لە زمانی کوردیدا خاسیەتی نێر و مێ هەیە و لە حاڵەتی ئیزافەدا هەر یەکە نیشانەی تایبەتی خۆی هەیە و لە سەر ئەمە ناو دابەش کرا .

بەراستی ئەم کارە نوێیە لە لایەن ئێراننناسەکانەوە پێشوازییەکی گەرم کرا و بە دۆزینەوەیەکی زانستی درایە قەڵەم[8] . ئێمەش شانازی بەوەوە دەکەین کە ئەم کارەمان بە رابەری و راوێژی مامۆستای بەرزمان ئی. ئا. ئۆربیلی هێنایە بەرهەم .

/ ئی. ئا. ئۆربیلی لە دەرکردنی رۆژنامەی « ریاتازە »شدا یارمەتییەکی دڵسۆزانەی کوردەکانی ئەرمەنستانی سۆڤیێتی دا/. رووناکبیرانی کوردی ئەرمەنستان خۆیان بە قەرزارباری ئی. ئا. ئوربیلی دەزانن و زۆر سوپاسی دەکەن بەرانبەر بەو رەنج و ئەرکەی کە لە پێناوی دەرکردنی ئەو رۆژنامەیەدا

(۸) بڕوانە : ئـابایێڤ ، جارێکی تر دەربارەی دۆزینەوەی دواکەوتوو ، گۆڤاری « مەسەلەی زمانناسی » ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ژ ٥ . ( نووسەر ) .

کێشای و هەر کۆسپ و تەگەرەیەکی هاتە رێی مشت و ماڵی کرد[٩] .

ئی. ئا. ئۆربیلی لە ساڵانی دوایی ژیانیدا هەمیشە هەر ، خەریکی کادر پێ گەیاندن بوو بۆ کوردناسی و بەردەوام پسپۆڕانی زمان و ئەدەب و مێژوو و ئەتنۆگرافیای کوردی ئامادە دەکرد .

لە ساڵانی دووەمی شەڕی جیهاندا ، کە سەرۆکی ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستان بوو ، باسی ئەوەیان هێنایە پێشەوە کە چۆن پێویستە مێژوو و مێژووی کولتوری کورد لە ئامۆژگا زانستیێکانی ئەکادیمیەدا بخوێندرێن . ئەوە بوو لە رێگای هەوڵ و تەقەلای ئی. ئا. ئۆربیلیەوە لە ئامۆژگا ئەدەبیەکانی ئەکادیمیەی زانستی ئەرمەنستان چەند زانایەکی کورد دامەزران ، وەك : حاجی جندی ، ئەمینی عەڤدال ...

ئی. ئا. ئۆربیلی هەمیشە بە چاوی رێز و قەدرەوە سەیری کوردناسی دەکرد ، زۆر دڵسۆزانە هەوڵی پێشکەوتنیان و کار راپەڕاندن و بەرهەم بڵاوکردنەوەکانی دەدان . بە یارمەتی ئەو ، تێکستە کوردیێکانی کارگێڕی کتێبخانەی زانکۆی ڤیەنا ( هـ. مەکەس ) بڵاو کرایەوە . ( هـ. مەکەس ) ئەوتێکستانەی لە شاری برنۆ لە زمانی ( محەمەد ئەمین ) ناوێکی بازرگانی کوردی خەڵکی

(٩) ن ئا. ئالیکسایان ، بیبلیۆگرافیای کتێبی کوردی سۆڤیتی ، یەریڤان ١٩٦٢ ، ل ١٢ ـ ١٣ . ( نوسەر ) .

(ماردین)ەوە تۆمار کردبوو . تێکستەکان بە شێوەی ناوچەی ماردین کە لە کوردستانی تورکیایە. پاشکۆ فەرهەنگۆکێـکی کوردی ـ رووسی لەگەڵ دایە. لە پێشەکی ئەم کتێبەدا ئی. ئا. ئۆربیلی ئەم تێکستانەی بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و دیالێکتەکانی بە سەرچاوەیەکی بە نرخ و پڕ سوود لە قەڵەم داوە[10].

ئی. ئا. ئۆربیلی زەحمەت و رەنجێکی زۆری تری بە پیاچوونەوەی فەرهەنگە کوردی‌یە ـ رووسی‌یەکەی چەرکەزی بەکۆ شدا کێشاوە و پێشەکیەکی جوانی بۆ نووسیوە و زانایانە باسی زمانی کوردی و موفرەداتی بەشە دیالێکتی کوردەکانی ئەرمەنستانی تێدا کردوە و لەوەش دواوە کە فەرهەنگەکە چەندی دەور لە پێشکەوتنی رۆشنبیری کوردی ئەرمەنستاندا بینیوە و ئەم دەورەش بایی چەندە[11].

(١٠) بڕوانە : پێشەکی بو کتێبی « تێکستی کوردی » ـ هـ مەکەس ، لینینگراد ١٩٢٦ . (نووسەر) .

(١١) بڕوانە : پێشەکی بۆ « فەرهەنگی کوردی ـ رووسی » ـ چەرکەزی بەکۆ ، مۆسکۆ ١٩٥٧ . (نووسەر) . ئەم کارەی چەرکەزی بەکۆ یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ رووسیە کە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر چاپ کراوە/. ئەم فەرهەنگە بریتییە لە (١٤) هەزار وشەی کوردی و (٦١٨) لاپەڕە . لە پاشکۆی ئەم نووسراوەدا (ل ٥٠٩ ـ ٦١٨) کورتەیەکی رێزمانی کوردی داوە . هەرچەندە لەم کارەدا گەلێك ناتەواوی هەیە ، وەك شێواندنی بەشە کوردییەکەی بە وشەی رووسی کە بە هیچ جۆرێك لە زمانی کوردیدا بەکار ناهێنرێن ، یاخود کەم و کورتی=

ئی. ئا. ئۆربیلی لە کارە زانستێیکانیدا کە دەربارەی کولتوری میللەتانی پشت قەفقاس و ئاسیای بچوکی کۆڵیوەتەوە، زۆر جار باسی دەوری کوردی کردوە و ناوی گەورەکانی کوردی، وەکو : سەلاحەددینی ئەیوبی و کەریم خانی زەند . . . ی بە سەربەرزی هێناوە و لەو دەورە گرنگانەیان دواوە کە لە مێژوی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا بینیویانە .

لە پێشەکی کتێبی « یادی سەردەمی روستاڤێلی »دا، شاعیری مەزنی کورد ـ ئەحمەدی خانی ـ بەرهەمەکەی وەبیر دێنێتەوە. جا سەبارەت بەمە ئی. ئا. ئۆربیلی نوسیویە دەڵێ : « ئەو ( ئەحمەدی خانی ـ قەناتی کوردۆ ) رۆڵەی ئەو گەلەیە، کە هیــچ کات فەرمانڕەوایی خۆی بە خۆیەوە نەبینیوە و هەر ئەمەشە کە بوە بە سۆنگەی لە بیرچونەوەی و پشت گوێ خستنی، ئەگینا کێ دەوری ئەوی لە کولتوری رۆژهەلاتدا بینیوە . چەندین رۆڵەی ئــەم گەلە لە ژێر زەبری میللەتانی تردا تواندراونەوە و ناوی زۆر شاعیر و هونەرمەند و قارەمانیان کە جێی شانازی میللەتان ونکراوە و بەردی خراوەتە سەر »[١٢] .

ئی. ئا. ئۆربیلی نرخێکی بەرزی بە کولتوری میللەتی کورد دابو .

---

= لە شەرح و لێکدانەوەی مانای هەندێ وشەدا، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا جێگەیەکی دیاری لە کوردناسی سۆڤیێتدا هەیە . ( وەرگێڕ ) .

(١٢) بڕوانە : کتێبی « یادگاری سەدەی روستاڤیلی »، ١٩٣٨، ل ٥ . ( نوسەر ) .

لە بارەی جوانی و شیرینی و سۆز و ناسکی گۆرانی کوردی‌یەوە و بەرزی فۆلکلۆریەوە دەڵێ : «ئەوەی شارەزای شیعری فۆلکلۆری کوردی بێت ، کەسێ ئاشنای حیکایەتی کوردی بوبێ ئەوسا دەزانێ جوانی و سۆز و ناسکی و دڵ پاکی کوردان لە چی رادە و ئەندازەیەکدایە . . .»[١٣] .

لە وڵاتی ئێمە یەکەم کەس کە بە شێوەیەکی راستەقانی و بەرز و زانایانە نرخ و گرنگی بەرهەمی ئەدەبی ـ «مەم و زین»ی شاعیری مەزنی کورد ئەحمەدی خانی دابێ ئی. ئا. ئۆربیلی‌یە . ئەم پیاوە ناوی ئەحمەدی خانی لە ریزی شاعیرانی مەزنی وەك : ( فیردەوسی و رۆستاڤێلی[١٤] ) داناوە .

---

(١٣) بڕوانە : ئەرشیفی ئی. ئا. ئۆربیلی ، دەستنوس « دەربارەی فەرهەنگی کوردی » . ( نوسەر ) .

(١٤) شەتا روستاڤێلی ئەو شاعیرە گورجە مەزنەیە کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیاوە ( سالی لە دایك بون و مردنی ئاشکرا نیە ) و نوسەری داستانی بە ناوبانگ ـ ( پاڵەوان لە بەرگی پڵنگدا )یە . روستاڤێلی لوتکەی هەرە بەرزی کولتوری دەرەبەگایەتی گورجستانی سەدەی دوانزەیە . ئەم بەرهەمەی روستاڤێلی لە مێژوی ئەدەبی گورجی و بیری کۆمەڵایەتیدا جێگایەکی بڵند و بڕهاوتای هەیە و بوە بە رەمز و پێواری میرخاسی و کەژناسی و کەڵەمێردی و ئەوین و دۆستایەتی و هەر بە زمانی گورجی پتر لە ٤٠ جار لە چاپ دراوە ، ( یەکەم جاریان لە سالی ١٧١٢دا لە تبلیس لە چاپ درا ) و گۆڕاوەتە سەر بەشی زۆری زمانەکانی جیهان . ( وەرگێر ) .

ئی. ئا. ئۆربیلی نوسیویتی : «کاتێ بیر لە میللەت و تێکەڵی شاعیر و پێکەیشتنی لە ناو گەلدا دەکەیتەوە ، سێ شـاعیری مەزنی رۆژهەڵاتت دێتە یاد : فیردەوسی فارس ، روستاڤێلی گورج ، ئەحمـەدی خانی کورد . تەمەنی ئەدەبی میللەتی فیردەوسی بە هەزار ساڵێك و هی روستاڤێلی بە حەوسەد ساڵێك و هی ئەحمەدی خانی بە سێ سەدەیەکەوە بەستراون و هەمویان بون بە رەمز و پێوار و نیشانەی میللەتەکەیان و هەڵبەستەکانیان لە نێو گەلدا دەنـگ دەداتەوە ، تەنانەت ئەوانەش هەر لەبەریان کردوە کە فڕیان بە سـەر خوێندەوارییەوە نییە[15] » .

لە وتووێژێـکی دوێ قۆڵیدا ـ واتە ئی. ئا. ئۆربیلی و خۆم ـ کە لە هەندێ کێشـەی کوردناسـی دەدواین ، ئی ئا. ئۆربیلی دەربارەی ئامادەکردن و پێ گەیاندنی کادری کوردناسی و دامەزراندنی مەڵبەندی کوردناسی هێنایە پێشەوە : بەجێ هێنانی ئەم کارە لە سـالانی ٤٠ و ٥٠ دا ئاوتێـکی گرنـگی هەبو . بەڵام کە لە سـاڵی ١٩٥٥ دا کرا بـە کارگێڕی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسـی لێنینگراد و بەمـە وەدی هێنانی ئاواتەکەی سانا بو . ئی. ئا. ئۆربیلی دەستی کرد بە کۆ کردنەوەی کادرە کوردناسەکان . ئی. ئی. تسوکەرمانیش کە ماوەیەك بو لە (ڤیلنوس) لە ئامۆژگای زماننناسی کاری دەکرد لە ساڵی ١٩٥٦دا گەڕایەوە لێنینگراد ، هەروەها ژ. س. موسیلیان و ی. ئی. دیمینتیڤا ، کە دوێ ئێراننناس بون

(١٥) بڕوانە : سەرچاوەی ناوبراو ، کـتێبی « یادگـاری سەدەی روستاڤێلی » ، ل . ٢ . ( نوسەر ) .

ئەوانیش لە گەڵ کۆمەڵی کوردناسەکاندا وەکارکەوتن. ئینجا لە پاش ماوەیەك چەند کادرێکی نوێی ئامادەکران و ژمارەیەك قوتابی بۆ خوێندنی دوکتۆرا پەسند کران.

ساڵی ١٩٥٩ ئی. ئا. ئۆربیلی فەرمانی دامەزراندنی بەشی کوردی دەرکرد : «لەبەر پێویستی رێك و پێك هەڵسوڕاندنی پلانی ئامۆژگاکەمان ... فەرمانم دا لە (١)ی مارتی ساڵی ١٩٥٩ەوە دەستەی کوردناسان ، کە لە بەشی ئێرانن ، جیا بکرێنەوە و بە شێوەیەکی سەربەخۆ و بە سەرۆکایەتی خۆم دابمەزرێنرێن ... ئەو دەستەیەش ئەمانەن : کارگێڕان - ق. کوردۆ ، ئی. ئی. تسوکرمان ، م. ب. رودێنکۆ ، ژ. س. موسیلیان ، ئی. ئا. دیمنیتیڤا ، وە قوتابیانی دوکتۆرا - ئی. ئا. سمیرنۆڤا ، ك. ئەیوبی ، ز. یوسوپۆڤا ، ئۆردیخانی جەلیل و ئەرکی لێکۆڵینەوەی هەموو کێشەکانی مێژوو و کولتوور و زمانی کوردی دەخرێتە ئەستۆی ئەم دەستەیە»[١٦] .
ئا بەم جۆرە ئی. ئا. ئۆربیلی یەکەم بەشی کوردی دامەزراند و کوردناسی بە شێوەیەکی رێك و پێك گەشە پێدا و بەرەو پێشەوەی برد .

جا لەبەر رووناکی ئەم باسەدا وا دەردەکەوێ و روون

---

(١٦) ئەرشیفی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی لینینگراد ، بەش ١٥٢ ، ژ ٢ . (نووسەر) .

دەبێتەوە کە ئەکادیمی ئی. ئا. ئۆربیــلی کـێ بوە و چی دەورێــکی گرنگ و بالآی لە مێژوَی کوردناسی سۆڤێتدا گێڕاوە و ئاشکراشە کە کوردناسانی سۆڤێت چەند قەرزارباری مامۆستای بەرز و بەرێزیانن .

* * * * * *

## - ملخص المقال -

# ى. أ. اوربيلى والدراسات الكردية

العضو العامل : البروفيسور قناتي كوردو

ترجمة وتعليق : د. عبد الرحمن معروف

ان للاكاديمي يوسف أبكاروفيج اوربيلي دوراً خاصاً في وضع الحجر الاساس لصرح الكردلوجيا في الاتحاد السوفيتي ولمركز الابحاث اللغوية والادبية والتاريخية والتراثية للشعب الكردي في لينينكراد .

وفي معرض الحديث عن العلاقات الكردية الارمنية لايسع الاوساط العلمية لارمينيا السوفيتية الا أن تسجل لنخبة من ابناء الشعب الارمني ماقدموه للشعب الكردي من الخدمات الجليلة وفي طليعتهم خ. أبوفيان ، اول من كتب في علم الاثنوغرافيا الكردية ، و ي. ل. لالايان الذي سجل في مذكراته الكثير من مآثر الشعب الكردي الجمالية والاجتماعية في ارمينيا التركية ، والبروفيسور س. ي. يكيزاروف ، ناشر موجز تاريخ اتنوغرافي لكرد يريفان ، وآكوبوف كازاريان ( لازو ) واضع اول كتاب مدرسي للمدارس الكردية في ارمينيا ، و ي. أ. اوربيلي مؤسس مدرسة الكردلوجيا السوفيتية

ولا يسع الشعب الكردي الا أن يعترف للشعب الارمني بما اسبغه عليه علماؤه الأعلام من فضل، ويدين له بما يزيده فخاراً ويكلل جبينه بالغار .

لعل الدراسات الكردية تمتد جذورها الاولى الى الاعوام ١٩١١-١٩١٣ حين اوفدت اكاديمية العلوم الروسية باقتراح من ن. يا. مار ، الاكاديمي ي. أ. اوربيلي الى منطقة مكس في ارمينيا التركية لدراسة اللهجة المكسية للغة الارمنية وتعلمها ، الأمر الذي حمله ، وهو في غمرة دراساته ، على امعان النظر في خصائص اللغة الكردية التي كانت هي الأخرى تعايش اللغة الارمنية في المنطقة ذاتها .

لقد جمع اوربيلي ثمة بعض النصوص الكردية ، ووضع قاموساً كردياً - روسياً ، يقع في (١٥) ملزمة ، اردفه بملحق في تصريف الافعال . الا أن الحرب العامة حالت - للاسف - دون أن ترى اعماله تلك النور ...

ومنذ عام ١٩١٤ حتى عام ١٩٣٥ كان اوربيلي يدرس اللغة الكردية في جامعة بطرسبورغ ، وعلى الرغم من تزايد مشاغله عقب ثورة اوكتوبر فانه لم ينصرف عن التدريس وعن دراسة المواد الفولكلورية واللغوية الكردية . فقد قام سنة ١٩٢٧ بجولة في المناطق الكردية بارمينيا السوفيتية وجمع نصوص « مم و زين » و « ليلى ومجنون » .

ومما تجدر الاشارة اليه أن قاموسه الكردي - الروسي انما يضم طائفة كبيرة من المفردات اللغوية التي تخص التراث والحياة الزراعية

لمنطقة مكس ، والتي تدل في مجمل خصائصها النحوية والصرفية على أنها أقرب الى لهجة حكاري . ثم انه يعد بين جملة القواميس التي وضعها المستشرقون في مفتتح القرن العشرين عملا فذاً ، رتبت مفرداته ترتيباً هجائياً ، مخالفاً لما هو مألوف في قاموسي لرخ ويكيزاروف من ايراد صيغة الحال للفعل مستعيضاً عن ذلك بتكريس الملحق لهذه المهمة بحثاً وتحليلا لاحوال المتعدي واللازم والبسيط والمركب من الافعال . ومما يذكر ان أرشيف اوربيلي ما زال يضم مخطوطة كتاب للادب واللغة الكرديين يرجع تأريخها الى سنى تدريس اللغة الكردية في معهد الاستشراق ببطرسبورغ لسنا ندري لم لم يطبع يومئذ ؟

ومن نشاطات اوربيلي بهذا الصدد محاولة ترتيب ابجدية كردية اثارت فكرتها رغبة بعض الجمعيات والمنظمات بكردستان تركيا خلال الاعوام ١٩١١ ـ ١٩١٢ فى وضع ابجدية كردية تغني عن استخدام الحروف العربيــة التي لم تكن تفي بمتطلبات الاصوات الكردية . وتوكيداً لهذه الرغبــة اوفدت احدى الجمعيات الكردية في منطقة (خوى) ممثلها ، عبدالرزاق من احفاد الامير بدرخان الى بطرسبورغ يرجوها العمل على وضع ابجدية كردية . ومن خلال حديث اوربيلي يظهر مدى تعاظم الوعي القومي الكردي في تلك الفترة ومقدار تنامي الشعور بضرورة التحرر من نير السلطنة التركية في شخص عبدالرزاق الذي كان قد هرب من زنزانات السلطان ، حاملاً معه قيوده واصفاده ، يستشهد بها حيثما حل على ما كان يعاني منه احرار الشعب الكردي يومذاك من ظلم وعنت وعسف ، كما يظهر مبلغ اهتمام المثقفين الكرد

لتلك الفترة بالجانب التعليمي طريقاً للتحرر القومي .

وبناء على أمر من وزارة التربيـة كلفت اكاديمية العلوم الروسية اوربيلي بترتيب ابجـدية كردية . فقد بدأ اوربيلي عمله اول الأمر ، معتمداً الابجدية الارمنية اســـاساً ولربما كان لاستخدامه الابجدية الارمنية في تسجيل النصوص الكردية المكسية وابحاثه ودراساته بادىء ذي بدء أثر ملحوظ في اعتمادها .

على أن الابجدية الارمنية تلك انما استخدمها ( لازو ) اول مرة سنة ١٩٢٠ في وضع اول كتاب مدرسي للمدارس الكردية فى ارمينيا السوفيتية .

أما الابجدية فقد كانت تتألف من (٨) حروف مصوتة و (٢٧) حرفاً صامتاً . ولعل مابين الاصوات الكردية والاصـــوات الارمنية الصامتة من التقارب الى حد كبير ما اعان على سـهولة وضعها . غـير ان اوربيلى نفسه انما الغاها بعد فترة ، فوضع أبجدية كردية أخـرى على أساس الابجدية الروسية . أما الابجدية هذه فقد كان جماعها (٣٨) حرفاً ، (٩) منها مصوتة ، و (٢٩) منها صائتة . خلا ما اضافه المؤلف من بعض العلائم التى لا وجود لها في الابجـدية الروسـية . ولكنها ـ بله قاموسه الكردى ـ الروسي الذي كتبه بها ـ لم يكتب بها شيء آخر ولم تنشر . وقد كتب كافة آثاره الاخرى حول الدراسات الكردية بالابجدية اللاتينية . ويبدو أنه استقر رأيه في نهاية المطاف على اختيار الابجدية اللاتينية كافضل هجائية واوفى ابجدية بمتطلبـات الاصوات الكردية . وعلى هذا الاساس وضع ل. ماروكولوف ابجدية

كردية جديدة نشرت بها النتاجات الـكردية فى ارمينيا السوفيتية .

واليوم وقداعد معهد الاستشراق في جامعة لينينگراد نتـاجات ي. أ. اوربيلى لتجد سبيلها الى الطبع والنشر وهى :

١ – قاموس كردي (لهجة منطقة مكس) ـ روسى .

٢ – طائفة من النصوص الـكردية جمعها المؤلف من منطقة مكس وبعض مناطق ارمينيا السوفيتية .

٣– تصريف الافعال في اللغة الـكردية .

٤ – آراء ونظرات ي. أ. اوربيلى بشأن تاريخ الـكرد وتراثه ... ومواد أخرى .

وختاماً فان لـ ي. أ. اوربيلى من الفضل على الشعب الكردي في دراسة تراثه والسعي لاحيائه مايستحق منه كل اكبار واجلال .

* * * * * *

# بوژاندنەوەی زمان

ئەندامی کارا : پاکیزە رەفیق حیلمی

زمان وەك مرۆڤ گیانلەبەرە . دەزێ ، دەژی ، دەمرێ .
لە ماوەی ژیانیدا وەك مرۆڤ ساغ و ناساغ دەبێ ... لاواز دەبێ ،
بەڵکو دەردی گران گرانیش دەگرێ ، لەت لەت دەبێ ، زاری
تازە و پەراگەندەی لێ پەیدا دەبێ ، زاری سەردەمی هەڵ دەدا و
بەرز دەبێتەوە و رەگی پتەو چەسپاو دەبێ و ، دەبێ بە شالقی ئەو
زمانە کە لێی دەکەوێتەوە ، و لقەکانی تر لە دەوری بە مەلاخ و
مەغزی دەژین و لە رەچەڵەکی دەڕوێنەوە .

هەر وەك مرۆڤیش زمان دەستوور و رێ و رێچکەی تایبەتی
خۆی هەیە ، کە لە مردن دەی پارێزێ ، و ناو بەناو گڕی ژیانی هەڵ
دەکاتەوە و دەی بوژێنێتەوە ، ئەگینا کۆسپی ئەوتۆی دێتە رێ
کە ناوی لە کایەدا نەهێڵێ و بە ئاسانی بێ هەنگیوێ .

ئەم دەستوور و رێ باز و رێچکانەی زمان ، وەك چوارچێوەیەکی
هەڵکەوتوو کە زۆر دوورە لە دەست کرد و دەست کاری زمان لە

قاڵبێکی سەربەخۆی تایبەتی دەگرێت و ڕێگەی ئەوە دەگرێت کە لە ڕێی ئەو کۆسپانەی ڕێی ژیانی لێ دەگرن ڕەسەنی خۆی بدۆزێتێ .

/ بە سەرنجێکی زانایانەی زمانشوناس ، ئاشکرا دەبێ کە زمانی کوردێ یەکێکە لەو زمانانەی کە قاڵبێکی فراوان و بە پێزی بۆ ژیان و بوژاندنەوەی خۆی سازکردوە کە لە تێهەڵکێشی دوو قاڵبی ناسراوی زمان پەیدا دەبێ ، ئەویش ( قاڵبی لکێن ـ Agglutinative الصاقي ) . ( قاڵبی دازێژ ـ Analytie اشتقاقی ) پێك هاتوە /

واتە زمانی کوردێ دەتوانێ بۆ سازکردنی دەستوور و ڕێبازی ژیانی ، و هەروەها بوژاندنەوە لەم قاڵبە زمانەدا بە سوکێ و ئاسانێ و بێ مەترسێ هەڵسوڕێ و بژی و ببوژێتەوە[1].

ئینجا لە کاتێکدا زمانێك وەك زمانی کوردێ ، لە کۆڕی پێش کەوتن دوربکەوێتەوە و کرژ بێ ، و لە کار بکەوێ و لە ناو خۆیدا بچروسێ ، زمان شناسانی ئەو زمانە دەکەونە پشکنین و ئەو قاڵبەی تێیدا پەیدا بوە و دەژی و دەستوور و ڕێبازەکانی بەسەر دەکەنەوە و ئەوەی لە گەڕدایە سارێژی دەکەن و ئەوی لە کار کەوتوە دەی بوژێنەوەو ڕێڕەوی ڕوون دەکەنەوە . لەم کارەدا وردێ و چالاکێ و

(١) زمان لە ڕوی دەستور و ڕێ بازی پەیدا بون و ژینەوە دەکرێت بە چوار بەشەوە ٢ ـ زمانی لکێن ـ Agglut الصاقية ٢ ـ زمانی دازێژ ـ Analyt اشتقاقيه و تحليليه ٣ ـ زمانی گیر Isolating عازلة ٤ ـ زمانی لێك دراو Polysynthtic ترکيبية

دوربینێ و دەسەڵاتی زانایانەی بەرز لە زمانەکەدا زۆر پێویستە ..
دڵسۆزی و هەڵپە و لە خۆراپەرمۆن ، زمانەکە دەشێوێنێ و لە
قاڵبەکەی خۆی دەترازێنێ ، و لە رەسەنی خۆی لای دەدا ، کە
ئەمەش زۆر ترسناکە و لە باتی ئەوەی ببێ بە هۆی بوژاندنەوەی
زمانەکە رایەڵی دەپچڕێنێ و بەڵکو دەبێ بە هۆی فەوتانی .

وەك وتمان زمانی کوردی زۆر بە ئاسانی لە دوو قاڵبی زمانی
ناسراودا دەسوڕێتەوە ، واتە دەستور و رێ‌بازێکی زۆر بەرپان و
بەپێزی هەیە بۆ ئەوەی هەر لە ناو خۆیدا بەتیرێ هەموو پێویستێکی
بیر و هۆش بگرێتە خۆی و باسی بکا ، تەنها ئەوەیە لە بەر
کەم‌تەرخەمی خاوەندەکەی چروساوە و پێویستی بە بوژانەوەیە ...
دەستور و رێ‌بازی ئەم دوو قاڵبە زمانیەش زانراون و ئاشکران
لە نێو زمان شناساندا ! واتە ئەوانەی لە زانستی زماندا شارەزان .
نەك ئەوانەی شارەزای زمانی کوردین ! دەیزانن ! هەرچەند باڵا و
بەرز بێ زانینی زمانی کوردی ، بێ شارەزایی لە زانستی زمان ،
هەڵەیە ئەو شارەزایە لە کۆڕی بوژاندنەوەی زماندا بکەوێتە رمبازی .
چونکە هەر زمان شناسە نێوانی دەستور و رێ‌بازی زمان
بدوزێتەوە بە پێی ئەو رێ‌بازانەی بۆی دانراوە نەك بە پێی لێك
دانەوەی سەربەخۆی خۆی ! بەڵێ ... دەشێ ... هەندێ رێ‌باز
بەدی بکات ، بەڵام بە وێنەیەکی نازێك و ناساز و بێ سەر و بێ و
پچڕپچڕ ... کە ماوەیەکی دوور و درێژی پێ دەخایەنێ و ئەنجامێکی

ئەوتۆ ناگەیەنێ ، و دەش بێ بەسەربەشە و گێچەڵێك بۆی کە هەر سەری لێ دەرنەکات ...

زانستی زمان زانستیەکە بەرهەمی صەدەها زانای زمانە و تەرخانی صەدەها رۆژ و شەوی لێکدانەوە و ئاڵ و گۆڕ و بەراورد و دەستور سازییە و بوە بە رێی رەوێکی راست و رەوان ، پێویستە بۆ ئەوانەی دەست درێژ دەکەنە نێو زمان و رمبازێ تێدا دەکەن ئاگاداری دەستور و رێی رەوی ئەو زانستیە بن . نەك لە خۆیانەوە خۆیان بهاوێژنە ئەم گۆمە قوڵە و نقوم ببن !

زمانی کوردی بە پێی ئەو دوو قاڵبە زمانیەی تیایاندا دەژی دەستوری ژیان و بوژانەوەی خۆی داناوە و زۆر بە ئاسانی زمان شناس دەتوانێ هەمویان بەسەرکاتەوە و ئەوی لە گەڕدا نەماوە بیخاتەوە گەڕ و بە کاری بهێنێ بۆ بوژاندنەوەی زمانەکە .. لێرەدا زمان شناس ، شارەزا دەزانێ لە کوێوە دەس بەرێ و لە کوێ بوەستێ و چۆن بجوڵێتەوە . کوێرانە بەم لا و ئەو لادا سوڕ ناخوات و لە بەر تیشکی رونی زانستی زماندا بە دانایی و ژیری و پسپۆڕی دەجوڵێتەوە و هەنگاو بە هەنگاو و پلە بە پلە کاری خۆی دەباتە سەر . بەم جۆرە ماوەی کەمتر دەخایەنێ و هەڵەی کەمتر دەکا و بە ئەنجامی راست و ساغ تر دەگا .. لەوانەی بێ رێی رەوی زانستی زمان خۆیان لەم گۆمە دەهاوێژن .

زمان وەك وتمان گیان لەبەرە ، هەمو زمانێك مێژوی ژیانی

خۆی هەیە کە لە کاتی پەیدا بوونیەوە و ناسینیەوە دەست پێ دەکات تا ئـەو کاتە باسی دەکرێت‌تیادا . لە ماوەی ئەو مێژووەدا دیارە وەك هەموو گیان لەبەرێك هەموو جۆرە بە سەرهاتێـکی ژیانی بەسەر دێ ، وەك نەخۆشی و ساغی ، کزی و لاوازی و زاری تازەی لێ پەیدا دەبێ ، هی کۆنی دەفەوتێ ، وشـەی بێـگانەی تێ دەکەوێ ، خۆ ماڵی بزر دەبێ ، گەردانی لە رایەڵ لادەدا ، دەنـگی دەگۆزدرێ ، دەنـگی تازەی تێـدا پەیدا دەبێ ، لەبەر ئەوە لە کاتی لێك‌دانەوە و پشکنینی دەستووری رێ‌زمانەکەی ، و تێ کۆشین بۆ بوژاندنەوەی ، و گیانی تازەی بەتینی بە بەرداکردن ، پێویستە ئەو بەســـەرهاتنانەی مێژووی ژیانی بزانرێت و روون بکرێتەوە .

زمانشناس لێرەدا و لە کاتی لێك دانەوەی رێ‌زمـانی زمانێـکی وەك کوردی ، کە خاوەندی مێژوویەکی دوور و درێژە ، بەڵام لاپەڕەکانی هەموو تاریك و لێڵ و پەرش و بڵاوە پێویستی بە ئەرکێـکی زۆر گرانە ، نەك هــــەر لە وردبوونەوەدا لە زمانەکە لە دیمەنی ئەمڕۆیدا بەڵـکو لە هەموو لاپەڕەکانی مێژووی ئەو زمانە و هەموو زمانەکانی هاوڕەگەزن لەگەڵیدا ، یا هاوسنوورن و لە یەك رەگەز نین . . هـەر وەها پێویستی بە ئەرکێـکی گرانە لە لایەکی‌ترەوە کە دەبێ لە هەموو ئەو بەسەرهات و گۆڕین و پەیدا بوونی شێوە تازانە و فەوتانی شێوە کۆنانە نەبێت کە روو دەدا لە مێژووی ئەو زمانە ، و بە هۆی بەراوردکردنی لاپەڕەکانی مێژوو و دەســتوور و رێ‌بازی زمانەکە لەو

لاپەڕانەدا دەتوانێ بکاتە سەرچاوەی ڕوَنی زمانەکە و ڕێی زمانی ساغ و پتەو ، و پەسندی بدۆزێتەوە ئینجا ریزی کا لە سەر کاغەزا .

لێرەدا زمان شناس کوێرانە ناجوڵێتەوە، سێ ڕێ‌ڕەوی داناوە بۆ خۆی و بە بێ هەڵە و دەست کوتان دەیان گرێت و زمانی ناوبراوی پێ ورد دەکاتەوە. ئەم سێ ڕێگەیە ئەمانەن :

١ ـ لێکۆڵینەوەی زمانێ لە دیەنی ئەمڕۆدا کە بەشێکە لە زانستی زمان پێی دەڵێن : Discriptive .

٢ ـ لێ کۆڵینەوەی مێژوَی زمان کە ئەویش بەشێکی تایبەتی تری زانستی زمانە و لە مێژوَی ژیانی زمان دەکۆڵێتەوە و پێی دەڵێن : Historical Philology.

٣ ـ لێکۆڵینەوەی بەراوردی زمان کە زمان و زارەکانی بەراورد دەکات ، یان لە ناو خۆیدا ، یا لەگەڵ زمانانی هاوڕەسەنی یا بێگانە... بەم بەشە زانستی زمانەش دەڵێن : Comparative Philology.

زمان شناس لەم سێ ڕێگەیەی زانستی زمان سنوری بۆ ئاشکرا کردوَن . لە هەمو گۆشەیەکی زمان دەکۆڵێتەوە کە ئەو گۆشانەش ئەمانەن :

١ ـ گۆشەی دەنگەکانی زمان و هەڵکەوتنیان و شوێنی دەربڕین و چۆنێ دەربڕین ، ژمارەیان ، لێك چونیان ، هۆی تێك چوَن و گۆڕین و ئاڵ و گۆڕیان ..هتد بەم بەشەی زمانیش دەڵێن :

(زانستی دەنگ ـ دەنگ سازی ـ علم الاصوات اللغوية Phonetics)

٢ـ گۆشـــەی هەڵ کەوتی وشەی سەرەتا ، داڕشتنی وشەی تازە ، و کێش و سەنگی وشە و تەرازوی کێشەکان . بەم بەشەیش دەڵێن : (زانستی وشە ـ وشە سازی ـ علم المفردات Morphology) .

٣ـ گۆشـــەی داڕشتنی رستە و دەوری وشە لە رستەدا بەم بەشەش دەڵێن : (رستە سازی ـ نحو اللغة ـ Syntax)

با بگەڕێینەوە سەر زمانی کوردی و رێ رەوی لێ کۆڵینەوە و بوژاندنەوەی . وتمان زمانی کوردی لە دوو قاڵبی زمانیدا شوێنی خۆی کردۆتەوە و لە دەستوری هـــەر دوو قاڵبەکە سودی وەرگرتوە بۆ پاراستنی خۆی لە فەوتان ، و دانانی رایەڵی بنـــاغەی دەستوری رێی زمانی ... ئەم دوو قاڵبـــەش یەکێـکیان قاڵبی زمانە لکێنەکانە ئەوی‌تر قاڵبی زمانە داڕێژەکانە . هەروەها پێـش ئەوەش گەلێ جار وتبومان زمانی کوردی لە خێزانی گەورەی هندو ئەوروپی و بە تایبەتی لە بەشی ئێرانیە/. ئەم خێزانەش گەلێ هەڵکەوت و سروشتی تایبەتی هەیە کە لە ناو هەمو زمان شـناسەکاندا ناسراوە و زانراوە ، و بەدی کردنی لە هەر زمانێـکدا خزمایەتی بەو خێزانە دەنوێنێ .

ئینجا ئەگەر زمانشـناسێك وێستی زمانێـکی وەك کوردی لە هەمو گۆشەیەکەوە واتە دەنـگ ، وشە ، رستە ، ساغ کاتەوە ، ئەو دەسـتورانەی بە تایبەتی خێزانی هنـدوئەوروپی و بەش بە ئێرانیـە

لە لایەکەوە و ئەو قاڵبانەی زمانەکە تیایاندا مەیوە ورد دەکاتەوە و بەگوێرەی ئەو رایەڵە و کێش و ترازوانە زمانی کوردی دەپێوێ ، و بناغەی دەستورەکانی دادەنێ .

بۆ نموونە دەنگەکانی زمانی کوردی بە پێی زانستی زمان ، زمانە هندوئەوروپاییەکان زۆریان دەنگی قورگیان نیە وەك ( ح ) ( ع ) ، دەنگی بن قورگیان هەیە وەك ( ء ـ هەمزە ) و ( ه ) . ئەگەر هاتو وشەیەکی بێگانە ئەم دوو دەنگەی تێدا بو دەی گۆڕن بە ( ء . هەمزە ) یا ( ه ) ع = هەمزە وەك عین = ئین . عراك = ئراك . عمر = ئومر . ح = ه = وەك حمار = همار . حیوان = هیوان . حدیث = هدیث . کەچی دەبینین ئەم روداوە لە کوردیدا رونادا و ئەم دوو دەنگە بە ئاسانی دەردەبڕدرێن لە کاتێکدا کە لە ( فارسی )دا کە هاوڕەسەنی کوردییە دەگۆڕدرێن . ئەمە روداوێکی ( زمانی )یە زانای زمان لە سەری ناوەستێ بێ ورد بونەوە و دەگەڕێت لە مێژوی زمانەکەدا بۆ بەڵگە و لە ئەنجامی بەراوردێکی مێژوی ئێرانیەکان و زمانە سامیەکان دەگاتە هۆی ئەم جیاوازییەی نێو فارسی و کوردی لە دەنگ گۆڕیندا .

هەر وا بە دیمەن و رواڵەت کوردی زان دەڵێ دەنگی ( ذ ) و ( ث ) لە کوردیدا نیە لە کاتێکدا ئەم دوو دەنگە لە زوربەی زمانە هندوئەوروپاییەکانی هاوخێزانیدا هەن . بەڵام زمانشناس بەم دیمەنە دڵی ئاو ناخواتەوە و بەراوردێکی زانایانە سۆرێك دەخوا لە ناو

زارەکانی زمانی کوردیدا و دەبینێ ئەم دوَ دەنگە لە زاری هەورامیدا (ماون) و دیارە بەسەرهاتی مێژوَ لە زارەکانی تردا فەوتاندوَنی و گۆڕیونی . لێرەدا زانای زمان بە هۆی زانستی دەنگ و بەراوردی دەنگەکانی زمانی کوردی بە درێژایی مێژوَ بۆی ساغ دەکاتەوە کە ئەم دوَ دەنگە لە پلەیەکی دێرینی مێژوَی زمانی کوردی رەسەن بوَن و مانەوەیان لە هەورامیدا نەك هەر رەسەنی ئەم دوَ دەنگە لە زمانی کوردیدا ئاشکرا دەکا بەڵکو بەڵگەن بۆ ئەوەی هەورامی بە کۆن ترین زاری کوردی بزانرێت .

دیسان بە دیمەن و رواڵەت لەو زارە کوردیانەی هاتوَنە نوَسین لە کۆمەڵی ناوەڕاستدا دەنگی (ڤ) (ص) (ط) نیە و لە زارەکانی کۆمەڵی سەروَ دەنگی (ڵ) نیە بەڵام ئەگەر وردبینەوە دەبینین دەنگی (ڤ) ، وەك ڤنگە و تاڤگە (ص) وەك صەد ، صال (ط) وەك شەط لە گەلێ وشەی پەتی زارەکانی ناوەڕاستدا ماون ، بەڵام بە زۆر مردار کراونەوە چونکە ناشی لە گەڵ فارسیدا لێکی نەکردۆتەوە لە نوَسیندا و لە بەر ئەوەی لە نوَسینی فارسیدا بە دی نەکردوَن فەرمانی داوە بکۆژرێن و لە نوَسیندا نەمێنن ، هەروەها لە گۆکردنیشدا وردە وردە بفەوتێن ! . زمانشناس ئەمە پەسند ناکا و چۆن دەنگە کە بە رەوانی دێتە گوێی تۆماری دەکا و دەڵێ ئەم دەنگانە لە کوردیدا رەسەنن کەوا بوَ دەبێ بخرێنە ئەلف و بێی کوردی یا لە فارسیدا نەبن ، باشتر چونکە ئەمە بەڵگەی

سەربەخۆیی کوردییە و لە فارسی جودا دەکاتەوە .

بەم جۆرە زمانشناس لە هەمو دەنگێکی زمانی کوردی ورد دەبێتەوە و بەراوردی زارەکانی کۆن و تازە دەکا لە نێو خۆیاندا و لەگەڵ زمانە هاوخێزانەکانی تاوەکو بە تەواوی هەمو دەنگێکی بەر گوێی دەکەوێ تۆمار دەکا و ساغی دەکاتەوە ئەوسا ئەلف و بێی تەواوی پڕ بە بەری خۆی بۆ دادەنێ . بەڵام کوردی زان هەر لە چوارچێوەی تەسکی بەرچاو و رواڵەتی زمانەکە دەسوڕێتەوە لە بەر ئەوە هەمیشە بەرهەمی کرچ و کاڵە و پەرش و بڵاوە و بێ رایەڵ و شیرازەیە .

دیسان وەك وتمان زمانشناس بە ئاسانی دەزانێ لە چە قاڵبە زمانیەکدا لە لایەن ( وشەسازی ـ Morph ) یەوە ، بۆ دەستوورێ لە زمانی کوردیدا بگەڕێ . چونکە دەستوری وشەسازی لە چاو زمانشناسدا بە گوێرەی قاڵبە زمانیەکان رۆن و ئاشکران ، و بە سەرنجێکی ورد لە زمانی کوردیدا بۆی دەردەکەوێت لە کام قاڵبدا خۆی گرتوە و مەیوە . و بێ سەر لێشێوان هەمو کێش و تەرازوو و رایەڵ و شیرازەیان دەدۆزێتەوە و ریزیان دەکا دوا بە دوای یەك . کوردی زان دەبێ راو لە تاریکیدا بکا و هەر دەمە شتێکی بە دەستەوە بێ .

زمانی کوردی وەك بە دیمەن دیارە ، و بە سەرنج و وردبونەوەی زمانشناس ساغ بۆتەوە . وەك هەمو زمانێکی ناسراو و نوسراو دوو

جۆر وشەی سەرەتایی تێدا هەڵ کەوتوە ! ١ ـ ناو ـ الاسم ـ The noun . بە هەمو بەشـــەکانیەوە . ٢ ـ فرمان ـ الفعل The verb . بە هەمو کات و گەردانیەوە .

ئەم دوَ جۆرە وشەیە لە سەرەتادا لە شـــێوەی سادە و بڕگەی کورت ، یەك یان دوَ پەیدا بوَن لە دوایێدا پێویســتی بەکار هێنانی زمان ، و دامان لە سەر وشەی تازە و زۆر بۆ مەبەس و واتای فراوانتر ، هەر زمانە لە ناو خۆیدا کەوتۆتە زا و زێی لە چوارچێوەی قاڵبێـکی تایبەتیدا کە تیادا مەیوە و پێی ناسراوە . . . هەندێك ئەم قاڵبەی بە لکاندنی بڕگەی تازە بە وشە سادەکەوە سازاندوە و بڕگەکەی بە گوێرەی پێویست و واتا و ســروشتی زمانەکە ناوە بە پێش یان پاش وشـــە ســادەکە یا کردوَیەتی بە ناو ئاخن بۆی . زمانە هنــدوئەوروپاییەکان لەم شێوەیە ســوَدیان زۆر وەرگرتوە و زوربەی زمانی ئەم خێزانە بە ( زمانی لکێن ـ الصاقیة ) دادەنرێن . وەك ئەڵمانی و ئینگـلیزی و هەروەها فارسی و کوردی .

هەروەها هەندێکی تر لە زمانان بە گوێرەی تەرازو و کێشی تایبــەتی بناغەی وشەکەیان گۆڕیوە بە هۆی یان گۆڕینی دەنگــە بزوێنەکان یان زیاد کردنی چەند دەنگێك ـ یەك ، یان زیاد تر یا خود بە گۆڕینی دەنگ و زیاد کردن . . بەم جۆرە قاڵبەش وتـراوە ( قاڵبی داڕێژ ـ اشـــتقاقی ) و ـــکە تایبەتیەتی زمانەکانی ( عەرەبستان ـ

سامیەکان )[٢]

دیسان زمانی کوردیی لەم قاڵبەش سوودی وەرگرتوە و بۆ زاو زێی ، گەلێك كێش و تەرازوی داناوە بە تایبەتی بۆ داڕشتنی ناو لە فرمان ... وەك چاوگ کە بە هۆی زیاد کردنی مۆرفیمی چاوگی (ن) و دروست کردنی ناوی فرمانی بۆ کەسی کار کردە ـ اسم الفاعل ، و پێکراو ـ اسم المفعول .. هەروەها بۆ گەردانی فرمان و گۆڕینی فرمان ( تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ) بە زیاد کردنی ( ند ) و گەلێ شتی تر چە لە بابەتی وشەی ناو چە لە بابەتی وشەی فرماندا . بەم جۆرە وەك وتمان ؟[زمانی کوردیی ماوەیەکی پان و بە پێزی لەم دوَ قاڵبەدا هەیە و دەتوانێ بە ئاسانی لە ناو خۆیدا بە شێوەیەکی زۆر کوردیی و رەوان خۆی ببوژێنێتەوە و ببوژێنرێتەوە ... تەنها یەك مەترسی ئەوەیە نە شارەزا و ناشی بکەوێتە ئەم کارە ، ئەوساکە هەمو رایەڵ و شیرازەی ئەم دوَ قاڵبە دەپچڕێ و لە باتی ئەوەی زمانەکە زندوَ بکرێتەوە لە قاڵبی تایبەتی خۆیدا ... پەرش و بڵاو دەبێتەوە و بێ رایەڵ و شیرازە دەمێنێ و هیچ قاڵبێکی زمانی نای گرێتە خۆی و دوَریش نیە لە ماوەی زەماندا ببێ بە زمانێکی ناچیزە و بێ رەسەن]. یان هەروەك شێوەی پەراگەندە لەت لەت ببێ و بتوێتەوە لە زمانەکانی دەور و پشتیدا .

---

(٢) د. باکزە رفیق حلمی . لغات الجزیرة العربیة ام اللغات السامیة .
مجلة المجمع العلمي العراقي المجلد الرابع والعشرون .

تا ئیستە لەم روەوە نەم دەویست بێمە (دوَ ـ قصه) . چونکە نەم دەویست ، کەس دڵ گیر کەم ، و چاوەڕوان بوَم هەر کەسە خوَی شوێنی خوَی بناسێت ، و مەیدانی رمبازێ و سوار چاکێ خوَی بدوَزێتەوە و کەس چنگ نەخاتە کاری شارەزایان و سەر لەخەڵك بشێوێنێ . بەراستێ و راستێ گوناه نیە . لە کورددا زوَر کەم کەس هەن بتوانن لە روَی زمان شناسێ راست لە گەڵ زمانی کوردێ خەریك بن ، ئەمەش لەبەر بێ دەسەلاتێ کوردە زاناکان نیە بەڵکو لەبەر نالەباری زانستێ و خوێندنی بەرز ، و کەم تەرخەمێ نەتەوەی کورد بە گشتی لە روَی خزمەتی زمانەکەیەوە ، و کەمێ کەرەستە و تازەیێ زمان شناسێ و دوریمان لە کوَڕی زانستیەکانی زمان ، کە بوَن بە هوَی پەیدا نەبوَنی زانای بەرز لەزانینی زماندا بە گشتی و لە زمانی کوردیدا بە تایبەتێ ، ئەوەی خودا یاریدەی داوە و دەستی بەم جوَرە زانستیانەدا گەیشتوە زوَر کەم بوَن و بە شێوەیەکی تا سەر نەبوە . بلیمەتێکی بێ هاوتای وەك ماموَستا (توفیق وهبی) کە یەکێکە لە زانا هەرە بەرزەکانی نەك زمانی کوردێ بەڵکو زمانە ئێرانیەکان لە جیهاندا دەتوانین بە سوارچاکی ئەم مەیدانە دابنێین[٣] ئەنجامی هەوڵ و تەقەلا و کوَششی

(٣) ماموَستا توفیق وهبی زانایەکی جیهانییە و جێی شانازێ کوردە . چونکە یەکەم کوردە لە روَی زانستی زمانەوە لە زمانی کوردێ بکوَڵێتەوە و بدوێ و بەراوردی بکا لەگەڵ زمانەکانی هاو رەسەنێ و رێچکەی مێژوَی بپشکنێ .. هەزارەها لاپەڕەی پڕ کردوَتەوە لەم بارە و صەدەها وتاری

لە پەنجا ســاڵ زیاد تر تەمەن ، و شارەزایی لەگەڵی زمانی تازە و کۆنی نزیك بە کوردی وەك پەهلەوی و سانسکریتی و ئاڤێستایی و فارسی ، و دوور لە کوردی وەك ئینـگلیزی و فرەنسزی و ئەڵمانی و تورکی و عەرەبی . و تێـکەڵ زانا هەرە بەرزەکانی زانستی زمان و مێژوو . و زەکا و دووربینی و وردی و نەبەزینێـکی بێ هـــاوتا و خۆبەخت کردنێـکی دڵسـۆزانە تا ئەم تەمەنەی کە لە هەشــــتا تێ پەڕیوە ، کەچی لەگەڵ ئەو هەموو توانا و دەســــەڵاتەدا زۆر لە سەر خۆ و هێمن و ورد دەجوڵێتەوە و هەنـگاو لە شوێنی پتەودا نەبێ هەڵ ناهێنێ . وەك (تازە زان)ی ئەمڕۆ هەڵپــە ناکا و باز بەم لاو ئەو لادا نادا . و بە خۆڕایی (زمان بازی) ناکا و ســەر لە خەڵك تێك نادا . و هەروەها لاپەڕەی خۆڕایی پڕ ناکاتەوە و بڵاوی بکاتەوە و خەڵـکی پێ سەرسام بکا ... تا ئیستەش بۆ تەنها یەك دانە وشە دەیەها فەرهەنـگی کوردی و زمانانی نزیك و دووری کۆن و نوێی دەگەڕێ هەتا بنج و بناغەی و ریشە و رەسەنی ئەو وشەیە ساغ دەکاتەوە ، ئنجا دەی خاتە سەر کاغەز و تۆماری دەکا .

/ مەبەس لە بوژاندنەوەی زمان ، زندوو کردنەوەی ئەو رەگ و ریشانەیە کە چرووساون و لاوازبوون ، و راست کردنەوەی ئەو رایەڵانە

= لە سەر نووسیوە بە کوردی و بە عەرەبی و بە تورکی و بە ئینـگلیزی . لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین ( یانبی ) و ( سیبویە ) ی کوردە بەراستی . کە لە سالی ١٩٢٠ ەوە تا ئیستە بێ وچان زمانی کوردی دەبوژێنێتەوە .

چەوت بۆن یا دۆزینەوەی ئەوانەی بزر بۆن ، و گرتنەوەی ئەو شیرازانەیە بچڕاون و بەستنەوەیان ، بۆ ئەوەی زمان بچێتەوە ئەو قاڵبە تایبەتیەی خۆی کە پێی ناسراوە و تیادا مەیوە/. نەك بەردانی رایەڵ و بچڕاندنی شیرازە و تێك دانی کێش و ئەندازە . ئەم کارەش کاری زانای بەرزە لە زمان شناسیدا نەك زمان باز ! .

وشەی بوژاندنەوە لە ( بۆز ) ی ئێرانی کۆن ( میدی - پەهلەوی ) وەرگیراوە بە مانای ژیاندنەوە و زندوکردنەوە . زمانیش وەك وتمان (زنـــدەکە - حي) دەژی و دەمرێت ، مردنی زمانـ لە کار کەوتن و بەکار نەهێنانیـــەتی ، کە دەبێ بە هـــۆی لە بیر چونەوەی گـەلێك دەســـتور و رێ‌رەوی و بزر بونی زۆر لە وشەکانی سەرەتایی و بچڕاندنی گـەلێـك رایەڵ و بڵاوبونەوەی رشتەی . هەروەها لە ئەنجامدا کـز بون و چروسانی و بەڵـکو فەوتانیشی .

خاوەند زمان ناچار دەبێ لە کاتێـکی وەهادا ، یان دەسـت لە زمانەکەی هەڵ گرێت ، زمانێـکی بێگـانە بەکار دەهێنێ بـۆ ئەوەی خۆی بکەیەنێ بە چەرخی هەر لە سەرەی بێ پشوی ژیانی زانست و پێش کەوتوی ئەمڕو و لەمەو دوای بەشەر کە زمانەکە لە سەر دەخا و لە شوێنی خۆیدا مرداردەبێتەوە . یاخود بکەوێتـە زندو کردنەوە و بوژاندنەوەی زمانەکە ئەمەش کارێـکی ژیرانە و زانایانەی دەوێ وەك لە سەرەتادا وتمان بە زمانشناس نەبێ و لەو رێ بازانەی دانراون لە

زانستی زماندا نەبێ دەرباز نابێ وەك رونمان کردەوە.

/ زمانی زندو و کارا دو شێوەی هەیە. بیستراو و نوسراو، هەروەها خاوەند مێژووە ./. ئەگەر مێژووەکەی رەوان و بێ ئاڵۆز بێ و بێشایی و پەڵەی تاریکی تێدا نەبێ و لەگەڵ پێویستی ژیانی پێش کەوتوی بەشەر شان بە شان رۆیشت و وێنەیەکی راست و خاوێن و تەواوی بیر و هۆش و هونەری خاوەندەکەی دەرخست ئەوا زمانێکی ساغە و هەر تەنها بە کارهێنانی بێ وچانی دەی ژیەنێ، ئەگەر کەم و کورتی هێنا و بەر تەسك بێ ئەوا پێویستی بە وردبونەوەیەکی دور و درێژە لە مێژوی ژیانیدا و لێکۆڵینەوە و پشکنینی بلە بە پلەی لەم هەمو ئەو کۆشانەی لە پێشەوە باسمان کرد واتە کۆشەی دەنگ سازی و وشەسازی و رستە سازی بە شێوەیەکی دیەنی و مێژویی و بەراوردی.

بێ گومان هەمو کوردێك پێی لەوە دەنێ کە زمانی کوردی لەو زمانانەیە کە پێویستی بەم ئەرکە گرانەیە، بەڵام بە داخەوە زانا و زمانشناسی زۆر کەمە... لەبەر ئەوە کەلێك ناشی و کەنج بە دڵسۆزی و هەڵپە و پەرۆشی زندوکردنەوەی زمانەکە کەوتونە گیانی زۆریان زیان لێ داوە و لێ ئەدەن. لە بەر ئەوە وا بە ناچاری هاتمە دو و ئەم چەند ساتمەیە(٤) دەخەمە پێش چاویان، تاوەکو پێش

---

(٤) ساتمە = زەلە.

بڵاوکردنەوەی نوسینەکانیان بە وردی پێیدا بچنەوە و نەبن بە هۆی سەر لێشێوانی خوێندەواران .

هەموو زمانێك شێوە و زاری سەردەمی هەیە ، کە هەر یەکێکیان مایەی گفتو و گۆی ناو خۆیە لە ناوچەکەیدا ، هۆی زۆر هەیە خاوەند زارێك لە خاوەند زارێکی تر نەگا بە تەواوی ، بەلام ئەم راستیە ئەو دوو زارە لە چوارچێوەی یەك زمان دەرناهێنێ ، هەر چەند هۆی لە یەك دوورخستنەوەیان دەبن بە دوو زمانی سەربەخۆ لە بەر کەلی هەستی وجدانی بێ گومان خاوەندی ئەم زارانە هەولی ئەوە دەدەن لە یەك نزیکیان بخەنەوە ، وردە وردە زارێکی گشتی پەیدا دەبێ کە لە هەموو زارەکانی تر زیاد تر بەکاربێت ، بۆ گفتو و گۆی نێوان گشت زارەکان ، بەم جۆرە زمانێك پەیدا دەبێ کە پەسندە لای هەموان و پێی دەڵێن زمانی پەسند ـ اللغة المختارە ـ الفصیحة ـ Standard Lang ئەم زمانە پەسند و هەڵ بژاردەیە دەبێ بە مایەی زمانی نوسراوی زمانی ئەو گەلە ، و لە شێوەی دیمەنی چەرخی بە کارهێناتیدا رێی زمانی بۆ ساز دەکرێت ، و زارەکانی دیکە لە شێوەی خۆیاندا بۆ گفتو و گۆ بە کار دێن .

زمانشناس کە دەستی کرد بە پشکنین و لێکۆڵینەوەی ئەم زمانە ئەو کەرەستە و مایەیەی بەدەستەوە دەبێ و لە کاتێکدا بیەوێ بەرهەمێکی خۆی بنوسێتەوە لە گۆشەیەکی زماندا بەو دەست مایەیە دەی نوسێ ، نەك هەر بەزاری گفتو و گۆی ناوچەکەی . چونکە

زمانشناس کە دەیەوێ رێی رۆنکەرەوەی نەتەوەکەی بێ ، و پێش رەوی وردەکاری و دوورینی خۆی لە زماندا دەرخات لە پێش هەمو کەسێکدا دەبێ خۆی بەندی ئەو زمانە پەسندە بێ کە پێی دەنوسرێ ، چونکە بێ گومان هەر ئەو زارە لە زارەکانی تر بە ئەندازەترە .

بەڵام بە داخەوە خوێندەواری کورد ، چە گەنج و چە کامڵ ئەوەندە بە هەڵپە و پەرۆشن بێ ورد بونەوە کەوتونەتە گیانی زمانی کوردی و هەر یەکە لە لایەکەوە بێ هیچ مایەیەکی زانستی ، چە لە زمانی کوردیدا خۆی چە لە زانستی زماندا ، رێی زمان بۆ کوردی دادەنێن و هەر یەکەش بە زاری ناوچەیی خۆی دەنوسێتەوە و لە خۆی وایە رێی زمانی کوردی دەنوسێ کەچی دەبینی بە سورداشی یا سنەیی یا رانیەیی نوسیویەتی و نازانێ ئەمە شێوەی زارێکی زۆر بچوکی ناوچەیەکی تەسکە . و بەم جۆرە نوسینانە ئەنجامی زمانی کوردی تێکچون و شیرازە بەربونە .

ئنجا بێینەوە سەر رێی زمانەکە خۆی و ساتمەی نوسەران لە روی هەڵپە هەڵپ و بێ مایەیی نوسەر .

مایەی زمان دەنگە ، دەنگیش بە پێی زانستی زمان دو بەشە ، بەشێکی لە گەرودا گیر دەبێ و لە دەربازێکەوە دەر دەبڕدرێت ... هەر دەنگەی دەربازێکی هەیە کە رەنگ و بۆی تایبەتی دەدا بە

ده‌نگه‌كه ئه‌م ده‌نگه خاوه‌ند ده‌ربازانه له زه‌مانی پانینی هندی‌یه‌وه[٥] ساغ كراونه‌وه و به زانستی زمانی ناویان Consonants ـ الاصوات الصحیحة ـ ده‌نگی ئاوازه . به‌شه‌كه‌ی تری ده‌نگ بێ ده‌ربازان و به ره‌وانی له‌گه‌ڵ هه‌وادا له گه‌روَ دێنه ده‌رێ به‌م وشه وتراوه Vowls ـ الأصوات اللینة ـ ده‌نگی بزوێن .

/ له جوت بوونی ده‌نگی ئاوازه و بزوێن بڕگه په‌یدا ده‌بێ دوَ یان سێ بڕگه بخرێنه یه‌ك وشه په‌یدا ده‌بێ به مه‌رجێك مانایه‌كی بدرێتێ ده‌شێ ته‌نها یه‌ك بڕگه‌ش مانــای هه‌بێ/. ئه‌م روداوه ته‌نها له لایه‌ن دیمه‌نی وشــه‌وه ... كه له هه‌موَ زمانێكدا روَ ده‌دات ... رۆڵی ده‌نگ لێره‌دا شه‌كلی و دیمه‌نییه ! ته‌نها ! و كاری نیه به سه‌ر (رێی زمان ـ نحو اللغة The Grammar-) ه‌وه . هه‌موَ ده‌نگه‌كانی زمان له‌م كاره به‌شدارن ، وه‌ك یه‌ك له هه‌مزه‌وه تاوه‌كو ی ! . ته‌نها ! ئه‌وه هه‌یه كه سێ ده‌نگیان دوَ كاره‌ن ، جارێك ئاوازه‌ن و جارێك بزوێن ، ئه‌ویش له زمانه‌كانی عه‌ره‌بیدا . چونكه ده‌نگی بزوێن له زمانه‌كانی تردا و هه‌روه‌ها له عه‌ره‌بیشــدا گه‌لێك له‌و سیانه زۆرتره به پێی ئه‌ندازه‌ی زمانشناسی . ئنجا ئه‌م سێ ده‌نگه هه‌ندێ جار ده‌بن به كۆڵه‌كه‌یه‌كی بناغه‌ی وشه و هه‌ندێ جار ده‌بن به بوار له نێــو دوَ

---

(٥) پانینی یه‌كه‌م زمانشناسی سانسكریتی بوه ، له سه‌ده‌ی ٥ ـ ٤ ی پێــش زاین ژیاوه و ده‌ستوری زمانی سانسكریتی داناوه . هــه‌روه‌ها به یه‌كه‌م زمانشناسی جهان دانراوه .

ئاوازەدا .. سێ دەنگەکەش (ئەلف و واو و یا)ن لە عەرەبیدا کە جارێك ئاوازەن و دەبن بە کۆڵەکەیەکی وشە ، خاوەند دەربازن ، وەك : یانە . یاسا . ورچ ئاش . ئاو . و هەندێ جار دەبن بە بوار لە نێو دوو ئاوازەدا ، وەك : پەڕ . سەر . پار . مار . شڕ . دڕ . شیر . میر . دڵ . زڵ . کورد . کوڕ . کۆن . ڕۆن . کوڕ . پوور .

ئەم سێ دەنگە لە کاتی بزوێنیدا بەشدارن لە داڕشتنی وشە و سازکردنی و رایەڵ و ئەندازەی پێوانی وشەی داڕێژراو لە زمانە عەرەبیەکاندا و رۆڵێکی گرنگیان هەیە لەو بەشەی زمان کە زمانشناسە عەرەبەکان پێی دەڵێن (علم الصرف والاشتقاق)[٦] .

لێرەدا دەنگ چە ئاوازە بێ و چە بزوێن کە هەر وەك دەنگێك بەشدار بێت لە بناغەی وشەدا پێی دەڵێن Phoneme ـ الصوت اللغوي) . و لە گۆشەی زانستی دەنگدا زمان شناس لێیان دەدوێ[٧] ، و بە تایبەتی دەنگشناس .

---

(٦) علم الصرف والاشتقاق لە کێش و ئەندازەی وشە بە دیمەن (هەڵکەوتوی و داڕێژراوی) دەدوێ .

(٧) زانستی دەنگ دوو پەلە . بەلێك تەنها لە دەنگ دەدوێ وەك رووداوێکی بیستراو لە سروشتەوە بە گشتی بێ ئەوەی رۆڵی لە زمانێکی تایبەتیدا باس بکرێت بەم زانستیە دەڵێن Phonetics . پەلەکەی تری لە رۆڵی هەموو دەنگێك دەدوێ لە زمانێکی تایبەتیدا و کاری شوێنی لە نێو=

سەرەڕای ڕۆڵی دەنگ لە بناغەی وشە بە تاکی . . دەنگ ڕۆڵێکی تری هەیە لە بناغەی ڕستەدا واتە لە ( ڕێی زمان ـ نحو اللغة ـ The Grammar ) دا ... لەم کارەیدا تەنها بە دەنگ دانانرێت ، بەڵکو بە وەحدەیەکی زمانی ( وحدة لغوية ـ Morpheme ) ئەگەرچی زۆر جار لە شێوەی تەنها دەنگێکی تاکدا بەرچاو دەکەوێت دەشێ پاشماوەی بڕگە یا هەر وشەیەك بێت و فەوتابێ و لە بیرچوبێتەوە . ئەم دەورەی دەنگ لە زماندا کاری بەسەر دیمەن و شێوەی وشەوە نیە و لەگەڵ ڕێی ڕەوی زمانی و جۆری داڕشتنی ڕستە دەگونجێ کە لە عەرەبیدا پێی دەڵێن ( علم النحو ) و باسی مانای وتە دەکا نەك کۆکردن .

زمانشناس زۆر باش ڕۆڵی دەنگ لە ( علم الصرف ) و ( علم النحو ) دا لێك دەکاتەوە و ناکەوێتە ئەو هەڵەیە ئەم دوو کارەی دەنگ لە زماندا تێکەڵ کا .. بێ سەر و شوێن . بگرە هەموو دەنگێکی زمان دوو کارەیە . ئەمە یەکێکە لەو ساتمانە کە هەندێ زانای بەرزی تێ دەکەوێ لە ڕوی کەم شارەزایی لە زمانشناسیدا .

دوو جۆر فرمان هەیە لە زماندا لە ڕوی تین و توانای ( فرمانکردە ـ Agent ـ فاعل ) . یەکێکیان : هەر تەنها ڕوداوێکی بێ هێزە لە فرمان کردەکە ڕوو دەدا . یان بە دەسەڵاتی خۆی

---

= دەنگی تردا و ئەو گۆڕینەی بە سەری دێ لەو کانەدا بەم پەلەش دەڵێن Phonology .

(الافعال الارادیة) وەك نوست . رۆیشت . هـــات ، یان بێ دەستەڵاتی (أفعال الحدوث) ، وەك روَخا ، سوتا ، شكا . بەم بابەتە فرمانە دەڵێین (لازم ـ Intransitive ـ بێ هێز) . دوَهەمیان : بە هێزە و فرمانكردە ، فرمانەكەی بە ســەر كەسێك یا شتێك دێنێ و نای گرێتە خۆی وەك : نوستی ، كوشتی ، خواردی . بەم بابەتەش دەڵێین (متعدي ـ Transitive ـ بەهێز) .

لە بابەتی دوَهەمدا دوَ شێوە دەبینین لە هەموَ زمانێكـــدا ، یەكێكیان (فرمانكردە ـ فاعل) ئاشكـــرایە وەك (نوستی) . بەم شێوەیە دەڵێین (Active ـ مبني للمعلوم) . ئەوی تریان فرمانكردە ئاشكرا نیە و (فرمـــان پێكراو ـ Accusative ـ مفعول بە) لە شوێنی دیارە ، وەك : (كـــوژرا) ، (نوسرا) ، (خورا) . بەم شێوەیە دەڵێین (Passive ـ مبني للمجهول) . (فرمانی لازم ـ بێ هێز ـ Intransitive) تەنها شێوەی یەكەمی هەیە ، شێوەی دوَهەمی لێ دروست نابێ ، چونـكە هەر لە رەچەكدا[8] (فرمان پێكراو ـ مفعول بە) نیە .

بەڵام هەموَ فرمانێـكی (لازم ـ Intransitive ـ بێ هێز) لە كوردیدا هێزی پێ دەدرێ بە هۆی مۆرفیمێـكی تایبەتی كە دەتوانین ناوی بنێین (مۆرفیمی هێز ـ أداة التعدیة) كە دەبێتـــە ناوبەند

(٨) رەچەك = ئەصل .

Infix[٩]) دەکەوێتە نێو فرمانەکە و مۆرفیمی راناو ، وەك :

سوتا + ند + ی = سوتاندی .

خنکا + ند + ی = خنکاندی

جوڵا + ند + ی = جوڵاندی

رۆخا + ند + ی = رۆخاندی

هەروەها لەگەڵ هەمو راناوەکان گەردان دەخوا ، بۆ نمونە

| | | | |
|---|---|---|---|
| سوتا | سوتاندی | پژمێ | پژماندی |
| سوتای | سوتاندت | پژمێت | پژماندت |
| سوتام | سوتاندم | پژمێم | پژماندم |
| سوتان | سوتاندیان | پژمێن | پژماندیان |
| سوتان | سوتاندتان | پژمێن | پژماندتان |
| سوتان | سوتاندمان | پژمێن | پژماندمان |

ئەمە لە کاتێکدا فرمان بە (رایەڵ ـ قیاسي ـ Regular) بێ
بەڵام ئەگەر فرمان (بێ رایەڵ ـ شاذ ـ Irregular ) بێ . . .
بە گوێرەی پێویستی دەنگ رایەڵ دەگۆڕێ ، وەك :

(٩) Infix ـ ناوبەند . Suffix ـ پاش بەند . Prefix ـ پێش بەند
بە هەموویان پێکەوە دەڵێن Affixes .

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| نۆست | نواندی | هات | هاوردی ، یاخو | هێنای |
| نۆستیت | نواندت | هاتیت | هاوردت | هێنات |
| نۆستم | نواندم | هاتم | هاوردم | هێنام |
| نۆستن | نواندیان | هاتن | هاوردیان | هێنایان |
| نۆستن | نواندتان | هاتن | هاوردتان | هێناتان |
| نۆستن | نواندمان | هاتین | هاوردمان | هێنامان |

کە دەبوایە بە پێی رایەڵ یەکەم ( نۆستاندی ) بوایە و دوەهەم ( هاتاندی ) بوایە ، بەلام ئەو دوو شێوەیە ئەگەر لە پێشدا هەبوبن و لە ماوەی زەماندا لە بەر سۆکتی بە سەر دەمەوە سواون و لە نۆستینیشدا چونکە رایەڵیان دانەڕێژراوە بە وردی فەوتاون . بەم جۆرە فرمانی ( بێ هێز ) کە کرا بە ( بەهێز ) دەتوانرێ شێوەی فرمانی ( مبني للمجهول ـ Passive ) یشی لێ دروست بکرێ بە هۆی مۆرفیمێکی تری تایبەتیەوە کە ( را ) یە بەم جۆرە :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| سۆتا | سۆتاندی | سۆتاندرا | سۆتێنرا | لە شێوەی ئێستە |
| پژمی | پژماندی | پژماندرا | پژمێنرا | لە شێوەی ئێستە |
| نۆست | نواندی | نوێندرا | نوێنرا | لە شێوەی ئێستەدا ماوە |
| هات | هاوردی | هێندرا | هێنرا | لە شێوەی ئێستە . |

فرمانی بەهێز ـ تێپەڕ ـ الفعل المتعدی ـ Transitive . مۆرفیمی

هێز ( ـ ند ـ ) هەڵ ناگرێت ، چونکە هــەر خۆی لە رەچەکدا بە هێزە و پێویستی بە مۆرفیمی هێز نیە ناتوانین بڵێین :

ناسێ — ناساندی

مێ — مماندی

کڕێ — کڕاندی

بردێ — براندی

ویەك سەر ( فرمانی مبني للمجهول ـ Passive ) ی لێ دروست دەکرێ بە هۆی مۆرفیمی ( را ) و دەڵێین :

ناســێ — ناســرا

مــێ — مــرا

کڕێ — کررا

بــردێ — بــرا

تەنها لە کاتێـکدا دوو ( ر ) بـکەونە یەك ، وەك فرمانی ( کڕێ ) ناچارێ یان دوو ( ر ) وەك دەوترێ و پـێویســـتی زمانە دەتوسرێت یان ( د ) و دەشێ هەندێ شێوە فۆنیمێـکی دیکەی وەك ( ی ) بخاتە نێو دوو ( ر ) کە بۆ ئاسان کردنی دەربڕین دەڵێین :

کڕرا کڕدرا

( تازە کوردێ ناس ) بێ ئەوەی ئەم هەمـوو کارەسـاتە بزانێ ناکەوێتە ئەم گێژەوە .

زمانێکی وەك كوردی کەســـاس کە هێشتا وێنــەی نوسینی پەســـندی خۆی نەگرتوە و هیــچ جۆرە زانستێـکی کۆنی پێ نەنوســراوەتەوە و چە جای تازە هیچ پرۆگرامێکی ئەکادیمی بەرزی لە زانستی زماندا پێ نەخوێنـــدرابێ بەڵـکو تا ئیستە بە گوێرەی دەستوری - زانـسی زمان ، لێك نەدراوەتەوە لە لایەن کوردێـکەوە مامۆســتا توفیق وەهبی نەبێ کە ئەویش هێشتا هـــەمو نوسێنەکانی بڵاو نەکردراونەوە لە پێ یەکێك لە پلەیــەکی ســـــەرەتایی خوێندنی زانستـگا و تەنهــا لە ( بەشێکی کۆلێجی ئادابی ) زمان و ئەدەبیاتی خوێندبێ و شارەزایی هیـچ جۆرە گۆشەیەکی زانستی زمان نەبوبێ و لە هیـچ زانستگایەك Philology نەخوێنـدبێ و تەمەنێکی دوَر و درێژی وەك مامۆستا وەهبی رانەبواردبێ بە لێکۆڵینەوەی ، نەك هەر زانستی زمان ، بەڵـکو زمانەکەی خۆی و شــارەزاییەکی ئەوتۆی لە زمانێـکی زندوَدا نەبێ کە ئەم زانستییەی پێ نوسراوەتەوە لە پێ بێتە مەیدان و دەس بکا بە رمبازێ ، نەك هەر لە دەســـــتوری زمانی کوردیدا ، بەڵـکو لە هەمو گۆشەکانی زانستی زماندا پەیتا پەیتا وتار و کتێب بڵاو بکاتەوە لە ژێر ئەم ناوە گرنـگانەدا ... زانستی زمان ، فۆنۆلۆجی ، مۆرفۆلۆجی ، فیلۆلۆجی بەراورد ، زمــانی ئاڤێســتا و میدی ئاخۆ ســاتمە ئەبێ بکا ..

لە سەرەتادا وتمان : زمان شناسی - زانســتی زمان Pilology زانستیەکی تازەیە ، دەستوری تایبەتی خۆی هەیە کە لە زانستگاکاندا

به چه‌ند ساڵێکی خوێندنی ئاکادیمی له هه‌مو گۆشه‌یه‌کی زمان ده‌کۆڵێته‌وه ، هه‌ر گوشه‌یه‌ی ڕێی و شوێنی تایبه‌تی خوێندنی خۆی هه‌یه و پسپۆڕی تایبه‌تی زانستیه‌کانی به گوێره‌ی پرۆگرامی تایبه‌تی ده‌ی لێته‌وه . ئه‌م زانسته و جۆری خوێندنی له وڵاتی ئێمه هێشتا نه‌بوه به باو و نه‌خراوه‌ته پرۆگرامی خوێندنی زانستگا هه‌تا ئه‌م دو سێ ساڵه‌ی دوایی نه‌بێ تاکه تاکه خوێنده‌واران هاتونه باس کردنی ئیسته‌ش کتێبێکی عه‌ره‌بی وا به ده‌سته‌وه نییه توسه‌رێکی عراقی توسیبێتی و به وردی له‌م زانسته دوا بێ ، چه‌جای کوردی که هێشتا له هیچ گۆشه‌یه‌کی ئه‌وتۆی ئه‌م زانسته‌ی پێ نه‌نوسراوه ، به‌ڵکو هه‌ر باس نه‌کراوه . ئه‌وه‌نده نه‌بێ له هه‌ندێ رۆژنامه و گۆڤاردا باسی بچڕ و بێ سه‌ر وبێ که هیچی ناچێته قاڵبی زانسته‌وه .

زانستی زمان له راستیدا زانستیه‌کی زۆر قول و به په‌ل و پۆپه و گه‌لێك (لازانستی ـ جانبی) لێ ده‌بێته‌وه که هه‌ر یه‌کێ ده‌ریایه‌کی بێ بنه و پێویستی به خوێندنێکی ئه‌کادیمی به‌رز و هه‌وڵ وته‌قه‌لای ساڵه‌های خۆ به‌خت‌کردن و ورد بونه‌وه‌یه ، بێجگه له پێویستی به شاره‌زایی له زمانی کۆن و نوێی نزیك به‌و زمانه‌ی زانا لێی ده‌کۆڵێته‌وه ، که هێشتا ئه‌م جۆره پسپۆڕانه و ئه‌م جۆره تێ کۆشینه په‌یدا نه‌بوه پێکه‌وه له ناوماندا ، و یه‌کێکی وا له کورددا هه‌ڵ نه‌که‌وتوه هه‌ر دوَ تیری به ده‌ست بێ ، مامۆستا وه‌هبی نه‌بێ که ئه‌ویش پێگه‌یشتوی ته‌مه‌نی درێژ و تێ‌کۆشینی

خۆیەتی ، نەك خوێندنی ئەکادیمی لە زانستی زماندا .

ئنجا بۆ کۆردێك تازە زمان ناس بێ یاخود هەر تازە کوردی ناس بێ ، زۆر هەڵەیە یەکسەر دەســـت بداتە خامە و دەیەها وتار لە سەر زمان و هەمو زانستەکانی بنوسێ و بڵاوی بکاتەوە و هیــچ تیرێك لەو دوَ تیرە ناوبراوەی بە دەســتەوە نەبێ وە بێ گومان ساتمە[10] دەکا .

ئەگەر ساتمەی چاو فڕێنم بە دیی نەکردایــە ئەمــەم نەدەوت ! بەڵام ببوَرن با یەکێك لەو ساتمانە روَن کەمەوە . وتمــان ( زمان شناسی ـ زانســتی زمان ـ علم اللغة ـ فقه اللغة ـ Philology ) لە سێ پەل زانســتی پەیدا دەبێ :

١ـ دەنك شناسی ـ دەنك سازی ـ علم الصوت ( الأصوات ) ـ Phonetics .

٢ـ وشەشناسی ـ وشەسازی ( علم المفردات ـ علم صرف اللغة ـ Morfology .

٣ـ رســتە شناسی ـ رستەسازی ( علم نحو اللغة ـ syntax ) .

/ یەکەم باسی دەنك دەکا و دروست کردنی وشە دوَهەمی باسی وشە دەکا چیە و بۆچی بە کار هاتوە ، لە چەند بەش پەیدا دەبێ . ( ناو ) بە هەمو جۆرەکانی ناســـراوە ، تاکە ، کۆیە ، مادیە ، مەعنەویە ،

(١٠) ساتمە : زەلەی زمانە ( هەڵە )

هەروەها (فرمان) چیە ، چۆن دروست دەبێ گەردانی ، رایەڵی ، کاتی رووداںی ، واتە لە شەکل و دیمەنی وشە و پێوانە و رایەڵی بە تەنها دەدوێ . سێیەم لە وشە دەدوێ بەڵام نەك لە شەکل و دیمەنی ، لە رۆڵی ئەو وشەیە لە نێو رەستەدا ، ناو بێ یا فرمان . چـە مانایەکی گەیاندوە (فرمان کردەیە ـ فاعـل ـ Agent فرمان پێکراوە ـ مفعول بە Accusative ) ئەگەر ناو بێ . فرمانەکە بە هێزە ، فرمان کردەبێ ئاشکرایە ئاشکرا نیە ، فرمانی چـە کاتێکە ، ئێسـتە ، رابوردوو ، لەمەودوا ، ئەگەر فرمان بێ /

زمان شناس ئەم سێ گۆشەی زمانە بە سـەر یەکدا نادا ، و هەر یەکەیان لە شـوێنی خـۆیدا باس دەکا بەڵـکو هەر یەکە پسپۆڕی خۆی هەیە کە خۆی تیکەڵ بە کاری ئەوی تـر ناکا . بەڵام ئەگەر یەکێـکی تازە زمان ناس کەوتە ئەم کارە دەبینین هەمویان بەسەر یەکدا دەدا و خۆشی نازانێ چی‌دەکا .

ئێمە وتمان زمانی کوردی زمانێـکی زندوە ، مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە ، لە دوو قاڵبی زمانیدا مەیوە ! ئەم راسـتیە ئـەوە دەگەیەنێ کە وەك زمانە پێش‌کەوتوەکان کێش و تەرازوو و رایەڵ و زنجیرەی تایبەتی هەیە بۆ هەڵکەوتی وشەی ناو ، داڕشتنی ، لێك‌دانی ، گەردانی ، هەروەها بۆ فرمانی . ئنجا زمانشـناسی زانا کە باسی (وشەسازی) دەکا دەگـەڕێ بە شـوێنی ئەو رایەڵ و کێـش و تەرازووانەدا ، و شیرازەی نابچڕێنێ ، راوە (بەند ـ Affix ) بکا ،

و لەم یەك و لەو دوان بێ سەر و گوێی بگرێ .

وشە سازێ کە لە وشە دەدوێ ـ Morphology ، باسی رەگ و ریشـە و رایەڵ و شیرازە و ئەندازە و پێوانەی وشە دەکا ، ئنجا زمانشناسی کوردێ بەگوێرەی ئەو دوو قاڵبەی باسمان کردن لە (وشە) دەدوێ لە زمانی کوردیدا ، بە هەمو جۆرەکانیەوە و بەشـەکانیەوە واتا بە پێی ئەو رایەڵ و ئەندازانەی زمانی کوردێ (وشە)ی تێدا هەڵکەوتوە و دروست بوە ، تەنها بە (لاباس ـ جانبی)ێـکی بجوکەوە ناتوسێ وەك (بەند ـ Affix) و نـاوی بنێ (مۆرفۆلۆجێ) و ئەویش بە شێوەیەکی ئاڵۆز و نالەبار باسی بکا وەك ناشیەك. هەروەها کە هاتە سەر لێك دانەوەی رستە ـ رستەسازێ Syntax . لەو قاڵبەدا کە (رستە) گرتویەتی لە زمانی کوردیدا ، نەك لە (وشە) دەدوێ . ناگەرێتەوە سەر (مۆرفۆلۆجی) و تێکەڵیان بکا . باسی (کاری وشە) نەك (دیەنی وشە) لە نێو رەستەدا واتا باسی (نحو اللغة) دەکا نەك (صرف اللغـة) بەم جۆرە زمانشناس دەتـوانێ رێی زمانی کوردێ لە شیرازەی خۆیدا بگرێتەوە و دەستورەکانی ساغ کاتەوە لە هەمو گوشەکانیـــدا ، واتە لە (دەنـگ ســازێ) و (وشەســـازێ) و (رستەشازێ)دا بێ ئەوەی تێکەڵیان بکا و بە سەر یەکیاندا بدا و سەر لە کورد تێك بدا و زمانەکە بشێوێنێ وەك ئەم (تازە زمـان ناسانە) لە کتێب و وتاری بێ سەر و شوێندا بڵاوی دەکەنەوە .

مامۆستای بەرزی زمانشناس Leonard Bloofield بە تیرێ

سنووری داناوه بۆ لێککردنەوەی ئەم دوو بەشـەی زمانشناسی واتا ( مۆرفۆلۆجی - علم الصرف - وشەسازی ) و ( سینتاکس - علم النحو - رستەسازی ) ، دەڵێ[11] :

Morphology, Ineludes the constrction of words and parts ofwords, while syntax includs the constrcetion of phrares*

هەروەها زمانشناســـە عەرەبەکان ئەم دوو زانستەی زمانیان لە یەك جودا کردۆتەوه و هەر یەکەیان بە تەنها باس کردوه و هـــەر یەکە مامۆستا وپسپۆڕی خوێی هەبو ، ...

دیسان ، وتمان زمانی کوردی زمانێکی ( اشتقاقیة ) بە تایبەتی لە رووی داڕشتنی وشـــەی ( فرمان ) و گەردانی فرمانـــ و لێك کردنەوەی جۆری بە هۆی گۆڕینی ( رشتە - صیغە ) ، و گەردانی بە هۆی پێوه لکاندنی راناو ، هەروەها راستیەکیش هەیە کە هەمیشە نابێ لە بیر بچێ ، ئەوەش ئەوەیە کە زمان هیـچ وشەیەکی بێ واتای تێـــدا نیە ! چونکە هەموو وشـەیەك بۆ مەبەستێك دادێ یانـــ دادەڕێژرێ . بە تایبـــەتی ئەو وشانەی کە وەك سەر چاوه دەبن بە کانگای وشەی تر و لێی دەکەونەوه وەك چاوگ ! ئەگەر چاوگ بێ مانا بوو هەر لە رەچەکدا چۆن وشەی تری وەك ( فرمانـــ ) و ( فرمانکردە ) و ( فرمان بێکراوی ) دەشی لێ دروست بێ و دیارە هیـچ زمان شناسێك حوکمی ئعدام نادا بە ســـەر هیـچ وشەیەکی

(11) L. Bloomfield. Language. 1961 . London. P. 207 .

زماندا و بڵێ ئەم وشەیە بێ واتایە ... چونکە خوێی ڕەجەکی ئەو وشـــەیەی بۆ نادۆزرێتەوە یا لە فەرهەنـگدا نازانێ بێخوێنێتەوە زمانشناس دەزانێ کە نەك هەر وشـــە هیـچ دەنگێك لە زماندا بەخۆڕایێ بەکار نایـەت . بەڵـکو تەنها نەرمی یا ڕەقێ دەنگێك دەبێ بە هوێی پەیدا بوونی دوو وشـە و دوو مانای زۆر لە یەك دوور لە تەنها یەك وشەدا کە بە دیەن یەکن وەك ( برك ) بە ( ر ) ی سوك و ( بڕك ) بە ( ڕ ) قەڵەو تەنها نەرمی ( ر ) ی یەکەم و ڕەقێ ( ڕ ) ی دوەهەم ئەم وشـەیەێ کردوە بە دوان لە ڕوی ماناوە و بەو ( ـــٚـــ ) ی سەر ( ر ) ی دوەهەم بە نوسێن جوداوازیان دەرخراوە[١٢] .

بە ســەرنجێـکی ورد لە فرمانی کوردیدا ، دەبینین ... فرمانی ( سادە ـ مجرد ) بێ ، بێ پاشگر و پێشگر پێنج ڤاڵبی گرتوە :

١ـ ڤاڵبی ( ئەلفی ـ مـد ـ بزوێن ( ئا ) ی درێژ ) کە زۆری شێوەی ئەو فرمانانەیە لە خۆیانەوە ڕوو دەدەن بێ دەســەڵاتی ( فرمانکردە ) ، وەك :

سوتا . ڕوخا . بچڕا . خنـکا . خزا . شکا . ڕوا . زوربەی ئەم فرمانانە لە تیپی ( بێهێز ـ تێنەپـــەڕ ـ لازم ـ Intransitive ) دادەنرێن ، چەند فرمانێك نەبێ ، وەك :

(١٢) بروانە فەرهەنـگی خاڵ و وەهبی . و نسرین فخری ئەم دوو وشەیەی لێك نەکردۆتەوە !

( ئالا ـ التف ) و ( پێچا ـ لف ) کە ( بەهێز ـ متعـدی Transitive ) ن .

٢ـ قاڵبی ( واو ) ی ، وەك :

چوو ، بوو ، سوو . دروو .

ئەم قاڵبە لە فرمانی ( بێهێز تێنەپەڕ ـ لازم ـ Intrasitive ) وەك : چـــوو . بوو ، و فرمانی ( بەهێز ـ تێپەڕ ـ متعـــدی ، Transitive ) پەیدا دەبێ ، وەك : سوو . دروو .

٣ـ قاڵبی ( یا ـ ی ) ئی زۆری ئەم قاڵبە لە فرمانی ( بەهێز ـ متعدی ـ Transitve ) پەیدا دەبێ ، کەمتر ( بێهێز ) بۆ بەهێز وەك : دڕی . بڕی . سڕی . کڕی . چنی . کوشتی . گەزی . نۆشی . مژی . ناسی . نوسی . دۆشی . ژەنی .

بۆ بێهێز ، وەك :

وەری . زەڕی . پـژمی پەڕی . تەزی . لەرزی .

٤ـ قاڵبی ( تا ـ ت ) ئی کە دیسان هەردوو جۆر فرمان دەگرێتەوە ( بێ هێز ) و ( بەهێز ) . بۆ بێهێز ، وەك : نوســـت . کەوت . سرەوت . ( خەوت ـ نوست ) .

بۆ بەهێز ، وەك : کوشت . رست . خست . ویست . پەرست .

٥ـ قاڵبی ( دال ـ د ) ی کە ( بەهێز ـ متعـــدی ) زۆرترە لە بێهێز .

بۆ بەهێز ، وەك :

کرد . نارد . برد . چاند . خوێند . سەپاند .

بۆ بێهێز : وەك : مرد . زند .

فرمانی هەر پێنج ڤاڵبەکە بە (بێهێز ـ لازم) و (بەهێز ـ متعدی) یەوە بە هۆی مۆرفیمی چاوگ کە (ن) دەبن بە چاوگ[۱۳] بەم جۆرە :

| | فرمان | | چاوگ |
|---|---|---|---|
| ١ــ | نوسا | — | نوسان |
| | ئاڵا | — | ئاڵان |
| | بچڕا | — | بچڕان |
| | ستوتا | — | ستوتان |
| ٢ــ | کڕێ | — | کڕێن |
| | دڕێ | — | دڕێن |
| | نوسێ | — | نوسێن |
| | کوشێ | — | کوشێن |
| | پژمێ | — | پژمێن |
| | چەقێ | — | چەقێن |

(١٣) لە هەورامیدا بە (ی) .

٣– چۆ — چۆن
بۆ — بۆن
درۆ — درۆن
سۆ — سۆن
گورۆ — گورۆن

٤– کوشت — کوشتن
نوست — نوستن
رشت — رشتن
ویست — ویستن
بەست — بەستن

٥– کرد — کردن
برد — بردن
نارد — ناردن
خوێند — خوێندن
مرد — مردن

ئەمە یەکێکە لەو (رایەڵ – قیاس)ە رەوانانەی کوردیی کە ئاشکرا و ئاسانە و هیچ جێی ئەوە نیە زمانشناس هەڵەی تێدا بکا .

فرمانی (بێ هێز ـ لازم) دیسان لە هەمو قاڵبەکاندا دەبێ بەفرمانی (بەهێز ـ متعدي) بە هۆی مۆرفیمی هێز کە (ند)یە :

١ — سوتا — سوتاندی
خنکا — خنکاندی
بچڕا — بچڕاندی
ڕوخا — ڕوخاندی
دڕا — دڕاندی

٢ — پژمێ — پژماندی
چەقێ — چەقاندی
تەزێ — تەزاندی
لەرزێ — لەرزاندی
بەزێ — بەزاندی

٣ — نوست — نواندی (نوستاندی)
کەوت — دیسان کەوت (شاذ ـ ئاڵۆز)ە ، خستییەکار دڵی لە شوێنی .
سرەوت — سرەواندی
خەوت — خەواندی

٤ — لە قاڵبی (و)دا دو فرمانی (بێ هێز ـ تێ نەپەڕ) کە (چو) و (بو) (ئاڵۆز ـ شاذ)ن فرمانی (بە هێز ـ تێپەڕ) یان

لێ دروست نابێ بۆمەبەسی (هێزپێدان) فرمانی تر بەکار دێن کە واتای ئەوانی پێ ساز دەبێ دەڵێن :

چو — بردێ . بردن

بو — کردێ . کردن

نەبیستراوە بڵێین :(چواندێ) ، یاخود (بواندی) لە هیچ زارێکی کوردیدا .

ە— مرد — مراندن

سەرەڕای ئەم هەمو رایەڵ وئەندازە سوك و ئاسانەی دروست‌کردنی صەدەها فرمان بە گوێرەی قاڵبی زمانە داڕێژەکان لە کوردیدا دەبینین هیشتا زمانی کوردێ بە ئەندازەی پێویستی خۆی فرمانی نیە و دادەمێنێ لە سەر فرمانی تر و لێرەدا لە قاڵبی زمانە لکێنەکاندا کاری خۆی دەباتە سەر بە هۆی لکاندنی چەند مۆرفیمکی (ظرف) بە پێش فرمانە سادەکانی پێشو . بەم جۆرە تیپێکی تری فرمانی تازە بە مانای تازەیان لێ دروست دەکا . بۆ نمونە :

أ ـ (هەڵ) بۆ مانای بەرە و ژور یا کرانەوە .

١ ـ قاڵبی (١) ستونا ، بچڕا . کشا . خزا . بزڕکا . شێلا . ئالا . پڕوکا . وەستا .

پێچا . هەڵخزا . هەڵبچڕا . هەڵکشا . هەڵبزڕکا . هەڵپێچا . هەڵچزا . هەڵشێلا . هەڵئالا . هەڵپڕوکا . هەڵوەستا .

٢ ـ قاڵبی (ی) : کڕێ . بڕێ . دزێ . مژێ . پژمێ .
کوشێ . کۆشێ[١٤] . پەڕێ . دۆشێ . وەرێ . دڕێ .

هەڵکڕێ . هەڵبڕێ . هەڵمژێ . هەڵ کوشێ . هەڵدۆشێ .
هەڵپەڕێ . هەڵوەرێ . هەڵدڕێ .

٣ـ قاڵبی (ت) : کەوت . کوشت . توست . نیشت . سرەوت .
خەوت . بەست . خست . گرت .

هەڵ کەوت . هەڵ نیشت . هەڵ سرەوت . هەڵ بەست .
هەڵ خست . هەڵ گرت .

٤ـ قاڵبی (و) : چوو . بوو . سوو . دروو . کوروو .
هەڵ چوو . هەڵ بوو . هەڵ سوو . هەڵ دروو . هەڵ کوروو .

٥ـ قاڵبی (د) : پرواند . چاند . چەقاند . پەسارد . کرد .
مرد . برد . (زند ـ ژیا) خوێند . نارد . هاورد . سەپاند .

هەڵ کرد . هەڵ خوێند . (وەك کەڵەشێر) . هەڵ پرواند .

---

(١٤) کۆشێ لە کەڵ (کوشیدن) ی فارسی یەکن بەمانای هەوڵ و تەقەلا ، وەك : (پەروەری) پروريد ـ پرورِیدن لە پەهلەویی و فارسیدا و ئیستە تەنها لە شێوەی (پەروەردە)دا ماوە لە کوردیدا ، کە دوور نیە پروریدە ـ بەمانای ناوی فرمان کردەبێ ، وەك : (کۆشیدە) و لە زمانی سەردەمدا سوابێ بۆبێ بە (پەروەردە) بۆ مەبەسی بێشوو نەك (فرمان پێ کراو) .

هەڵ چەقاند . هەڵ سەپاند . هەڵ پەسارد .

ب ـ (دا) بۆ مانای بەرەوخوار :

١ـ قاڵبی (ا) : دابچڕا . داکشا . داپێچا . داچزا . داشێلا . داپڕۆکا . داما .

٢ـ قاڵبی (ی) : دابڕی . دامژی . داکوشی . دادۆشی . دادڕی .

٣ـ قاڵبی (ت) : داکەوت . دانیشت . داسرەوت . دابەست . داخست . داگرت .

٤ـ قاڵبی (و) : داچوو . دابوو . داسوو . دادروو . داگوروو .

٥ـ قاڵبی (د) : داکرد . دامرد . داسەپاند . داپرواند . داچەقاند .

ج ـ (را) بۆ مانای لە شوێنی خۆی :

١ـ بۆ قاڵبی (ا) : راکشا . راپێچا . راوەشا . راتەکا . راهێنا . راوەستا .

٢ـ بۆ قاڵبی (ی) : راپەڕی . راچڵەکی .

٣ـ بۆ قاڵبی (ت) : رانیشت راسرەوت . راخست . راگرت .

٤ـ بۆ قاڵبي ( و ) :

راچو . رابو .

٥ـ بۆ قاڵبي ( د ) :

راکرد . راسەپاند . راوەشاند . راتەکاند .

د ـ ١ـ ( تێ ) بۆ قاڵبی ( ا ) :

تێخزا . تێ ئالا . تێ پێچا . تێما . تێ شکا .

٢ـ بۆ قاڵبی ( ی ) :

تێ تەقی . تێ کوشی . تێ پەڕی . تێ نەوی .

٣ـ بۆ قاڵبي ( ت ) :

تێکەوت . نیشت تێ بەست . تێخست . تێگرت .

٤ـ بۆ قاڵبی ( و ) :

تێ چو . تێ بو . تێ سو .

٥ـ بۆ قاڵبی ( د ) :

تێ کرد . تێ پرواند . تێ چاند .

هەروەها گەلێك پێش بەندی تر . کە ئەمانە نمونەیەکی کەم بون بۆ رێی رون کردنەوە باسمان کردن .

دیسان پێویست زمانی وا راهێناوە کە هەندێ فرمان بە شێوەیەکی

تایبەتی روو بدا یان مانایەکی تایبەتی ببەخشێ هەر لە فرمانە سەرەتاییەکە ، وەك بۆ دووبارەکردنەوەی ئەو فرمانە ، یاخود درێژکردنەوەی کاتی روودانی ، یاخود مانایەکی تازەی نزیك بەو . بۆ ئەم مەبەسە مۆرفیمێکی تایبەتی بەکار بهێنێ کە وەك پاش بەند دەلکێ بە دوای فرمانەکەوە یاخود چاوگەکەیەوە ئەم مۆرفیمەش ( ـ وە ) یە

١ـ بۆ قاڵبی ( ا ) :

سووتا = سووتا + وە یا سووتا + یە + وە سووتا + ن + وە

بووژا = بووژا + وە یا بووژا + یە + وە بووژا + ن + وە

٢ـ بۆ قاڵبی ( ی ) :

سڕی - سڕی + یە + وە - سڕی + نە + وە[1]

بڕی - بڕی + یە + وە بڕی + نە + وە

٣ـ بۆ قاڵبی ( ت ) :

کەوت = کەوت + ە + وە کەوت + نە + وە

خست = خست + ە + وە خست + نە + وە

---

(١٥) + ە + ئەمە بەندێکی ( فۆنیمی ـ دنگی ) یە بۆ جووت بوونی دوو کەرت پێویستە هیچ دەورێکی ( مۆرفیمی ـ صرفی ) یا ( نحوی ) نیە لە وشەکەدا .

٤ـ بۆ قاڵبی (و) :

چۆ = چۆ + وە + وە    چۆ + نە + وە

درۆ = درۆ + وە = وە - درۆ + نە = وە

٥ـ بۆ قاڵبی (د) :

کرد = کرد + ە + وە    کرد + نە + وە

برد = برد + ە + وە - برد + نە + وە

فرمان و چاوگی فرمان هەر لەم رۆڵەدا ناوەستن ، لەکوردیێدا دیسان وەك زمانە دارێژەکان کەلێك (وشەی فرمانی ـ اسمـاء فعلية Participiales) لێ دادەرێژدرێن وەك (ناوی فرمان کردە اسم الفاعل . Present - Part) و (ناوی فرمان پێ کراو ـ اسـم المفعـول . Past - Part) بەم جۆرەی خوارەوە ا ـ بۆ قاڵبێ (ا) وەك :

سوتا : سوتێن بۆ ناوی فرمان کردە (محُـرِق)

برژا : برژێن

لکا : لـکێن

سوتا : سوتاو (سوتیاو)

برژا : برژاو (برژیاو)

لکا : لـکاو (لـکیاو)

ئەمانە بۆ ناوی فرمان پێ کراو کە لە شـوێن فرمان کردە بەکار دێ

وەك : (صفەی مشبهە) چونکە سوتا بە فرمانی بێ هێز دادەنرێ و لە کاتێکا فرمانی بێ هێزی لێ دروست بکرێ کە (سوتاندە)ە فرمان کردەی دەبێ سوتێنەر بێ بە پێی رایەڵ - بەڵام کورد ئەڵێ (سوتێن) . هەروەها بۆ (برژا) و (لکا)

٢- بۆ قاڵبی (ی) :

سڕێ (سڕ) بۆ فرمانکردە .

بڕێ بڕ

دزێ دز

سڕێ سڕدراو : لەو فرمانانەی دوَ (ر) دەکەونە یەك (ر)ی خۆی فرمانەکە .

بڕێ بردراو : و (ر) مۆرفیمی مبني للمجهول . (د) لە هەندێ .

دزێ دزراو : شێوەدا دێتە کایە کە دەبێ (ی) بێ چونکە قاڵبی فرمانەکە (ی)یە بەم جوژە (دزێراو) کە دیارە (ی) لەبەر قورسی خوراوە و هەر دوَ (ر) کە کەوتونە یەك ئنجا بۆ دوَر خستنەوەیان ئەم (د) خراوەتە نێویان . لە فرمانەکانی وەك (دزێ) (گوشێ) (مژێ) کە (ز) و (ش) و (ژ) یا دەنگێکی

تر پێش ( ی ) قاڵبیەکە دەکەون ، ئەم کارەسانە
ڕوَ نادا و یەکسەر فرمانپێکراو بەم جۆرە
دادەڕێژێت (دزرا = دزیرا )یە لە رەچەکدا
( کوشرا=کوشێرا ) لە . شـێوەی دێرین
مژرا = مژێرا ) . .

٣— بۆ قاڵبی ( و ) بۆ ناوی فرمانکردە :

چوَ
بوَ

ئەم دوَ فرمانە شاذن Irregular رایەڵیان ناتەواوە
دەبوَ ( چووە ) و ( بوَە ) ین دوَهەمیان ماوە
یەکەمیان نە ، هەروەها ناوی فرمان پێکراویان
نیە بێهێزن .

| | فرمانکردە | فرمانپێکراو |
|---|---|---|
| دروَ | درویَن | درواو ( دروَراو ) |
| کوروَ | کورویَن | کوروواو ( کوروَراو ) |
| سوَ | سویَن | سوَراو . |

٤— بو قاڵبی ( ت ) ، بۆ فرمانکردە .

کەوت — کەوتە ( کەفتە ) ( کەوتوَ ) وەك صفەی مشبهە .
فرمانەکە بێهێزە

| | | |
|---|---|---|
| رشت | رشتە | ( رێژ ) بۆ فرمانکردە |
| بەست | بەستە | بەست |

| | | |
|---|---|---|
| رشت | ڕێژراو | بۆ فرمانپێکراو . |
| بەست | بەستراو | بۆ فرمانپێکراو . |

٥ــ بۆ قاڵبی ( د ) : ناوی فرمانکردە .

| | |
|---|---|
| مرد | مردوَ ( مردە ) |
| زند | زندوَ ( زندە ) |
| برد | بر ( بردە ) بۆ ناوی فرمانکردە . |
| کرد | کر ( کردە ) . بۆ ناوی فرمانکردە . |
| برد | براو . بر دراو بۆ ناوی فرمانپێکراو . |
| کرد | کراو کر دراو بۆ ناوی فرمانپێکراو . |

بەم وردبوونەوەیە و سەرنجانەدا بۆمان دەر دەکەوێ کە زمانی کوردیی چەند زمانێکی بەپێز و پێوانەیە و ئەندازەکانی چەند دانایانە داڕاون لە شوێن خۆیاندا و هیچ جۆرە دەنگێك یاخود جوڵانی دەنگێك بێ مەبەس و واتا ڕوَ نادا و هیچ وشەیەك بەڵکو دەنگێك بێ پێویست بەکار نەهاتوە و دانەنراوە . . بەڵکو کەمیی نوسینن زۆر شتی فەوتاندوە کە شوێنی وەك کەلەبەر دیارە و پێویستی پەرە پێسەندنی زمان داوان دەهێنێ لەسەری و بۆمان نادۆزرێتەوە نەك ئەوەی ماوە و بەسەر دەمەوەیە بێ واتایە و بە خۆڕایی پەیدا بوە .

/ گومانی تێدا نیە کە (زمان شناس)ی زمانی کوردی پێویستی بە شارەزایی نەك هەر لە زانستی زماندا هەیـــە بەڵـکو بە زانینی مـێژوی زمانە هندو ئەوروپیەکانە هەروەها شـارەزایی لە ڕێی زمانی ئەوانەی سەر بە کوردین[١٦] . چونکە زمانی کوردی خـــۆی زۆر کەمی نوسراو هەیە بە تایبەتی هی پلەی ناوەڕاســـتی مێژوی ، واتا لەپێش داهاتنی ئیســـلام بە چەند قەڕنێك هەتـاوەکو قەڕنی دەهەمی (هـ) ... لە بەر ئەوە زۆر رایەڵ و کێش بزر بوە بە سەر دەمەوە و زۆریش لە گەڵ فارسیدا ئاڵۆزاوە و لەگەڵی شـــوێندا رایەڵ و شـــیرازەی بچڕاوە و پێوانەی لەنگ بوە . بەڵام رەچەکی چونکە لە گـەڵ زمانی پەهلەوی و سانسکریتی لەیـەك دەدەن زۆر بە ئاسانـی دەدۆزرێتەوە لەناو ئەواندا . /

ئەمە تەنها چەند تێبینیەك بۆ لە روی رون کردنەوەی ڕێبازی زمانشناس بۆ وردبونەوەیەکی تازە لە ڕێی زمانی کوردیدا ، مەبەسم تەنها دڵسوزیە و هیچی تر . چونکە وەك دەبینم ئەم رێـگەیەی خوێندەوار و کوردە زاناکان گرتویانە لە ڕێی زمان کۆڵینەوەی زمـــانی کـوردی بوار نییە ، و دەبێ بە هۆی شیرازە بچڕاندنی زمانەکە ... تەنها ئەم دیمەنە رواڵەتییەی زمانی کوردی کە زۆری هەر بە سەر دەمەوەیە و پەرش و بڵاوە لە زارەکانـدا .. ئاڵ و گـۆڕ کراوە زۆری زمانەکە

(١٦) بڕوانە ئەو لاپەڕە دەس نوسەی مامۆستا وەهبی لەم روەوە (ل ١٩٠).

ئاڵاڵۆزاندوَە و رایەڵی تێك داوە بەس نییە ..] ئەرکی زمانشناسی راست ئەوەیە (مێژوَی) زمانەکە روَن کاتەوە و پەیوەندی بە زمانانی دەور و پشتی و گۆڕین و لادان و چلۆنیەتی ئەو گۆڕین و لادانە دەرخا بە بەراورد کردنی لە گەڵ ئەو زمانانە ئەوسا ، بڵێ ئەمە رێی رەوی زمانەکەیە و ئەمە دەستوریەتی .]

* * * * * *

# إحياء اللغة

العضو العامل : د. باكيزه رفيق حلمي

اللغة ظاهرة حياتية ترافق الانسان في ولادتها ونمائها وتطورها ومن ثم موتها . . .

وهي في حياتها هذه تضعف وتقوى ، تمرض وتصح ، ويصيبها كل ما يصيب الكائن الحي من عوامل البقاء والاندثار تلد وتتوالد ، تتفرع وتتشعب و يصيب بعض فروعها العجز فتموت وتقوى بعضها فتحيا ، وقد تتحول الى لغات جديدة لا يصلها بالأم الا جذور تدل عليها ، وأصول تتصل بها .

واذا أصابت عوامل الضعف والفناء لغة هزلت ، وضاقت ولم تعد قادرة على مرافقة الانسان في تطوره فتتخلف وتعجز عن اداء مالديه من فكر ورأي ، الامر الذي يضطر صاحبها اما الى تركها والعدول عن استعمالها الى لغة أخرى أقدر منها على أداء ما عنده ، او ان يعمد الى بعثها وبث الحياة فيها باعادة النظر في اصولها وجذورها واستبطان تاريخها واستقصاء اسباب ضعفها وتجديد مافيها من اساليب وقواعد

بالقياس على المطرد وحتى الميت منها وحتى تطويع الشاذ فيها للقياس رغبة منه فى توسيعها للابقاء على ما يراد منها .

ولكل لغة نامية حية تاريخ وعمر وكلما تقدم تاريخها تأصلت وتمكنت من البقاء وثبتت قواعدها واطردت أقيستها وانتظمت تصاريفها وأوزانها . واللغة الكردية بتاريخها العريق في القدم ، وقدرتها العجيبة على البقاء حية حتى الان رغم ما جابهت من عوامل الفناء فانها تعد احدى اللغات النامية الحية اليوم . ولولا خصائصها اللغوية التي أحاطتها بأطار من الحصانة والمنعة لما استطاعت الصمود والبقاء . وبنظرة دقيقة الى أصول قواعدها واتساع أقيستها وأوزانها يستطيع باحث اللغة ان يدرك سر هذا البقاء الطويل مع النماء والتطور حتى انها فاقت الفارسية أختها في قابليتها على التطور ، بالرغم من توفر كافة الظروف على تطور الفارسية وانعدام معظمها في الكردية ... الذي يكمن في قدرتها على اتخاذ مسارين لغويين معروفين : هما مسار اللغات الالصاقية التى تعتمد في صياغة مفرداتها على السوابق واللواحق ومسار اللغات الاشتقاقية التحليلية التى تعتمد على تغيير بناء الكلمة لتغيير المعنى ، اي انها تعتمد في نمائها وتطورها وبقائها دائمة التجدد على صفات اللغات الهنداوروبية التى تتخذ من الالصاق قواعد لصياغة مفرداتها وعلى صفات اللغات العربية التى تعتمد على قواعد الاشتقاق في هذه الصياغة . وقد عمد منذ اوائل هذا القرن الكثير من المثقفين الاكراد الى البحث عن سبل إحياء اللغة الكردية بعد أن فعلت فيها عوامل التخلف وجعلتها تنكمش وتقصر دون الوفاء بحاجات الفكر الكردي

الحديث . وفارس هـذا الميدان الاول هو الاستاذ الجليل توفيق وهبي الذي اصبح بخبرته الطويلة لاكثر من خمسين عاماً واطلاعه الواسع على اللغات الحية والميتة القريبة من اللغة الكردية والمعاصرة لها وبذكائه الثاقب وعلمه الغزير في الدراسات الايرانية ، وصلته الوثقى بأجلة العلماء والباحثين في هذا الميـدان ليس علماً كرديا في العلم والمعرفة فحسب بل علماً عالميا يشار اليه بين علماء العالم وافذاذهم بالتكبير والاجلال . ولـكن المؤسف ان الزمان قلما يجود باكثر من واحد من هؤلاء الافذاذ في عصر واحد بل في عصور ... فالسبل التي هيـأت لابراز هذه الشخصية العلمية الرائعة لا تتهيأ الا نادراً لأكثر من واحد ... وقد دفع الحرص على الاسراع في اعادة الحياة الى اللغة الكردية الكثير من المثقفين الاكراد الى محاولات لم تخل ولن تخـلو من عثرات لا يمكن اغفالهـا ، بل لابد من التنبيه عليهـا ، فانها ان دامت فستؤدي بلا شك ليس الى احيـاء اللغة بل الى الانفلات من قواعدهـا واوزانها والخروج على الضوابط التي تضمنتهـا في اطار اللغة الواحدة ، وليس السبب في ذلك الا العجلة والتسرع وعدم الالمام بقواعد اللغة واوزان صياغاتها وأسـاليب تطورها والنقص فى اطلاعهم على اساليب البحث العلمي الحديث في اللغة .

وحديثنا هذا يتناول عرض الأساليب العلمية الحديثة في دراسة اللغات ، والفروع اللغوية العديدة التي تتناول جميع مناحي اللغة بالبحث والتدقيق ، ثم كيفية تطبيقها في دراستنا لقواعد اللغة الكردية التي تنتمي من حيث الاصول الى لغات الاسرة الهنداوروبية ، ومن حيث

القواعد والنحو الى المجموعتين اللغويتين المعروفتين ، اللغات الالصاقية واللغات الاشتقاقية فى آن واحد ...

ويتخذ الحديث من الاشارة الى تلك العثرات مداخل الى عرض القواعد الاساسية للغة في مختلف أبوابها بغية التوصل الى تجنب الوقوع في امثالها ، ابتداء من اصواتها الى مفرداتها فنحوها وصرفها مع امثلة وشواهد كثيرة للاستدلال بها الى عرض تلك القواعد والأسس يمكن للقارىء ان يعود اليها .

وأهم ما جاء فيه شرح مسهب للقوالب الفعلية التي تنتظم جميع الافعال المجردة ، اي الخالية من السوابق واللواحق بما في ذلك اللازمة والمتعدية . وهو اكتشاف جديد لاهم قواعد الاشتقاق في أفعال اللغة الكردية . فقد وجدنا من دراستنا المستفيضة للافعال أنها تنتظم خمسة قوالب لا تزيد بجميع صيغها اللازمة والمتعدية ... ويصاغ منها المصادر باضافة (مورفيم مصدري) خاص هو (ن) التي تلحق أواخرها . ولم يدرك أحد من الذين كتبوا في قواعد اللغة الكردية من المستشرقين والاكراد حتى الآن هذه الحقيقة ، وكانوا يرون ان ما يقوم مقام لام الفعل في العربية هو جزء من المورفيم المصدري . ولكن البحث الدقيق أثبت أنه جزء من بناء الفعل نفسه بدليل بقائه دون مورفيم المصدر (ن) في جميع الصيغ الفعلية التي تشتق منه عند حذف المورفيم (ن) المصدري اثناء التصريف . ويتناول كذلك كيفية صياغة الافعال المتعدية من اللازمة وعلامات المصدر ، ثم السوابق الظرفية التي تلحق بها لصياغة الافعال المزيدة لتغيير دلالاتها . فاللواحق التي تصاغ بها الافعال للدلالة

على المطاوعة وتكرار الحدث . ثم للمصادر القياسية فالسماعية ، فاسماء الفاعلين والمفعولين . وقد أحاط الحديث بكل جوانب الاشتقاق والصرف فى الافعال احاطة شاملة ، وهو اهم جانب من جوانب احياء اللغة وانمائها وتطويرها . وسيكون حديثنا اللاحق في (نحو اللغة) اكمالا للمنهج الذي بدأناه في احاديثنا السابقة بدراسة في أصوات اللغة الكردية ... ونكون بذلك قد قدمنا منهجاً علمياً وفق أساليب علم اللغة الحديث لدراسة اللغة من حيث الاصوات والمفردات والنحو وهى الجوانب الاساسية التي يدرسها باحث اللغة لرصد قواعدها ومعرفة جوانب الضعف والانحلال فيها وطرق معالجتها والعمل على تطويرها وتوسيعها .

* * * * *

# المراجع

## باللغة الكردية


١ ـ مخطوطات الاستاذ توفيق وهبي المصورة لدي .

٢ ـ اعداد مجلة المجمع العلمي الكردي الصادرة حتى الان (جميع البحوث المنشورة حول اللغة الكردية وقواعدها) .

٣ ـ جميع مطبوعات المجمع العلمي الكردية المنشورة حول اللغة الكردية وقواعدها خاصة .

١ ـ جى له بارەى زمانى كوردييەوه توسراوه
د عبدالرحمن معروف

٢ ـ چاوگـی بۆ واتا — د. نسرین فخری

٣ ـ فۆنۆلۆژی کوردی — محمد امین هەوراماني

٤ ـ القواميس والمعاجم الكردية

١ ـ قاموسی خال — الشيخ محمد الخال

٢ ـ قاموسی مردوخ — الشيخ محمد مردوخ

٥ ـ دەستوری زمانی کوردی — الاستاذ توفيق وهبي

٦ ـ قواعدی صرف ونحوی کوردی — سعيد كابان

## باللغة العربية الحديثة

١ ـ مقدمة في علم اللغة — د. محمود السوان

٢ ـ علم اللغة — د. علي عبدالواحد وافي

٣ ـ من اسرار اللغة — د. ابراهيم انيس

٤ ـ منهج البحث في اللغة — د. تمام حسان

٥ ـ اللغة بين المعيارية والوصفية — د. تمام حسان

٦ ـ دراسات في علم اللغه — د كمال محمد بشر

## القديمة

١ ـ الكتاب — سيبويه

٢ ـ سر صناعة الاعراب — بن جني

٣ ـ الخصائص — بن جني

٤ ـ المعاجم العربية المعروفة

## باللغــــة الانـكليزيـة

1 - Language . L. Bloomfield
2 - Arabie grammar . Wright . Z. V.
3 - Language . Vendryes .
4 - The Dialect of Awraman . D. Mackenzie
5 - Kurdish Dialct studies D. Mackenzie
6 - A Concise Pahlavi Dictionary. D. Mack.
7 - A Kurdish English Dictionary . T. Wahby

## باللغــــة الفارســـيه

١ ـ دستور زبان فارسی اغای محمد مشکور
٢ ـ دستور زبان فارسی د. قاسم انصاری


* * * * * *

# پاشگری «اندن»[1] لە زمانی کوردیدا[2]

ئەندامی یاریدەر : د. نەسرین فەخری

پێش ئەوەی بێینە سەر باسی ئەم پێشگرە پێویستە بزانین کە دوو پاشگری کاری (فعلي) لە زمانی کوردیدا هەیە، یەکەمیان پێشگر و

(١) ئەم باسە بۆ یەکەم جار وەك باسێکی سەربەخۆ بلاو دەکرێتەوە، بەلام لە نامەی دوکتۆرییەکەماندا و لە باسی گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ و هەروەها لە باسی دروست کردنی چاوگە لە ناوی دەنگی سروشتی لە بەر بەشدار بوونی پاشگری «اندن» لە پێکهاتنیان ناوی ئەم پاشگرە هاتووە .

(٢) بۆیە دەڵێین لە زمانی کوردیدا یەك : بۆ ئەوەی سەرنجی خوێنەر رابکێشین بۆ تایبەتییەکانی ئەم زمانە سەربەخۆیە و بۆ تێکەڵ نەکردنی بە زمانی تر ، دوو : چونکە هەمان پاشگر لە زمانی فارسیشدا هەیە ، بە کورتی ئەم پاشگرە پاشگرێکی ـ ئێرانی ـ یە نەك لە فارسییەوە وەرگیراوە ، یان بە پێچەوانە ، بەلام لە هەر زمانەدا سەرەڕای هاوبەشی و لەیەك چوونیان جیاوازیشیان لە نێواندا هەیە ، ئەم جیاوازییە سەربەخۆیی و پێشکەوتنی هەر زمانە بە تەنیا و لەرێگەی خۆیەوە دەردەخات .

پاشگری « وە ـ we ـ ڤە ـ ve »(۳) یە دوەمیان پاشگری « اندن ـ andin » کە لەم وتارەدا باسی دەکەین . نەك وەك تائێستا تەنیا « وە ـ ڤە » بە پاشگری کارێ دانرابێ .

هەر چەندە ئەم دوَ پاشگرە جیاوازێ و پەیوەندییان لە نێوانیدا هەیە ، بەلاَم هەردوَکیان کەلێنێکی باش لەم زمانەدا پڕدەکەنەوە ؛ بەو دەورە گرنگ و بالاَیەی دەینوێنن هەر وەك لەمەودوا بۆمان دەردەکەوێت ، بەلاَم بەقەد گرنگێ ئەم پاشگرە لەم زمانەدا ئەوەندە یا : هەستێ پێ نەکراوە ، یا پشت گوێ خراوە ، یان : کاتێ باس کردنی رواڵەت و ناوەرۆکی بە جۆرێك تێك دراوە ؛ نە سەرنج بۆ گرنگێ رادەکێشێت و نەشتێکی روَن دەدات بە دەستەوە و نەکەس بە تەواوێ وێنەی راستەقینە و دەوری ئەم پاشگرەی بۆ روَن دەبێتەوە . ئێمەش لێرەدا لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە بە پێویستمان زانی کە بە پێی توانا لێی بکۆڵینەوە و شتێك بخەینە پێش چاو .

پێش ئەوەی بێینە سەر دەور و تایبەتیەکانی ئەم پاشگرە لە زمانەکەماندا پێویستە بەتەواوێ رواڵەتی ساغ بکەینەوە بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ئەو هەلاَنەی پێشتر دەربارەی کراون دوَبارە نەکرێنەوە و هەر جارەش بە ناوێك و رواڵەتێکی تازە نەخرێتە بەرچاو ، ئەو غەڵەت و ناتەواویانەی کە لە چوارچێوەی رواڵەتەکەی چونەتە دەرەوە بەرەو

(۳) بڕوانە : گـۆڤاری کـۆڕی زانیاری کورد . بەغدا ، ساڵ : ۱۹۷۳ ، ز ـ ۱ ل :۲۳٤

تێکدانی بنــکەکانی ڕێزمانیش لەو شوێنانەدا .

یەکەم : ئایا « اندن ـ andin » پاشــگرە[٤] یان ئامرازە[٥] ؟

(٤) له نامەی دوکـتۆرێیەکەماندا له باسی پاشگر و کاردا ، تەنها باســی پاشگری « وە ـ we ـ ڤە ـ ve »مان کرد و وەك پاشگرێـکی کاری ؛ چونکه بەم جۆرە بۆمان ڕوَن ـ نەبوَبۆوە کە ئەمیش وەك : « وە ـ we » پاشگرێـکی کارییه ، هــەر وەك بەتەواوی بۆمان ڕوَن نەبوَبۆوە کە پاشگری « وە ـ ڤە » پێشگرێـکی کاریشه له هەمان کاتدا . واتــە بۆ یەکەم جار ئەم دوَ پاشگرە یەك دەخرێن له باسێـکدا ، هەرچەندە له بەر وردی و درێژی باسەکە یەك یەك و بە جودا بلاوکراونەتەوە .

(٥) ئافیـکس ـ Afixus سوفیکس ـ پاشگر و ، پرێفیکس ـ پێشگر و ئینفیکس ـ ناوگر دەگرێتەوە . ئینفیکس واتە ناوگر له کوردیدا نیه ، بەلام له عەرەبیدا زۆر بە کاردێت ، ئەم ئافیکسە پەیوەندی بە وشەوە هەیه ، واتە دەوری خۆی بە هەرســێ جــۆرەکەی لەگــەڵ وشــەدا دەنوێنێت بە پێی بنکەو پەیڕەوی تایبەتی کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك له لقە زانستییەکانی زمان کەپێی دەگوترێت : Morfologia ـ علم البنیه ـ زانستی پێکهــاتنی ڕواڵەتی وشه ، وە ئامراز : preposition پەیوەندی بە ڕستەوە هەیه ، واتەلە ڕوی واتا و مەبەست ڕوَن کردنەوە وشەکان پێـکەوە دەبەستێت ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ لقێـکی دیکە له زانستی زمان کە پێی دەگوترێت : سینتاکس : Syntax علم التنظیم : زانستی ڕێکخستنی وشه ، مەبەســت ڕستە پێکهاتنە ، ئەم دوانــەش پێـکەوە ڕێزمان : گرامێر ـ Grammaire دروست دەکەن .

بەلاتینی بە پاشگر دەگوترێت « سوفیکس snfizus [٦] » کە زاراوەیێکی زمانییە بەو بەشە دەگوترێت کە بەتەنیا واتای نیە و بەکار نایێت ، بەلام کە دەلکێت بەکۆتایی وشەوە کەم ، یان زۆر روالەت و ناوەرۆکی دەگۆرێت بە پێچەوانەی ئامراز [٧] کە پەیوەندی بە رستەوە هەیە ، نەك بە وشەوە . لێرەدا ئەگەر سەرنجی « اندن ـ andin » بدەین و لەم وتارە ورد ببینەوە بۆمان بە دیار دەکەوێت کە « اندن » پاشگرە نەك ئامراز ؛ چونکە پەیوەندی بە وشەوە ، نەك بە رستەوە هەیە [٨]

---

(٦) دوبارە پروانە گۆڤاری کۆری زانیاری کورد . ز ـ ١ ، د. نەسرین فەخری باسی پاشگرو پێشگری ڤە ـ یان ـ وە لە زمانی کوردیدا .

(٧) ئامراز : Preposition ـ أداة « ئەو بەشە نەلۆزراوەیە لە ئاخافتن ، کە پەیوەندی گراماتیکی نێوانی وشەکان لە رستەدا دەردەخات .

(٨) هۆی تێکەل کردنی ئەم دوو بەشە ( ئافیکس و ئامراز ) دەگەرێتەوە بۆ لەیەك چونیان لە هەندێك تایبەتیدا ، بەلکو لە یەك چونی هەندێکیان لە روالەتیشدا لەم زمانەدا وەك لە یەك چونی ( وە )ی پێشگر و پاشگر و ( وە )ی ئامراز . هەروەها بۆ نەشارەزایی لە چۆنیەتی لێکۆلینەوە و جودا کردنەوەیان ، ئافیکس بە پێی شوێنی بەکارهێنانی ناو دەنرێت واتە پێی دەلوترێت پریفیکس ـ پێشگر بەکەوتنە پێش بناغەی وشە ، سوفیکس ـ پاشگر بەکەوتنە پاش بناغەی وشە ، ناوگر ئینفیکس بەکەوتنە ناو بناغەی وشە .

دوەم : ـ ئایا ئەم پاشگرە ( اندن ـ andin ) یا « اند ـ and [9] ،
یان : انن anin ، یان ( دن ـ din ) » ؟

ئەم پاشگری ( اندن )[10] » بەو چوار شێوەیەی سەرەوە خراوەتە

---

(۹) ئەم « ماند ـ amd »» هیچ پەیوەندیەکی بە « اند ـ and »ی زمانی ئنگلیزییەوە نیە و ئەمی دوەم پێتی پێوەندە لەو زمانەدا .

(۱۰) لەو بەڵگانەی بۆمان دەردەخەن کە ئەم پاشگرە « اندن »» بۆتی کەلێك پاشگری ترە لەم زمانەدا کە کۆنابی‌یان بە نوێن دێت لەکاتێکدا کە دەچنە سەر وشە و دەیانکەن بەناو نەك بەچاوگە بۆ نموونە : بارین ـ چاوگە ، بار ـ رەگی چاوگە + ئان = باران ناوی کارە ناڵەناڵ ـ ناڵاندن ـ ناڵ + ین = ناڵین ناوی کارە ، هەروەها گریان ـ گرین ، چڵك ـ چڵکن هتد ... لەوانەشە هەندێك سوربن لە سەر ئەوەی کە نوێنەکە نوێی چاوگە و بوە بە بەشێك لە « اندن » ، هەرچەندە ئەمەش پێویستی بە بەڵگە هەیە بۆ چەسپاندنی ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا دوو بارە بەکارهێنانی « اندن » لە جێگەی « اند » باشتر و راسترە ، یەك : لەبەر ئەوەی نابێتە هۆی تێکدانی بنکە و پەیرەوی زمان لەم شوێنانەدا ، دوو : ئاسانتر و کورتتر و روونترە ، سێ : لەبەر ئەوەی کار لەم زمانەدا و بەگشتی لە زمانە هیندو ـ ئەوروپیەکاندا لە چاوگە وەردەگیرێت ، بە پێچەوانەی زمانی عەرەبی ( لەبنەماڵەی زمانە سامیەکان ) » کە لە کارەوە دەست پێ دەکرێت ؛ چونکە کار خۆی بەشێکە لە چاوگە : infinitive کە ئەمەش یەکێکە لە تایبەتیە جیاکەرەوەکانی زمانی کوردی لە زمانی عەرەبی ، هەر ئەمەش یەکێکە لەو هۆیانەی رواڵەتی ئەم پاشگرەی تێکداوە بە هۆی کەوتنە ژێر باری=

پێش چاو بەم جۆرەی خوارەوە :ـ باسکردنی لە شێوەی « دن » دا لەکاتێکدا کە ئەم پاشگری « دن » ەی کە لە جێگەی پاشگری «اندن» بە هەڵە باسکراوە بۆتی نیە، بەڵکو لێرەدا « دن » کورت کراوەی،

= زمانی عەرەبیەوە هەروەها لە ئەنجامی لاسایی کردنەوەی زمانی فارسیش کە پەیڕەوی زمانی عەرەبی کردوە ، لەکاتێکدا کە پێویستە لە سەر بنکە و دەستوری زمانەکە خۆی یان ئەو بنەماڵەیەی دەگەڕێتەوە سەری نەك زمانی بنەماڵەیێکی تر ، لێرەدا تەنیا ئەوەندە دەڵێین دەربارەی رواڵەتی ، بەڵگەکانی دیکەش بەرە بەرە لەگەڵ ئەم باسەدا و لە شوێنی خۆیدا دەیخەینە پێش چاو ، لەبەر دووبارە نەکردنەوە لێرەدا لەوە زیاتر لە سەری ناڕۆین ، چوار : لەبەر ئەوەی « اند » یەکسەر ناچێتە سەر بناغەی چاوگە یان یەکسەر ناکەوێتە نێوانی رەگی چاوگە و نیشانەی چاوگە ، یا نێوانی بناغە و نۆتی چاوگە ، یان سەر رەگی کار ، بەڵکو ئەم پاشگرە دەچێتە سەر گشت ئەو بەشانە بە پێی پێویستی ، لەکاتێکدا دەبینین کە لە زمانی تورکیدا بەگشتی ئەو پاشگرەی وەك « ماندن » چاوگی تێنەپەڕ دەکات بەتێپەڕ یەکسەر دەکەوێتە نێوانی رەگی چاوگە و نیشانەی چاوگە بۆیە رواڵەتی ئەو پاشگرە هیچ تێك نەچوە ، لەوانەیە هەندێك ئەم پاشگری تورکییە بە ناوگر ( ئینفیکس ) ئۆ بکەن ؛ چونکە دەکەوێتە نێوانی دوو بەشی چاوگەکە کە رەگە و نیشانەی چاوگن ، بەلام کاتێك پێی دەگوترێت ( ئینفیکس ) ، ئەگەر کەوتە ناو بناغەی وشە ، نیشانە و نۆتی چاوگە بەشێك نین لەو بناغەیە ، ئەگەر وا بوایە دەبوو ( اندن ) یش ناو بنرێت ئینفیکس بەکەوتنە نێوانی بەشی یەکەم و نۆتی چاوگە ئەگەر نۆتەکەی بە نۆتی چاوگە دابنێین ، لەکاتێکدا ئینفیکس لە عەرەبیدا ئاشکرایە وەك : کتب ـ کاتب ( ا ) کەوتۆتە ناو بناغەی=

« اندن »ە و یەکێکە لە نیشانەکانی چاوگ لە کوردیدا بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستییە باسەکەی مامۆستا نووری عەلی ئەمین کە دەربارەی گۆڕینی کاری تێنەپەڕە بۆ تێپەڕ دەخەینە پێش چاو کە دەڵێت : « چاوگە ئەلفیەکان و چاوگە یائی یەکان بە پیتە پاشگری ( دن ) دەکرێن بە تێپەڕ ، بەلکاندنی ( دن ) یەکسەر بە یەکەوە و بە دووەمەوە پاش گۆڕینی ( ی ) بۆ ( ا ) » . هۆی ئەم هەڵانە لەبەر ئەوەیە کە چاوگە ئەلفیەکان کۆتاییان

---

= وشەکە ، نموونەش لەمانە زۆرن بە سەرنجدان زیاتر ڕوون دەبێتەوە ، نموونە بۆ زمانی تورکی بۆ ئەوەی لەگەڵ کوردیدا بەراوردیی بکەین و فارسیشی پێ ڕوون بکەینەوە وەك : یازماغ ـ چاوگی تێپەڕ بە واتای نووسین : یاز ـ ڕەگی چاوگە و کار ، یاز + در + ماغ پێ نووسین ـ نفیساندن ، ئۆیلماغ ـ مردن ـ تێنەپەڕ ـ ئۆیل ـ در ـ ماغ ـ مراندن ـ کوشتن هتد . ، نموونە بۆ کوردی گرمەگرم ـ ناوی دەنگی سروشتی ـ گرم + اندن = گرماندن ، کەوتن ـ چاوگی تێنەپەڕ ـ کەو ـ ڕەگی چاوگە و کار + اندن = کەواندن ، حەسان + وە = حەسانەوە هتد ، واتە لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە کە لەم نموونانەدا دەردەکەوێت ، وە بۆ دروست کردنی چاوگە یەکسەر ، نەك پێشان کار دەڵێین « اندن » چونکە هەموویان یەك دەخات و لە بنکەیێکدا کۆیان دەکاتەوە و لەمەو دوا باشتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە ، وە وەك پێناسینەکەی سەرەوە هەرگیز ناکەوێتە نێوانی ڕەگی وشە و کۆتایی وشە ؛ چونکە ئێمە لێرەدا ناتوانین یەکسەر وشەکە وەرگرین و کۆتاییەکەی لابدەین و پاشگرەکەی بخەینە شوێن و کۆتاییەکە بگەڕێنینەوە . دوو بارە سەرنجی نموونەکان بدەنەوە .

بە(ان) هاتوە و (اندن) بە (ان) دەست پێ دەکات و (ان)ی (اندن) بە(ان)ی چاوگ دادەنێت بۆ یە(اندن)ی کردوە بە(دن). لە چاوگە یائیەکاندا (لی) دەکات بە(ا) بە بێ هیچ بەڵگەیێک تەنیا ئەوەندە نەبێت رێگەیێک بدۆزێتەوە بۆ دروست کردنی (دن) لەو شوێنانەدا کە گۆڕینیان بەسەردا هاتووە و ئەو گۆڕینانەی بۆ نەدۆزراوەتەوە. لە چاوگە دالی و تائی و واویە ـ کاندا ئەمەی بۆ نەکراوە ؛ چونکە هەندێك لە چاوگەکان بە گۆڕینی پیتی پێش نونەکە جێ بەجێ نابن و نەیتوانیوە بگات بەوەی کە ئەمانە رەگی کارن و بنکەی تایبەتی هەیە بۆ وەرگرتنیان ، وە ئەوەی چۆتە سەر ئەو رەگانە پاشگری (اندن)ە کردوّنی بە چاوگی تێپەڕ بۆیە لە ئەنجامیشدا دەڵێت : «کە بنواشەیەکی رێك نیە بۆ ئەوەی پێی بکرێ بە تێپەڕ ، بەڵام کە کران بە تێپەڕ کۆتاییان بە(ئاندن) دێت[11]»

ئێمە ئێستا ئەو نموّنانە بە پێی بنکەی سەرەوە دەکەین بە تێپەڕ ، وە ئەوەی پێویستە دەری بخەین ئەوەیە کە بەشەکانی رێزمان زنجیرەیێکی نەپچڕاون یەکتری تەواو دەکەن و لێکۆڵینەوەی زمان نەك لێکدانەوەیە و بەس بەڵکو زمان زانستەو رێگەو بنکەی تایبەتی هەیە و لە چوار چێوەیدا دەجوڵێتەوە ؛ بەم جۆرە زمانی کوردیش بنکە و پەیڕەوی پتەو و رێك و پێکی خۆی هەیە ، ئەوەی ئەم راستییە بزانێت نەبەشەکانی زمان تێك دەدات و نەسیمای گەلێك بەشی

(11) نوری عەلی ئەمین .

گرنگ سەرە و ژێر دەکات . نموونەکان ئەمانەی خووارەوەن :

« شڵەقان : شڵەق ( رەگی چاوگ ) پاش لادانی نیشانەی چاوگ + پاشگری ( اندن ) = شڵەقاندن ، سووتان : سووت ( رەگی چاوگ ) + اندن : سووتاندن ، پیشان : پێش ( رەگی چاوگ ) + اندن = پێشاندن ، وەرین - وەر ( رەگی چاوگ ) + اندن = وەراندن ، تەپین - تەپ + اندن = تەپاندن ، تەقین - تەق + اندن = تەقاندن » نەك بە گۆڕینی ( ی ) بۆ ( ا ) + دن .

خەوتن - خەو ( رەگی چاوگ و کار - ناوی کاریشە ) + اندن = خەواندن ، گەیشتن - گە ( رەگی کار ) + ی[12] + اندن = گەیاندن ، مردن - مر ( رەگی چاوگ و کار ) + اندن = مراندن[13] واتە تێکرا هەموویان پاشگری ( اندن ) لە تێنەپەڕەوە

(12) دوو پیتی بزوێن دوا بە دوای یەك هاتوون بۆیە پیتی (ی) کەوتۆتە نێوانیان .

(13) نوری عەلی ئەمین . رێزمانی کوردی . سلێمانی ، 1960 ، 145 ، 146 ، 147 .

- بۆیە ئەم کتێبەمان هەڵبژارد ؛ چونکە دوا کتێبە و باسی کتێبەکانی پێشووی تێدا دووبارە کردۆتەوە - هەروەها لێرەدا ئەو بنکانەی بەستوە بە نیشانەی چاوگەوە ، لە کاتێکدا هیچ پەیوەندییەکی بە بنکەوە نیە ؛ چونکە رواڵەتی وشە کار ناکاتە سەر بنکە ، بەڵکو لەوانەیە جۆری پێکهاتن و ناوەرۆکی وشە کار بکەنە سەر بنکەکانی زمان .

کردنی بە چاوگی تێپەڕ . هەروەها دەڵێت : « دیسان گەلوگی لازم بە واتەی ( اند ) [14] بکرێ بە متعدی بەڵام تۆزێ لەسەر زمان قورسە [15] » ، هۆی قورسێ چیە ؟ نازانین [16] .

دەربارەی ( مانن ) دەڵێت : « هەندێك كەس پیتی ( د ) فڕێ دەدات بۆ ئاسانی ، واتە لە باتی ســوتاندن ، لەوەڕاندن ، دەڵێن ســوتانن ، لەوەڕانن [17] ئەگەر ئەمە لە قسەکردندا ببێــت ، لە

(١٤) لێرەدا لە جێگەی پاشگری ( واتە ) پێشتر پیتە پاشگری بەکارهێناوە .

(١٥) پاشکۆی کتێبی ( قەواعدی زمانی کوردی لە صرف و نەحو )دا بەغدا ، ١٩٥٦ .

(١٦) ( اندن ) نەك ( اند ) بگەڕێنەوە بۆ پەراوێزی لاپەڕەکانی پێشوو .

(١٧) نوری عەلی ئەمین ، پاشکۆی کتێبی ( ڕێزمانی کوردی ) ، سلێمانی . ١٩٥٨ ، ب ٢ ، ل ٦٣ . لە ناوچەی سلێمانیدا پیتی ( د ) لەگەلێك وشە فوت دەدرێت ، چاوگ بێت ، یا ناو ، یان ئامراز ، وە بەگشتی لەو چاوگانەی ( اندن ) یان دەچێتە سەر وەك : خنکاندن ـ خنکانن ، سوتاندن ـ سوتانن ، برژاندن ـ برژانن هتد . . بۆ نموونە : دڵی شکان ـ لە جێگەی دڵی شکاند ، دڵ شکانن قورسە لە جێگەی شکاندن ، بۆ دۆزینەوەی کارەکە دەخرێتە کاتی رابوردوو وەك نموونەکانی پێشوو ، چونکە ئەم کاتە هەمیشە پێك دێت بە لابردنی نونی چاوگ واتە بۆ کردنەوەی بە چاوگ ئەو بناغەی کاتی رابوردوە وەردەگرین و دوبارە نونی چاوگەکەی دەخەینەوە سەر ، ئەگەر هاتو دوو ( ن ) کەوتنە یەك ئەوە دیارە کە لە نێوانی ئەو دوو ( ن )ەدا پیتێکی فوت دراو هەیە کە

نوسین و خوێندندا نابێت ، وه نابێت بچێته زمانی خوێندنه‌وه بۆ پاراستنی بنجی وشـــه و زمانه‌که‌مان له تێك چوون و ئاڵۆزی ، هه‌رچه‌نده ئێمه له‌و رایه‌داین که مامۆســـتا توری عـه‌لی ئه‌مین ئه‌م (اندن) و (دن)ه‌ی له‌سه‌ر مامۆستا توفیق وهبی نوسـیوه‌ته‌وه یان وه‌ری گرتوه به‌بێ ئه‌وه‌ی باسی ـ بکات ، به‌ڵام ئێمه بۆیه پێشمان خست له باس‌کردندا ، چونکه زیاتر له سه‌ری رۆیشتوه و نموونـه‌ی زۆرتری هێناوه‌ته‌وه له‌گه‌ڵ چۆنیه‌تی گـۆڕینیـان له تێنه‌په‌ڕه‌وه بـۆ تێپه‌ڕ ، بۆیه ئاسانتر ده‌توانین له رێـگه‌ی نموونه‌كانی خۆیه‌وه وه‌ڵامی بده‌ینه‌وه و ده‌ری بخه‌ین که ئـــه‌و (دن)ه (اندن)ه ، بۆ ئه‌مه‌ش بڕواننه ئه‌و به‌شه‌ی مامۆستا تۆفیق وه‌هبی که له باره‌ی گۆڕینی كاری تێنه‌په‌ڕ بۆ تێپه‌ڕه و که ده‌ڵێت : « ئه‌توانرێ فیعلێـکی لازم بکرێ

= پیتی (د)ه ، له هه‌مان کاتدا بۆمان روون ده‌بێته‌وه که چاوگـه‌که پاشگری (اندن)ی چۆته سه‌ر و تێنه‌په‌ڕیشه ، یا ناوی ده‌نگی سروشتین بوون به چاوگـی تێنه‌په‌ڕ ، له‌به‌ر ئه‌مه به هیچ جۆرێك نابێت ئه‌م پیتی (د)یـه له خوێندن و نوسینیدا فه‌رامۆش بکرێت ، چونکه نه‌نوسین و به‌کار نه هێنانی ده‌بێته هۆی تێـکدانی رواڵه‌تی وشه‌که ، یان تێـکه‌ڵ کردنی به وشه‌ی تر ، یان تێـکدانی رێزمان و سه‌ر لێ شێوان ، بۆ نموونه مه‌ند و په‌ند کراون به (مه‌ن) و (په‌نـگ) وه‌ك : په‌ندی پێشینان مه‌به‌ســت (عبرة)ی عه‌ره‌بییه نه‌ك په‌نـگ خوارد نه‌وه‌ی ئاو که واتای کـۆبوونه‌وه و وه‌ستان ده‌گرێته‌وه ، به‌م جۆره‌ش له شێوه‌ی خواروودا (د) قووت ده‌درێت به‌گشتی له چاوگـه دالییه بنجییه‌کان وه‌ك : کردن ـ کرن ، بردن ـ برن ، مردن ـ مرن هتد . . .

بە موتەعەددیی و ئەو فیعلە موتەعەددییانەی وا دروست بۆن باسلێکراو و کار و حاڵی فیعلە لازمەکە بە تەواوکەرێکی سەربەخۆ بێنێتە مەیان وەکو : من دارەکەم سۆتاند لێرەدا فیعلی « سۆتان » « دارەکە » کردی ، بەڵام باسلێکراوی « مین » پێی کرد ـ مەبەست لە مین ـ من ـ ە .

لە کۆمەڵی یەکەم و دوەمدا ( اندن ) ئەخرێتە دوای رەگەوە وەکو :ـ

| کۆمەڵ | فیعلی لازم | رەگ | فیعلی موتەعەددی |
|---|---|---|---|
| ١ | نۆستن | نو | نواندن |
| | بزوتن | بزو | بزواندن |
| ٢ | چەقین | چەق | چەقاندن |
| | لەوەڕین | لەوەڕ | لەوەڕاندن |

تا دێتە ســەر « لە کۆمەڵی سێیەما « دن » ئەخرێتە دوای مەسدەرەوە ، وەکو :

| فیعلی لازم | فیعلی موتەعەددیی |
|---|---|
| سۆتان | سۆتاندن |
| قڵیشان | قڵیشاندن |
| گەڕان | گەڕاندن[18] |

جگەر خوێن تەنیا ئەوەندە دەڵێت بۆ گۆڕینی چاوگی تێنەپەڕ

(١٨) تۆفیق وەهبی ، دەستوری زمانی کوردی ، ج١ ، بەغدا ، ١٩٢٩ ل ١٨ ، ١٩ .

بۆ تێپەڕ « (انـدن) له جێی (انـ) « ین » دادەنێین ، وە بـەم دەنـگە « ئاند » کاری تێنەپەڕ دەکات بە تێپـەڕ »[19] وە هەندێك نمونەی بە هەڵە هێناوەتەوە وەك : بەرانبەر بە چوون (شـاندن)ی نوسیوە کە بە واتای (ناردن)ە ، ئەمە وەك هـاومەبەست دەنوسرێت ، بەڵام باس لێرەدا باسی چۆنیەتی گۆڕینی کاری تێنەپەڕە بۆ تێپەڕ ، ئەگینا چۆن « چوون » پاش کردنی بە تێپەڕ لە رێـگەی « اندن » ەوە دەبێت بە « شاندن » ؟ .

بۆ ئەوەی خوێنـەر وا تێنەگات کە ئێمە تەنیا ئەو چەنـد سەرچاوانەمان هەڵبژاردوە بۆ باسکردن و سـەرچاوەکانی ترمان پشت‌گوێ خستوە ، ئێسـتا لە خوارەوە ناوی هەندێك سـەرچاوە دەخەینـە پێش چاو کە سەیرمان کردوون بەڵام باسـی پاشـگری « اندن » یان تێدا نیە :ـ

١ـ سعید صدقی کابان . مختصر صرف و نحوی کوردی ، بەغدا ، ١٩٢٨ ، ل ٣٤ ـ ٥٠ .

٢ـ دوکتۆر قەنات کوردۆییێف ، دەستوری زمانی کوردی ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ، ١٩٥٧ . دەربارەی شێوەی ژوورو (کرمـانجی) بە زمانی روسی .

٣ـ دوکتۆر چەرکەسی بەکۆ ـ باکاییێف ، فەرهەنگی کوردی ـ

(١٩) جگەر خوێن ، آواو دەستورا زمانێ کوردی ، بەغدا ، ١٩٦١ ، ل ٣٩ـ٤٠ .

رۆسی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧ ، ل ٥٥٩ ـ ٥٧٧ .

٤ـ دوکتۆر یو . یو . ئاڤالیانی . تایبەتیـەکانی جوتە کار و پێـکهاتنی لە زمانی کوردیدا ، یەکێتی سۆڤیەت (سـەمەرقەند) ، ١٩٥٩ . بە زمانی رۆسی .

٥- Dr. D. N. Mackenzie . Kurdish Dialekt Studies I. London . 1961 .

دوکتۆر مەکەنزی تەنیـا لە لاپـەڕە (١٤٧) ئەم نمونانەی هێناوەتەوە بۆ ناوی دەنـگ : بۆڵە ـ بۆڵانن ، باڕە ـ باڕانـن ، فیـکە ـ فیکانن ، حیلە ـ حیلانن ، وە لە لاپـەڕە : ١٤٩ لەگـەڵ کاردا ، ئەم نمونانەی نوسیوە : بڕژانن ، کـوڵانن ، سوتانن ، شکانن ، تۆقانن ، خورانن ، بە بێ باسکردنی پاشـگرەکە بە تەنیا یا ناو هێنانی .

٦ـ دوکتۆر قەنات کوردۆییێف ، زمانی کوردی ، بە رۆسی ، مۆسکۆ ، ١٩٦١ ، ل ٣٩ ـ ٥٧ .

٧ـ دوکتۆر . ی . ی تسۆکەرمان ، تێبینی دەربارەی گرامێری زمانی کوردی ( کرمانجی ) ، مۆسکۆ ، ١٩٦٢ ، بە زمانی رۆسی .

٨ـ دوکتۆر کـەریم . (. ئەییوبی و دوکـتۆر . ی ئا. سمیرنۆڤا ، شێوەی کوردی موکری ، بە زمانی رۆسی ، لێنینـگراد ، ١٩٦٨ ، ل ٦٧ ـ ١٢٩ .

## « دەوری پاشگری « اندن ـ Andin » لەگەڵ تایبەتیەکانی لە زمانی کوردیدا »

یەکەم : تاقە یەك بنکەی رۆن و ئاشکرا هەیە بۆگۆڕینی کار له تێنەپەڕەوە بۆ تێپەڕی سادە ، ئەویش بە یاریدەی پاشگری اندن ـ ( Andin ) ە[20] ، واتە پاشگری ( اندن ) چاوگی تێنەپەڕ دەکات بەتێپەڕ ، هەروەها تاقە پاشگرە بۆ دروست کردنی کاری تێپەڕی سادە له تێنەپەڕەوە[21] ، واتە هەر پاشگرێکی دی کەوتە بەر

(۲۰) ئەوانەی لە سەر پاشگری ( اندن ـ andin » نوسیویانە هەمان هەڵەیان دوبارە کردۆتەوە دەربارەی رواڵەتی ، بەنوسینەوەیان یەك لە سەر یەك بەبێ لێکۆڵینەوە و دەرخستنی هۆ ، یان گەڕانەوە بۆ ئەوانەی لە وێنەی « اندن » باسیان کردوە ، ئەمە له کاتێکدا کە ئێستا لە زمانی فارسیشدا له وێنەی « اندن »دا باس دەکرێت ، بەتایبەتی لە لایەن زمانەوان و رۆژهەلاتناسەکانەوە ، لەگەڵ راست کردنەوەی باسی تریش کە بریتی بوە لە لێکدانەوە و لاسایی کردنەوەی پەیڕەوی زمانی تر ، ئەوەی ئاشکرایە زمانی عەرەبی کارێکی باشی کردۆتە سەر دراساتی زمانی کوردی و فارسی .

(۲۱) ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە رێگەی دیکە نیە بۆ دروست کردنی کار و چاوگی تێپەڕ ، بەڵکو کاری یارمەتیدەریش دەورێکی باڵای هەیە لە دروست کردنی دەیەها کاری تێپەڕی دروستکراو و لێکدراودا ؛ چونکە ئەو کارانەی لە بنجدا تێپەڕ و تێنەپەڕن لەو شوێنانەدا کە دەچنە جێگەی یەکدی ئەو مەبەستە دەگەیێنن ، بۆ نمونە : کەوتن ـ =

چاو دیارە کە پاشگرێکی سەربەخۆ نیە بەڵکو بریتییە لە تێکدانی رواڵەتی ئەم پاشگرە لە ئەنجامی تێکەڵ کردنی لەگەڵ ئەو وشانەدا کە پێیانەوە دەلکێت ، هەروەك لە خوارەوە بە نموونەوە دەیخەینە پێش چاو :

بۆ نموونە : کەوتن ـ تێنەپەڕە ، کەو (رەگی چاوگ و کار)ە + پاشگری « اندن » = کەواندن تێپەڕە و هاومەبەستی (خستن)ە .

خەوتن ـ بەواتای نوستن و هەردوکیان تێنەپەڕن ، خەوتن ـ خەو (رەگی چاوگ و کار و ناوی کاریشە + پاشگری « اندن » = خەواندن ، تێپەڕی سادە و دروستکراوە ، نوستن ـ نو ـ (رەگی کار)[22] ، دە ـ نوم ، نو + پاشگری « اندن » = نواندن ـ

---

= تێنەپەڕ ، خستن ـ تێپەڕ ، سەرکەوتن ـ تێنەپەڕ ، سەرخستن ـ تێپەڕ ، گەرم بوون ـ تێنەپەڕ ، گەرم کردن ـ تێپەڕ ، بەربوون ـ تێنەپەڕ ، بەردان ـ تێپەڕ ، دەرهاتن ـ تێنەپەڕ ، دەرهێنان ـ تێپەڕ هتد ...

(٢٢) چەند بنکەیێك هەیە بۆ وەرگرتنی رەگی کار ، ئێرە جێگەی باس کردنی نیە ، بەلام رێگەیێکی تری ئاسان هەیە بۆ دۆزینەوەی ئەویش بەگوێزینەوەی کارەکەیە بۆ کاتی ئێستا ، پاشان لە ئامرازی کاتی ئێستا کە (دە)یە و هەروەها لە راناوی کەسی لکاو جودای دەکەینەوە ئەوەی دەمێنێتەوە رەگی کارە (جذر الفعل) ، بۆ نمونە : نوستن ـ دەنوسن ـ نوس رەگی کار و چاوگە ، گوتن ـ دەڵێت : لێ ـ رەگی کارە و بناغەی کارە بۆ کاتی ئێستا و داهاتو ؛ چونکە رەگی کار هەمیشە و لە هەمان کاتدا بناغەی کارە بۆ ئەو کاتە . =

تێپەڕی سادە و دروستکراوە بە واتای خەواندن .

چوون - تێنەپەرە بە واتای ڕۆیشتن ، چو - بناغەی چاوگ + پاشگری (اندن) = چواندن تێپەڕی سادە و دروست کراوە بە واتای ناردن ، ڕەوانە کردن .

سرەوان - ئارام گرتن ، سرەوتن ، سەکنین ، سرەواندن : ئارام پێ گرتن ، سەکناندن .

ڕۆیشتن - تێنەپەڕ بە واتای چوون ، ڕۆ (ڕەگی) + پاشگری (اندن) = ڕۆواندن (ڕۆیاندن) - بە واتای جێ بە جێ کردن ، ڕەوانە کردن هتد ...

بەم جۆرە و بە یارمەتی پاشگری (اندن) ، دەیەها کاری تێپەڕی نوێی دروست دەبێت پاش لکاندنی بە ڕەگ و بناغەی

= بۆ ڕەگی چاوگ ناقە یەك بنکە هەیە ئەویش لادانی نیشانەی چاوگە کە بریتییە لە نوونی چاوگ و پیتەکەی پێشی ، بۆ نموونە : نووسین - نووس ، خەوتن - خەو ، کێلاْن - کێڵ . زۆر جاریش ڕەگی کار و چاوگ یەك دەگرنەوە . سەرنجی نموونەکان بدەنەوە .

بناغەی چاوگ هەمیشە یێك دێت بەلادانی نوونی چاوگ کە هەموو چاوگێك لەم زمانەدا کۆتایی بەنوون دێت و بێی دەگوترێت نوونی چاوگ ، ئەم بناغەی چاوگەش هەمیشە و لە هەمان کاتدا بناغەی کارە بۆ کاتی ڕابوردوو ، وەك : کردن - کرد بناغە ، کردم - کاتی ڕابوردوو ، چەندن - چەند - چەندت ، پێوان - پێوا - پێوای هتد . . .

چاوگ و کارەوە[٢٣] .

## دوەم : پاشگری « انـدن » ناوی دەنـگە سـروشتییەکان

(٢٣) زانینی ئەو بنکە وردانەی هەن بۆ وەرگرتنی یان دۆزینەوەی رەگە و بناغەی چاوگە و کار یاریدەمان لە دۆزینەوەی چاوگە و نیشـانەی چاوگە دەدەن ، هەروەها بۆ ناسینی چاوگەکە تێپەڕی بنجی یان دروست کراو بێت بە هۆی « اندن »ەوە کە ئەمەش بە ئاسانی رێـگەمان نیشان دەدات بۆ ناسینەوەی ئەو هەلاَنەی دەکرێن لە نوسیندا ، وە هەر ئەمـەش یاریدەی داین بۆ دۆزینەوەی بنکەی دیکە و راست کردنەوەی گـەلێك لەو هەلاَنەی تا نهۆ دەربارەی رێزمانەکەمان کراون ، بۆ وێنە : ئەگـەر رستە لە کاتی رابوردودا بۆ یەکسەر کارەکە بەبێ رانـاو وەردەگریـن و نونی چاوگـی دەخەینە سەر و دەبێت بە چـاوگە ، وەك : ئـاوەکە رژا ، رژا + ن = رژان ، منداڵەکە کەوت ، کەوت + ن = کەوتن ، هاتم لەوێ نەبوی ، هات + ن = هاتن ، بو + ن = بون .

بۆ راست کردنەوەی هەڵەو شێوەی دروستی کار و چـاوگە ئەگـەر هات و کارەکە لەکاتی رابوردودا بۆ ، بەلاَم کۆتایی بە نون هاتبۆ ، وانە لە شێوەی چاوگـی ( ئەلفی )دابۆ ، دیارە کارەکە تێپەڕی دروست کراوە بە یاریدەی ( اندن ) و پیتی ( د ) لێرەدا قـوت دراوە ، بـۆ نمونە : پشیلەکە جوَلەکەی خنکان ، یان : بای خەزان خونچەی خزان و دڕکی پیر هەر مانەوە . لێرەدا خنکان ـ خنکاند ، وە خزان ـ خزاند ـ ە ، خنکاند + ن = خنکاندن ، خزاند + ن = خزاندن ، لەبەر ئەوەی وەك گوتمان کاتی رابوردو یەکسەر بەلادانی نونی چاوگە پێك دێت ، وە پێش نونی چاوگە تەنیا ئەم پێنج پیتە هەیە « ا ، و ، ی ، د ، ت » ئەگـەر چاوگەکە « اندن »ی وەرگرتبو دیارە کارەکە بە «د» کـۆتایی هاتوە ، چـونکە =

دەکات[٢٤] بە کاری تێنەپەڕ بەم شێوەیەی خوارەوە :

١ـ وەرگرتنی ناوی دەنگە سروشتییەکە و لادانی پیتی بزوێنی « ە[٢٥] ـ e »ی لکاو بەکۆتایی ناوەکەوە + پاشگری « اندن » =

= تەنیا نۆنی « اندن » لادەچێت و « اند » دەمێنێتەوە ، وە ئەگەر کارەکە لە کاتی ئێستادا بۆ وەری دەگرین و لە ئاسەوازی ئەو کاتە و راناوی کەسی جودای دەکەینەوە ئەگەر هات و کۆتایی بە نۆن مانبۆ وە پێش ئەو نۆنە ( یٚ ) هەبۆ دیارە تێپەڕی دروست کراوە بە یاریدەی ( اندن ) ، ئەگەر ( یٚ ) کە بکەینەوە بە ( ا ) و ( دن ) کە نیشانەی چاوگە بخەینەوە سەری چاوگەکە دەگەڕێتەوە ، چونکە یەك بنکە هەیە بۆ رەگی کاری تێپەڕ و تێنەپەڕی دروستکراو کە بناغەی کاری ئێستا و داهاتۆشە ، ئەویش لادانی نیشانەی چاوگە (دن)ە لە ( اندن ) و گۆڕینی « ا » بۆ « یٚ » یە لە « ان » کە بڕگەی یەکەمی « اندن »ە و دەمێنێتەوە و تێکەڵ بە رەگی کارەکە دەبێت و دەبێت بە بەشێك لێی .

(٢٤) مەبەست لە ناوی دەنگی سروشتی ناوی ئەو دەنگانەن کە لە سروشتدا هەن و بریتین لە دەنگی سروشت و گیان لەبەر بە سۆف و ئاژەڵەوە ، وە ئەم دەنگانە لە زمانی کوردیدا کۆتاییان بە بزوێنی « ە ـ e » دێت و بەگشتی دۆ بە دۆ بەکار دێن . مامۆستا شێخ محمدی خاڵ هەندێکی لەم ناوی دەنگە سروشتییانە لە پێشەکی بەرگی یەکەی فەرهەنگەکەیدا بلاوکردۆتەوە ، بەبێ ئەوەی بێتە سەرباسی کردنیان یان بۆنیان بە چاوگ و کار .

(٢٥) ئەم پیتی بزوێنی « ە ـ e » یە ، یا لادەبرێت یا لێك دەدرێت و «ادغام»=

چاوگی دروست کراوی تێنەپەڕ وەك : باڕەباڕ . باڕ + اندن = باڕاندن ، تۆزە تۆز . تۆز + اندن = تۆزاندن ، زریکە زریك . زریك + اندن = زریکاندن ، میاوە میاو . میاو + اندن = میاواندن ، جۆکە جۆك . جۆك + اندن = جۆکاندن هتد ...

بەم جۆرە پاشگری « اندن ـ andin » دەورێکی باڵا لەم روەوە دەنوێنێت ، چونکە دەیەها ناو لەم ناوانە[٢٦] دەکات بە چاوگ و کاری نوێی سادە و تێنەپەڕی دروست کراو و دەیان بەخشێت بە زمانەکەمان و دەبێت بە نیشانەیێکی تر لەو نیشانانەی کە زیندوێی و پەرەسەندنی ئەم زمانە لە ناو خۆیدا بە گوێرەی پێویستی دەردەخەن[٢٧]

---

= دەکرێت لەگەڵ « ا » ی « اندن » دا لەبەر لە یەك چۆن و هاتنیان دوا بە دوای یەك ، چونکە دۆ بزوێنی دوا بە دوای یەك نایێن لە وشەی هیچ زمانێکدا .

(٢٦) ئەم ناوانە یەکجار زۆرن و لێرەدا لەوە زیاتر هەڵنا گرێت ، چونکە باس باسی پاشگری « اندن » ە و وەك باسێکی سەربەخۆ لە گۆڤاری کۆلێجی ئاداب ژمارە « ١٨ » ساڵی ١٩٧٤ دا بلاّو کراوەتەوە . بڕوانە گۆڤاری ناو براو .

(٢٧) پاشگری « اندن » لە زمانی فارسیدا ناوی دەنگی سروشتی نا کات بە چاوگ ـ هەرچەندە ئەمە لە شێوەی زۆرتۆشدا وایە ـ ئەمە جیاوازییەکی تری نێوانی ئەم دۆ زمانەیە کە سەربەخۆیی هەر زمانە دەردەخات ، فراوانی دەوری ئەم پاشگرە لە کوردیدا و بوونی ئەو بەشانەی لەم زمانەدا هەن و لە فارسیدا نین ، بێگومان وەلاّمێکی بەجێن=

سێیەم : پاشگری « اندن » نەك تەنیا ناوی دەنگی سروشتی ، بەڵکو هەندێك ناوی تریش دەکات بە چاوگ و کار بەڵام بەگشتی دەیان کات بە تێپەڕ نەك تێنەپەڕ وەك ناوی دەنگە سروشتییەکان ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشت و هۆی بەکارهێنانیان ، وەك :

هەڵسەنگاندن ـ « تقییم » ، سەنگ ناوە ، « هەڵ » کە کوتۆتە پێشی ، پێشگرە و بوە بە « هەڵسەنگ + اندن = هەڵسەنگاندن ، تێپەڕە ، یان سەنگاندن .

دەماندن ـ فوو تێ کردن بە دەم ـ پێکهاتوە لە « دەم » ، ناوە بە واتای زار + اندن = دەماندن ، تێپەڕە .

رەنجاندن ـ دڵ رەنجاندن ـ دڵ شکاندن ، ئازار پێدان ـ تێپەڕە ، لە ناوی « رەنج » + پاشگری اندن پێکهاتوە .

---

= بۆ ئەوانەی زمانی کوردی بە شێوەیێکی زمانی فارسی دادەنێن ، چونکە ئەوەی گومانی تێدا نیە کە هیچ کاتێك شێوە و زاراوە لە زمان دەوڵەمەندتر نابێت ، هەر وەك هیچ کاتێك لقی درەخت جێگەی درەخت ناگرێتەوە ، هەروەها ئەو کەمە جیاوازییەش کە لە دەربڕینی ئەم پاشگرەدا هەیە دەگەڕێتەوە بۆ « فۆنۆنیك » ی هەر زمانە ، « اندن andin » لە کوردیدا و « اندەن ـ anden لە فارسیدا ، لە هەمان کاندا بونی ئەم پاشگرە لەم دوو زمانەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەردووکیان دوو زمانی لقی ئێرانین ، واتە ئەم پاشگرە پاشگرێکی ـ ئێرانی ـ یە لەوانەشە لەوە زیاتر بێت ، واتە مافی هەردوو زمانەکەی وەك یەك پێوەیە .

پرژاندن ـ کوڵاوەکەم پرژاند بە سـەر دانیشتوەکاندا ، واتە بڵاو کردەوە . ئەمە لە « پرش » واتە « بڵاو »ی پرش و بڵاو ، جوتە ناو پێکهاتوە ، برژانک ـ برژ + « ا » پیتی پێوەند + پاشگری « نک » پرشنک ـ پرش + نک پێکهاتوە هتد ...

واتە ئەم چاوگە تێپەڕانە وەك دەرکەوت لە بنجدا لە ناو دروست بون و یەکسەر بون بە چاوگ و کاری تێپەڕ .

چوارەم : دروست کردنی یا هەبونی هەندێك چاوگ بە تێپەڕێی بە بێ دیاربونی تێنەپەڕەکەی ، یان ئەو بنجەی لێیەوە وەرگیراون ، ئەمانەش پێویستییان بە وردبونەوە و لێکۆڵینەوە و گەڕانێکە کە لەوانەیە بمان گەیێنێتە سەر بنج و بناوانیان لەوانە :ـ

خایاندن ـ بە واتای ماوە کێشان ، بێ چون ( استغراق ) تێپەڕە ، وەك : ئیشەکە چوار سەعاتی رێکی خایاند ، خایان ، نیە و بە بێ نیشـانەی چاوگیش ئەوەی دەمێنێتەوە هیچ واتایێك ناگەیێنێت ، بە پێچەوانەی نمونەکانی ژمارە « ٣ » هەروەها :

درکاندن بە واتای دەربڕین ، دەرخستن لە رێگەی قسەکردنەوە ، واتە لە رێگەی دەمەوە ، تێپەڕە ؛ درکان نیـــە ، بێ نیشانەی چاوگیش بەکار نایێت ـ ئەگەر پەیوەندی بە « ادرك »ی عەرەبییەوە نەبێت ـ ئەوە دوبارە بنجەکەی دیار نیە .

سەپاندن ـ تێپەڕە ـ چاك سەپاندی بەسەریدا ـ واتە خستیە

ســەر ئەو ، سەپان بەکار نایێت و ، سەپ ـ لەوانەیە پەیوەندی بە « صب »ی عەرەبییەوە هەبێت .

ســـەلماندن ـ تێپـەڕە ـ « إقرار » لەوانەیە لە « سلم بـ »ی عەرەبییەوە هاتبێت .

ئەمانە یان تێنـەپەڕیان هەبوە ، یان سروشتی کارەکە بە تێپەڕی دروستی کردوَن بە بێ تێپەڕبوَن بە تێنەپەڕدا ، ناوی دەنگی سروشتی بە تێنـــەپەڕی دروست بوە ، چونـکە خوَی لە خوَی دەردەبڕڕێت بە بێ یاریدە ، وە ئەگەر یەکێك بوَ بە هوَی دەربڕینی ئەو دەنگە ئەوە دەگوترێت : لوَرە لوَری تێخستن ، زرێـکو هوَڕی تێبەردان ، کرمو هوَڕیان تێکەوت ، بەڵام ئەگەر ناوی دەنگەکە بە یاریـدەی نیشانەی چاوگ بوَ بوَ بە چاوگ ئەوســـا « اندن » بەکار دێت بوَ گەیاندنی ئەم مەبەستە و دەبێت بە نیشـــانەی « واسطه » ، وەك : منداڵەکە گریا . منـداڵەکەی خستە ـ گریان ، یان کردیە گری ، یا منداڵەکەی گریاند .

پێنجەم : ئەم پاشگرە چاوگ و کاری بێگانە دەگوَڕێتە سەر کوردی و بە بێ کەم و زیاد تایبەتیـــەکانی چاوگە کوردییـــەکە وەردەگرن[۲۸] ، بەڵام بوَنی زوَریان بە تێپـــەڕ دەگەڕێتەوە یان بوَ

(۲۸) ئەمە ئەوە ناگەیێنێت کە تەنیا پاشگری « اندن » ئەمە دەکات ، بەڵکو پاشگری تریش هەیە لەگەڵ نیشانەی چاوگ و کاری یارمەتیدەر کە ئەو کارانە دەخەنە چوارچێوەی کاری کوردییەوە ، وەك : فکر ـ نی ـ =

ئەوەی کارە وەرگیراوەکە تێپەڕە یا سروشتی هەڵ دەگرێت تێپەڕ بێت ، بەم جۆرەش ئەگەر تێنەپەڕ بۆ ، وەك : تەمڕاندن بە واتای فەمڕاندن و کوژاندنەوە ، ئەمە هەر چەندە بە ڕێکەوت شێوەی تێپــەڕی « مڕدن »ی وەرگرتوە کە « مڕانــدن » ە بەڵام خۆی لە « طمر »ی عەرەبی وەرگیراوە بەم جۆرە ـ طمر ـ تەمڕ + اندن = تەمڕاندن ، هەروەها : مسح ـ مسحاندن ، جەڕ ـ جەڕاندن بە واتای قایم کردن و توند گرێدان ، خمل ـ خمڵاندن ـ ، کوی ـ کەواندن ، بەواتای داغ کردن کاتی تیمارکردنی برین و ئازار ، نەك : کەواندن وەك تێپــەڕی کەوتن و هاومەبەستی « خستن » واتە ئەم دوانە یەکن لە روالەتدا و لە بنجدا جیاوازن ، هەلخەڵەتاندن ـ « خلط »یە ، لە خەڵەطاند ـ وە هاتوە ، هــەروەها ، کرە ـ کەرهاندن ، بغض ـ بوغزاندن ، حب حباندن ، خلق ـ خولقاندن ، حەواندن ـ گلدانەوە ـ راگرتن ـ ئەمەش لەوانەیە لە « حوی »وە هاتبێ ـ حەوانەوەش هەیە تێنەپەڕە ـ تاراندن ـ خەو رەواندنەوە ، خەو ئەتارێنێ ـ خەو ئەفڕێنێ وەك گۆران دەڵێت :

کورکەو نیو حیلەی ئالیك دواکەوتو

خەو ئەتارێنێ لە چــاوی نوستو

---

= فکرین - بیرکردنەوە ـ عەرەبی ، قاوماغ ـ بەتورکی دەرکردن ، قاو رەنگی چاوکە + چاوگیدان = قاودان ، خنق ـ خنکان ـ خنقاندن ، ئامدن و شدن ـ ئامشۆکردن بەواتای هاتو چۆکردن ـ لە فارسییەوە وەرگیراوە و هی تر ...

واته له ( طار ) ە وە هاتوه کە عەرەبییە ، قەوماندن ، قەوماندی ـ قوم و أقام هتد .. بەڵـکەش بتۆنی ئەو کارانەیە لە زمانی عەرەبیدا و نەبتۆنیانە لە کوردیدا سەرەرای یەکێتی واتایان لە هەردوَ زمانەکەدا ، لەم نموَنانەش لە شێوەی ژوَروَدا زۆرتر و ئاشـکراترە .

شەشەم : پاشگری « اندن » چـــاوگی بەکارنەهاتو دەهێنێتە کلۆزی کارەوە ، واتە ئەوانەی بەبێ « اندن » کارنـــاکەن و بەکار نایێن با تێنەپەڕ و تێپەڕیش بن و بنجی هەندێکیان دیاریــش بێ وەك : خایاندن ، تەکاندن ـ تەك هەیە بە واتای تەنیشـــت و پــاڵ دەگرێتەوە ، ( تەکان ) یش هەیــە ، وەك : « تەکانی دایەخـــۆی ، وەشاندن ـ تێپەڕە ـ باوەشاندن ـ با + رەگی فرمانەکە ـ شێن = باوەشێن ، دەست لێ وەشاندن : تێپەڕە ، لێوەشـانەوە ـ لێهـاتن ـ تێنەپەڕ ، لاواندن ـ تێپەڕ ـ دەیلاوێنێ ـ ژیرکردن ودڵ راگرتن ـ لاواندنەوە ـ بەسەر مردوَدا هەڵدان ، لاو بە واتای گەنج ، هـەڵ فریواندن ـ بەواتای فریودان[29] ـ چۆنە ژێـر باڵی ـ تحریـض هەیە ... فریو نەبەتەنیا و نەبە یاریدەی نیشانەی چاوگ بە کار دێت .

---

(٢٩) ئەو چاوگـانەی بـە تێنەپەڕی بەکارنایێن مەرج نیە تێنەپەڕیان هەبێت لە هەمان کاتدا لەوانەیە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و گـەڕان بەناو شێوەکاندا هەندێکیان بدۆزینەوە ، چونـکە مەرج نیە ئەم وشانە لە هەموَ شێوەکاندا وەك یەك بن یان هەمان گـۆڕینیان بە سـەردا هاتبێت ، لەوانەشـە زمانەکانی ئەو بنەماڵەیەش یارمەتیدەر بن لەم روەوە . =

حەوتەم : هەندێك جار ڕێك دەكەوێت كە « اندن » تێنەپەڕ دروست دەكات وەك : هەڵتیزاندن ـ كە لێرەدا پێشگری « هەڵ » و

---

= هەروەها مەرج نیە ئەم چاوگە بێ واتایانەی بەتەنیا بەكارنایێن تەنیا بە یاریدەی « اندن » واتا ببەخشن ، بەڵكو پاشگر و پێشگرە كاریەكان تێكڕا هاوبەشن لەمەدا ، هەندێك جار دەچنە سەر هەمان وشە بۆ بەخشینی چەند واتایێك پێی ، وەك : هەڵوەشان ، داوەشان ، هەندێك جاریش واتا دەبەخشن بە وشەكە بەڵام دۆبارە بەكار نایێن وەك تێنەپەڕ ، چونكە خۆیان لەو چاوگانەن كە تایبەتێتی كاری تێپەڕیان تێدایە واتە لە خۆیانەوە ڕۆنادەن ، پاشگری « اندن » ، چونكە تایبەتێتی تێپەڕی تێدایە ، دەچێتە سەریان و دەیان كات بەتێپەڕ و دێنە كۆڕی بەكار هێنانەوە ، بۆ نمۆنە : وەشان ـ ڕاوەشان بەكار نایێت ، ڕاوەشاندن تێپەڕە و بەكار دێت ، فڕیوان ـ هەڵفڕیوان بەكارنایێت هەڵفڕیواندن بەكاردێت و تێپەڕە ، وە ئەگەر هات و ئەو پێشگر و پاشگرانە واتایان بەخشی بە چاوگە تێپەڕەكە « اندن » دەیان كات بەتێپەڕ و هاومەبەستیان بۆ دروست دەكات و لە « مفهوم » جودایان دەكاتەوە ، بۆ نمۆنە : حەسان : بێ واتا وە حەسان ـ حەسانەوە ـ تێنەپەڕ ، حەساندنەوە : تێپەڕ ، بەم جۆرەش ، كول ـ كولان ـ كولانەوە ، كولاندنەوە ، چەوسان ـ چەوسانەوە ـ چەوساندنەوە ، گیرسان ـ داگیرسان ـ هەڵگیرسان ـ گیرسانەوە وەك شاعیر دەڵێت :

ئاخۆ بە چ شاخێكەوە گیرساوە دڵی من یاخۆ بە چ داخێكەوە سۆتاوە دڵی من . هەروەها وەشان ـ هەڵ وەشان ـ هەڵوەشاندن ، داوەشان ـ داوەشاندن هتد ... هەروەها دەمانتوانی خاڵی شەشەم و سێیەم بكەین بەیەك بەڵام بۆ سەرنج ڕاكێشان بە دۆ جۆر باسمان كرد .

پاشگری « اندن »ی وەرگرتوە و بە تێنەپەڕی بەکار دێـت .. لەوانەیە نموونەی تریش هەبێت هەر چەندە ئەمە پێویستی بەگەڕان و وردبوونەوە و لێـکۆڵینەوەیێکی باش هەیە ئەگەر بکرێت ، تەنیا بۆ سەرنج ئەمەمان خستە پێش چاو .

هەشتەم : ئەم پاشگرە نەك تەنیا دەچێتە ســەر تێنەپەڕ بۆ کردنی بە تێپەڕ یان سەر ناو بۆ گۆڕینی بۆ چاوگ و کار ، بەڵـکو دەچێتە سەر کاری تێپەڕیش واتە سەر رەگ و بناغەی چاوگە تێپەڕەکە خۆی ، یان هی تێنەپەڕەکەی و هاومەبەستی بۆ دروســـت دەبێت ، وەك :

دڕان ـ تێنەپەڕ ـ دڕین ـ تێپەڕ ، دڕ ( رەگی چاوگ ) + اندن = دڕاندن ـ تێپەڕ .

رژان ـ تێنەپەڕ ـ رشتن ـ تێپەڕ ، رژ ( رەگی چاوگە تێنەپەڕەکە ) + اندن = رژاندن ـ تێپەڕ .

پچڕان ـ تێنەپەڕ ـ پچـڕین ـ تێپەڕ ، پچـڕ ـ رەگی چاوگ ـ + اندن = پچڕاندن[30] ـ تێپەڕ ، وە دەچێتە سەر ئەو تێپەڕانەی تێنەپەڕیان

(٣٠) ئەگەر سەرنجی ئەو کارانە بدەین کە « اندن » یان چۆتە سەر واتە بە یاریدەی « اندن » دروست بوون یا گۆڕراون ، بە تایبەتی ئەوانەی لە تێنەپەڕەوە کراون بە تێپەڕ ، کاتی بەکار هێنانیان لە گفتو گۆ کردندا و لە خۆمان بپرسین ئایا ئەگـەر نەکرانایە بە تێپەڕ چۆن ئەم مەبەستانەمان دەردەبڕی ، ئەوسا گرنگـی ئەم پاشگرەمان زیاتر بۆ روون دەبێتەوە .

نیە و واتای نوێی دروست دەکەن، وەك: کزین ـ تێپەڕە ـ کز + اندن = کزاندن ـ تێپەڕە ـ هەر چەندە ئەمە لە ناوی دەنگی کزەکز دروست دەبێت و نیزیکترە لێیەوە و بوە بە تێپەڕ و بە مەعنای شتێك لە شتێك جیا کردنەوە یە، بن کز ـ ئەو بەشە خواردنەی بن مەنجەڵە کە بەو بنەوە دەتوسێت و بە لێ کردنەوەی کزەکز پەیدا[٣١] دەبێت، بەڵام لە هەمان کاتدا لە ڕوی واتاوە تا رادەیێك پەیوەندی لەگەڵ « کزین » دا هەیە کە جیاکردنەوەی شتێك لە شتێك یان کەسێك دەگرێتەوە لە ئەنجامی کارەکە و هەردوکیان لە یەك بنــج دروست بون کە ـ کزە کزە کەیە بەگشتی، ئەگەر وابێت دیارە دەگونجێت کە « اندن » ناوی دەنـگ بکات بە تێپەڕ نەك تەنیــا بە تێنەپەڕ یان لە تێنەپەڕەوە بۆ تێپەڕ، بەڵام ئەم جۆرە ناوی دەنـگانە لەگــەڵ ناوی دەنـــگی سروشتیدا جیاوازییان هەیە.

زانین ـ تێپەڕە، زان + اندن = زاناندن تێپــەڕ بە واتای تێگەیشتن[٣٢].

---

(٣١) بێ گومان ئەم جۆرە ناوی دەنــگانە کە « اندن » دەیانکات بە تێپەڕ و تێنەپەڕیان نیە لە گـەڵ بەشێکی تر کە تێنەپەڕەکەیان دیارە و تێنەپەڕیشیان هەیە، کـۆمەڵێـکی تایبەتین وەك : تەقە ـ نــاو، تەقین ـ چاوگــی تێنەپەڕ ـ تەقاندن ـ تێپەڕ ( Tok ) ئنگلیزی، تەپەتەپ ـ نــاوی دەنـگ، تەپە ـ ناو ـ Top ئنگلیزی، تەپین ـ چاوگی تێنەپەڕ، تەپاندن ـ تێپەڕە و جیاوازیشیان هەیە.

(٣٢) ئەمەم لە ماموٚستا « مسعود محمد » وەرگرتوە.

هەروەها دەچێتە سەر تێپەڕ و دەیکات بە تێپەڕێك کە پێویستی بە دوَ مفعول دەبێت وەك : گەیشتن ـ گەیاندن ، تێ گەیشتن ـ تێ گەیاندن هتد...

نۆیەم : « اندن » دەبێت بە هاومەبەستی کاری یاریدەدەری « هاتن » و « کردن » ، واتە دەتوانین ئەم دوَ چاوگە لادەین و « اندن » بخەینە شوێنیان ، بۆ هەمان مەبەست با پاشگری « اندن » بخەینە سەر هەمان وشە بۆ دروست کردنی هاومەبەست ، بۆ نمونە : لورە لور کردن ، لورە هاتن ـ لوراندن ، ـ لێرەدا ناوەکە بەتەنیا بەکاردێت نەك بە دوَبارە کردنەوە ، هەر چەندە هەندێك جار دوَبارە کردنەوەکە بۆ مەبەستی بەردەوامێ بەکار دێت کە ئێمە مەبەستمان ئەمە نیە واتە لە لێکدراوەوە دەبن بە سادە ، واتە بە گشتێ دەتوانین ئەو ناوی دەنگە سروشتییانە بەم جۆرە بکەین بە ســادە و تێنەپەڕی دروست کراو و بەمە ژمارەی وشەی هاومەبەست زیاد دەکات ، لەگەڵ ژمارەی کاری تێنەپەڕی دروست کراو[٣٣] .

---

(٣٣) وشەی نوێ و دروست کراو لەزماندا بەڵگەی پێشکەوتنی زمانە شان بە شانی پێشکەوتنی کــۆمەڵ ، وە بەشی زۆری ئەو وشە تازانە لە ئەنجامی ئەو ئاڵوگـۆڕانەیە کە بە سەر وشەکانی ئەو زمانەدا دێت ، وە کردنی کاری تێنەپەڕ ، یان ناو بە کار ، یان گـۆڕینی واتای تێپەڕ ، یان زیندوّبوّنەوەی ئەو وشـانەی لە کار کەوتـوّن لە ئەنجامی نەمانی ئەو شتەی بۆی بەکار دەهاتن ، ئەم راستییەمان بۆ دەردەخات و بۆمان روّن=

دەیەم : پاشگری « اندن » کاری لێکدراوی تریش ـ نەك تەنیا ناوی دەنگە سروشتیەکان ـ لە لێکدراوەوە دەکات بە سادە ، بەلادانی کارەکە و دانانی پاشگری « اندن » لە جێگەی ئەمەش هەنگاو نانێکی گرنگ و بەجێیە بەرەو پالاوتن و پوخت کردنی زمان و رزگار بونی لەو کارە یاریدەرانە لەو شوێنانەدا ، بەگۆڕینی کاری لێکدراو بۆ سادە بەتایبەتی ئەو کارە لێکدراوانەی کە بە کردن و بون دروست دەبن وەك : نەخش ـ ( نەقش ) نەخش کردن ـ نەخشاندن ، مسح ـ مەسح کردن ـ مەسحاندن ، ساز کردن ـ سازاندن ، وە ئێستا وشەی نوێش خەریکە لە سەر ئەم بنکەیە و بە یاریدەی « اندن » دروست دەبێت وەك : نرخ پێدان ـ نرخ بۆ دانان ـ نرخاندن ـ ئەمە لە هەندێك شوێن بە کاردێت ، ترۆ جین ـ ترۆجاندن و بەمە ژمارەی چاوگی تێنەپەڕی دروست کراو زیاد دەکات و بەقەد ژمارەی هاومەبەست پەیدا دەبێت بۆ ئەو کارانەی « اندن » جێگەیان دەگرێتەوە . واتە ئەمانە لە ناو خۆیاندا دەبن بە هاومەبەست و لە واتا و « مفهوم »دا بە ئاسانی جێگەی یەکدی دەگرنەوە .

یازدەهەم : ئەم پاشگري « اندن »ە دەچێتە سەر هەندێك چاوگ و دوو واتای پێ دەبەخشێ وەك : چوون ـ چواندن ـ یەك

= دەکاتەوە کە زمانی کوردی قۆناغی تایبەتی خۆی بڕیوە بەپێی پێویستی ، بۆیە ژمارەی ئەو وشە نوێ و دروست کراوانەی دەچنە پاڵ وشە بنجییەکانی زمان بەرە بەرە لەزیاد کردندایە .

به واتای ناردن ، رەوانەکردن ، دوَ به واتای لەکیس دان و له دەست دەرچوَن ، نوَستن ـ نواندن ـ یەك به واتای خەواندن ، دوَ به واتای نازکردن و خۆ پیشاندان :

گیانەکەم دوێنێ لەکوڵشەن کوڵ به عیشوه خۆی نواند
نەك نەمەك گیر بم به یادی تۆ قەسەم هیچ نەم دواند

کەوتن ـ کەواندن ـ یەك به واتای خستن ، دوَ به واتای داغ‌کردن ، هەرچەندە هەندێك لەمانە له یەك بنج پێك نایێن بەڵام پاش کردنیان به تێپەڕ له رواڵەتدا یەك دەگرنەوە .

دوازدەهەم : هەندێك جار پاشگری « اندن » دەبێت به نیشانەی « واسطه » و بۆ جێ به جێ کردنی کارێك له رێگەی کەسێك یان شتێکەوە بەکار دێت وەك : نوَسێن ـ تێپەڕە ، نڤیساندن به واتای پێ نوَسێن ( نڤیسین ) واته لێرەدا « اندن » هاومەبەستی پێشگری « پێ » یه که بەگشتی نیشانەی « واسطه » و « اجبار » و زۆر لێ کردنه له زمانی کوردیدا سەرەڕای دەوری له دروست کردنی وشەی نوێی لەم زمانەدا[٣٤] .

(٣٤) پێ له کوردیدا ناوه وه « پێ » پێشگریشه واته ئەم دوانه هەرچەندە یەکن له روخساردا بەلاّم له ناوەرۆکدا پەیوەندییان بەیەکەوە نییه و ئێمه لێرەدا باس لەپێشگری « پێ » دەکەین که بەگشتی نیشانەی « واسطة » و « اجبار »ە سەرەڕای بەکارهێنانی بۆ مەبەستی تریش ، بەپێی شوێنی بەکار هێنانی ئەم مەبەستانه دەردەکەون و لەیەکدی جودا دەکرێنەوە بۆ=

# ئەنجام :

لە ئەنجامدا بە پێویستی دەزانین کە هەندێك لە تایبەتییەکانی ئەو چاوگ و کارانە بخەینە پێش چاو پاش وەرگرتنی پاشگری « اندن - Andin » تێپەڕ بن یان تێنەپەڕ ، بنجتی بن یان دروست‌کراو ، پاش ئەوەی کە بۆمان ســاغ بۆوە کە تاقە یەك پاشگری کارتی هـەیە بۆ

= نموونە : پێ‌کردن ـ کارەکەم بەوکرد بە واسیطەی ئەو ، چراکەم پێ‌کرد ، بەواتای چراکەم هەڵـکرد و هەڵـگیرساند ، واتای نوێ ، بۆیــە بۆ جودا کردنەوەیان پێویستە « پێ »ی واسطە بەتەنیا بنوسرێت ، چونـکە کار ناکاتە سەر واتای کارەکە ، وە بۆ مەبەســتی نوێ تێکەڵ بکرێت و بنوسێنرێت بە کـارەکەوە ، پێ‌کردن ـ پێکردن .

هەروەها دەبێتە هــۆی ئەوەش کە هەندێــك جار کارەکە دوو ( مفعول ) وەرگرێت . بۆ ئەمە لەگـەڵ کاری تێپەڕدا بەکاری بهێنەو سەرنجیان بدە بە وردی .

هەروەها « پاشگری اندن » لە فارسیدا بەرانبەر بە پێشگــری « پێ »ی کوردی بــۆ ( واسطە ) و زۆر لێ‌کردنە ســەرەڕای گــۆڕینی کـاری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ، کە ئەمەش هەندێــك جار لە کوردیشدا بەکاردێت وەك لە سەرەوە باسمان کرد ، بەلاّم وەك گوتمان بەگشتی لە زمانی کوردیدا پێشگرێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەم مەبەستە شان بە شانی پاشگری « اندن » کە لە فارسیدا نیە و دەچێتە سەر تێپەڕ و تێنەپەڕ بۆ ئەم مەبەستە و بۆ گــۆڕینی واتا کە ئەمە دووبارە یەکێکە لە جیاوازییەکانی نێوانی زمانی کوردی و فارسیدا و هەروەها وەك زانیشمان « اندن » ناوی دەنـگ لە فارسیدا ناکات بە چاوگە و کار .

گۆڕینی کاری تێنەپەڕ بۆ تێپەڕ ئەویش پاشگری « اندن »ە واتە پاشگر و پێشگرەکانی تر لەم روەوە کارناکەنە سەر کار .

١ـ تاقە یەك بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی رەگی کارتی ئەو چاوگانە ئەویش لادانی نیشانەی چاوگ و گۆڕینی پیتی (ا) یە بۆ (ێ) ، چونکە (ا) ئەو پیتەیە کە دەکەوێتە پێش نیشانەی چاوگ کە بریتییە لە تونی چاوگ و ئەو پیتەی دەکەوێتە پێش تونەکە پیتی (د) یە ، ئەم « ا » یە و نیشانەی چاوگ تێکڕا لە پیتەکانی پاشگری « اندن » ن .

کەواتە هەر وەك یەك بنکە هەیە بۆ وەرگرتنی رەگی چاوگ کە بریتییە لە تونی چاوگ و پیتەکەی پێشی ، یەك بنکەش هەیە بۆ وەرگرتنی رەگی کاری ئەم چاوگانە ، لە کاتێکدا چەند بنکەیێك هەیە بۆ وەرگرتنی رەگی کارە بنجییەکان ـ گەڕانەوەش بۆ گۆڕینەوەی ئەم کارە بنجییانە بۆ کاتی ئێستا و لادانی نیشانەی ئەم کاتە لەگەڵ راناوی کەسی ئەوەی دەمێنێتەوە رەگی کارە ، واتە لە هەر شوێنێك رەگی کارمان بەو شێوەیەی سەرەوە بەرچاو کەوت یەکسەر پێویستە بزانین کە پاشگری « اندن » چۆتە سەر ئەو کارانە .

٢ـ ئەم کارانە تێپەڕ بن ، یان تێنەپەڕ ، بنجتی بن یان دروستکراو ، تێکڕا ئەو راناوە کەسییە جودا و لکاوانە وەردەگرن کە بۆ کاری تێپەڕن ، واتە لێرەدا کاری تێپەڕی بنجتی و تێنەپەڕ و تێپەڕی دروستکراو یەك دەگرنەوە ، بۆ نمونە : لورە لور ـ لور + اندن =

لوراندن چاوگی دروستکراو لە ناوی دەنگ بە یاریدەی « اندن » کە تێنەپەڕە ، گورگەکان لوراندیان ، سوتان ـ سوت + اندن = سوتاندن چاوگی تێپەڕی دروستکراو بە یاریدەی « اندن » لە تێنەپەڕەوە ، کابراکان دەغڵەکەیان سوتاند ـ سوتاندیان ، گرتن تێپەڕی بنجییە ـ منداڵەکان چۆلەکەکانیان گرت ـ گرتنیان .

کەواتە ئەگەر کارێك تێنەپەڕ بو ، بەلام راناوی کەسی تێپەڕی وەرگرتبو دیارە ئەو چاوگە تێنەپەرانەن کە لە ناوی دەنگی سروشتی دروست کراون[٣٥] بە یاریدەی پاشگری « اندن » یان کاری یارمەتیدەری « هاتن و کردن » .

٣ ـ گشت ئەو چاوگانەی بە یاریدەی پاشگری « اندن » پێك دێن یان « اندن » وەردەگرن تێکڕا دەبن بە چاوگی سادە بەم جۆرە ژمارەی چاوگە سادەکانی ئەم زمانە بە هۆی « اندن »ەوە زۆر دەبن و دەچنە ریزی چاوگە سادە بنجییەکانەوە .

(٣٥) ئەوەی لێرەدا سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە کە شێوەی خوارو لەگەڵ شێوەی سەرودا یەك دەگرنەوە لەم تایبەتییانەدا ئەمەش یەکێتی شێوەکان و هەنگاونانیان پێکەوە بەدیار دەخات لە پێشکەوتندا ، ئەم تایبەتییانەش رۆژ بە رۆژ ئەو راستییە دەردەخەن کە شێوەکانی زمانی کوردی بە جۆرێکی پتەو بەستراون بە بنجی زمانەکەوە و چاکترین وەلامدانەوەیە بۆ ئەوانەی چاو لەم راستییە دەبۆشن لەبەر کینەی دەرونیان ، وانە هەردو لا ئەو راناوە کەسییە جودا و لکاوە وەردەگرن کە لەگەڵ تێپەڕی رابوردودا بەکار دێت بۆ هەمان کات .

٤ ـ ئەو چاوگانەی « اندن » وەردەگرن . تۆنی چاوگ و پیتەکەی پێشی کە « د » یە ، دەبن بە نیشانەی چاوگ بۆیان ، واتە تێکڕا ئەو چاوگانە یەك دەگرنەوە لە نیشانەی چاوگدا .

٥ ـ لە بەر ئەوەی پیتی ( د ) پێش تۆنی چاوگ دەکەوێت تێکڕا ئەم چاوگانە دەبن بە چاوگی دالی ، بەم جۆرە ژمارەی چاوگە دالیەکان زیاد دەکەن و دەچنە پاڵ چاوگە دالیە بنجییەکان لە تێنەپەر و تێپەڕ .

٦ ـ لەبەر ئەوەی ئەوانەی لە بنجدا ناون و پاشگری « اندن » دەیان کات بە چاوگ واتە چاوگی دروست کراون ، کەواتە « اندن » دەبێتە هۆی دروست بۆنی چاوگی نوێی دروستکراو ، بەم جۆرە ژمارەی چاوگ زۆر دەبێت و ئەو چاوگانە دەچنە پاڵ چاوگە بنجییەکانی ئەم زمانە .

٧ ـ پاشگری « اندن » کە دەچێتە سەر ناوی دەنگی سروشتی و دەیان کات بە چاوگی تێنەپەڕ ، بەمە ژمارەی چاوگە تێنەپەڕەکان زیاد دەکات ، وە ئەم چاوگە تێنەپەڕە دروست کراوانە دەچنە پاڵ چاوگە تێنەپەڕە بنجییەکان ، بەلام لە ڕێگەی ڕەگی کاری ئەم چاوگانەوە لە یەکتری جودا ـ دەکرێنەوە .

٨ ـ لە کاتێکدا کە پاشگری « اندن » ناوی دەنگی سروشتی دەکات بە چاوگی تێنەپەڕی سادە ، لە هەمان کاتدا ئەم ناوانە دەبن بە

چاوگی تێنەپەڕی لێکدراو بە یاریدەی کاری یارمەتیدەری « هاتن و کردن » ، واتە هەردوو لا دەبن بە هاوەبەستی یەکتری و جێگەی یەکدی دەگرنەوە و هاوبەشن لەوەدا کە هەردوو لا دروست کراون و هەمان راناوی کەسی وەردەگرن و هەردوو لا لە ناوی دەنگی سروشتی دروست دەبن ، تەنیا ئەوەندە هەیە ئەوەی « اندن »ی دەچێتە سەر ( سادە )یە و ئەوەی کاری یارمەتیدەر ، لێکدراوە وەك :
تۆزە ـ تۆزاندن ، تۆزە تۆزکردن .

٩ ـ زۆر بوونی ژمارەی چاوگ و کار بە یاریدەی پاشگری « اندن » بەو جۆرەی سەرەوە بێ گومان کارێکی گەورە دەکاتە سەر فراوان کردنی ئەم زمانە و گفتوگۆ کردن ئاسان دەکات بەهۆی زۆر بوونی وشەکانەوە و رێگە تەخت دەکات بۆ دەربڕینی مەبەست بە گەلێك جۆر .

بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستە بزانین کە مەرج نیە هەموو چاوگێك « اندن » وەربگرێت ، تێنەپەڕ بێت ، یان تێپەڕ بەڵکو ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی کارەکە ، یان پێویستی پێی . یان خۆی تێپەڕی هەیە وەك : هاتن ـ هێنان ، رۆیشتن ـ ناردن هتد . . .

لە کۆتاییدا دەڵێین هەر چاوگێك کۆتایی بە « دن din » هاتبوو وەپێش « دن » « ان » هەبوو بەگشتی چاوگێکی دروست کراوە ، وە ئەو ( ان ) و ( دن )ە « انـدن »ە ، یەك : بەلادانی « اندن »، یان

تێك دەچن ، یان دەبنەوە بە ناو ، یان چاوگی تێنەپەڕ ، یان واتایان دەگۆڕێت ، دوَ : رەگەکانیان کۆتایی بە « ێن » دێت کە تێکڕا کاری هەر چاوگێك « اندن » ی وەرگرتبێ بە « ێن » کۆتایی دێت ، واتە ئەمانە لە بنجێکەوە هاتون کە ئێستا کە لەوانەیە ، یا نەمابن ، یا دیار نەبن و بە یاریدەی « اندن » بەکاردێن و هاتونەتە کۆڕی بەکار هێنان و دەور بینین لە زمانەکەدا ، گەڕان بە دوای ئەو بنجانەدا لەوانەیە بمان گەیێنێت بە بنجی بەشێکیان و لەو ڕێگەیەوە هی تریش بدۆزینەوە .

واتە کۆمەڵێك چاوگ هەن کۆتاییان لە وێنەی « اندن » دایە ، یان لە « اندن » ەوە نزیکە . بەڕای ئێمە ئەم چاوگانە دوَ بەشن : بەشی یەکەم کۆتاییان بە « اندن » هاتوە ، واتە « اندن » یان وەرگرتوە ، نەك تەنیا ڕواڵەتیان وایە ، وەك : شاندن ـ هەڵشاندن ـ ( ناردن و هەڵوەشاندن ) ، بشێنە ـ بنێرە ، هەڵشێنە ـ هەڵوەشێنە ، چاندن و چەندن ( چێن ـ ڕەگە ) ، چناندن[٣٦] . چاندن و چەندن ـ ئەرزەکەم چەند ، یان چاند . خوێندن ( خوێن ـ ڕەگە ) ، ڕاژەندن ( ژێن ) ، تەکاندن ( تەکێن ) ، سەندن ( سێن ) ( ستاندن هەیە دەستێنم و ستاندم هەندێك ناوچە دەیڵێت ) دیارە سەندن کورت کراوەی ( ستاندن ) ە ، هەر وەك : خوێندن و مان لە فارسیدا « اندن » ە کەیان ئاشکرایە « خواندن » و « ماندن » بەڵگەمان

(٣٦) ئەمەم لە مامۆستا مەسعود محەمەد بیستوە .

رەگی کاری ئەمانەیە کە کۆتاییان بە (ێن ) دێـت ، وە ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کە ئەمانە لە ماوەیێکدا شتێکی تر بوون و پاشان بەرە بەرە لە بەر هەر هـۆیێك بێت لە هـۆیەکانی پێشـکەوتن و پەرەسـەندنی زمان ، « اندن » یان وەرگرتوە و ئەمیش واتای نوێی پێبەخشیون سەرەڕای کردنی زۆریان بە تێپەڕ ، وە « اندن » بوە بە بەشـێك لێیان و بە هیـچ جورێك لەکۆڕینەوەدا لێیان جودا نابێتەوە و تێـکەڵ بە رەگی کارەکانیان بوە ، هەروەها لە بەر ئەوەی « اندن » لێرەدا چۆتە سەر رەگەکانیان ( کە رەگ بچوکترین و کۆنترین رواڵەتی وشەیە ) ئینجا ئەگەر ئەو بەشـە لە « اندن » جودا بـکەینەوە دیارە رەگەکە دەمێنێتەوە ، لەوانەیە گەڕان بـە دوای ئەو رەگانەدا و ئەو رەگ و وشانەی لەمانەوە نزیکن ، یان گەڕان بـە ناو شـێوەکاندا یاریدەیێـکی باشمان بدات بۆ دۆزینەوەیان ، بۆ نمونە : لاواندن ـ کۆتایی بە « اندن » هاتوە ، دایکەکە منداڵەکەی دەلاوێنێ ـ لاوێن ـ رەگی کارە لاواندنەوە ـ لاواندن + پاشـگری ( وە ) ، لاو ناوە بە : واتای گەنج ، بەتەمەن بچوك ، لاولاو بەو روەکە تەڕ و ناسکە دەگوترێت کە دەیناسێن ، سەرنجدان و لێـکۆڵینەوە و لێـکدانەوەی واتا و شوێنی بەکار ـ هێنانیان وردتر هاوبەشی نێوانی ئەمانەمان بۆ دەردەخات لە پاڵ لە یەك چونی رواڵەتدا .

هەشە وەك ئەمانە وایە بەڵام پیتەکانی بنجییە ، واتە « اندن » یان نەچۆتە سەر وەك دیارە ، بۆ نمونە : کەندن ـ چاوگی ( دالی )یە

بەتەنیا بەکارنایێت ـ هەڵـکەندن چاڵ هەڵکەندن ، داکەندن : جل داکەندن ، بەڵـگەش ئەوەیە کە ئەمانە تێپەڕن و رەگەکانیان وەك رەگی چاوگە بنجییەکانە : ئاخۆ کێ گۆڕ بۆ گۆڕ هەڵـکەن هەڵ کەنێ ، هەڵیان کەند هتد ...

دوا وتە دەڵێین کە ئەم « پاشگری ـ اندن ـ andin » ە پلە بە پلە دەورەکانی خۆی دەنوێنێت بە بێ پـــاش و پێشخستن یان نواندنی دوو دەور لە کاتێکدا ، واتە ئەگەر چوە سەر وشە و ناو بۆ دەیکات بە کار ( چاوگ ) بەڵام بەگشتی تێنەپەڕ ، واتە تەنیا لەناوەوە دەیان گۆڕێت بۆ کار بەتایبەتی ناوی دەنگە سروشتییەکان ، ئەگەر چوە ســـەر وشە و چاوگی تێنەپەڕ بۆ دەیکات بە تێپەڕ ، ئەگەر چوە سەری و تێپەڕ بۆ واتا « مفهوم »ی دەگۆڕێت یان هاومەبەستی بۆ دروست دەکات ... هتد ... ورد بوونەوە لە باسەکە باشتر دەوری ئەم پاشگرەتان بۆ دەردەخات هەرچەندە هەندێك وردە شتمان لێ لاداوە بۆ درێژ نەبوونەوەی باسەکە یان لەوانەیە شتی تریش هەبن کە هێشتا بۆمان دەرنەکەوتون .

* * * * * *

- ملخص المقال -

# اللاحقة - السوفيكس - انده - ANDIN - فى اللغة الكردية
## دراسة وتحليل ونقد

العضو المؤازر : د. نسرين فخري

لهذه اللاحقة (السوفيكس) الفعلية دور هام واهمية كراماتيكية في اللغة الكردية اضافة إلى كونها قاسماً مشتركاً وحلقة ربط بين الكثير من المواضيع اللغوية بحيث لا مناص منها لمن يجمع أو يؤلف أو يبحث في هذا الحقل، إلا أن احداً من هؤلاء لم يلتفت بالشكل المطلوب إلى التحقيق فيها شكلا ومضموناً وقد تجاوز الاهمال حدوده عند البعض إلى النقل من كتب الاسبقين أو تفسيرها حسب اجتهادات فردية في وقت تجاوزت فيه اللغة تلك المراحل إلى فرض نفسها كعلم معترف به لا يختلف فيه اثنان، كما بدأت الاسئلة تتوالى في السنوات الاخيرة حول هذه اللاحقة شأن اقسام اللغة الاخرى من مدرسي وطلاب المراحل المختلفة لاشتراكها في مناهجها، فلهذا السبب وذاك قررنا نشر هذا الموضوع أملا في ايفائه بالغرض المطلوب ألا وهو إعطاء صورة واضحة لشكل هذه اللاحقة ومضمونها كما ان هذا البحث يتحمل اكثر

مما عرضناه هنا الا اننا احتفظنا بالباقي كي لا نرهق القارىء بالتفاصيل الدقيقة التي قد تبعده عن صلب ما يبتغيه ، إضافة لوجود ملاحظات أخرى قد تطرح نفسها على بساط البحث ، فيها من الابهام ما يبرز في صور استفسارات وآراء تبحث عن جواب مدعم بتحقيق علمي دقيق ومقنع يجلي هذا الابهام ويجيب عن تلك الاستفسارات الواردة ويرد على الآراء رداً إيجابياً لا تناقض فيه . فالى هؤلاء نقدم هذا البحث آملين أن ينال الرضى وان نتلقى منهم ما يساعد على طبعه ثانية بشكل اوسع واضبط .

قبل الولوج في بحث هذه اللاحقة لابد وان نعرف بوجود لاحقتين فعليتين في هذه اللغة ، الاولى : السابقة واللاحقة ( وه ـ ڤة ـ we - ve )[1] والثانية ( اندن ـ Andin ) التي هي مدار بحثنا والتي قمنا بدراستها شكلا ومضموناً مع الرد ومناقشة ماكتب عنها بالأدلة البينة اضافة إلى المقارنة بينها في اللغتين الكردية ـ والفارسية لاشتراكها فيهما كلاحقة ايرانية مع تبيان أوجه الشبه والاختلاف بينهما . وبسبب الاختلاف في تسميته مرة بالأداة واخرى بلاحقة وغيرها تطرقنا إلى الفرق بين الأداة والافيكس ( السوفيكس ـ اللاحقة ، والپريفيكس ـ السابقة ، والانفيكس ـ ما يدخل داخل اساس الكلمة ) مع شرح اسباب الخلط والالتباس بينهما .

---

(١) انظر مجله المجمع العلمي الكردي . العدد الاول ، سنة : ١٩٧٣ ، ص : ٢٣٤ ـ ٢٦٧ .

## دورها وخصائصها :

١ـ تحول الأفعال اللازمة إلى متعدية بسيطة بعد إلحاقها بجذور واسس تلك الأفعال والمصادر ، كما أنها اللاحقة الوحيدة في هذا المجال ، مثل : خەوتن ـ نوم ـ وهو لازم ، خەو ( جذر الفعل والمصدر ) + آندن = خەواندن ـ تنويم وهو متعد .

٢ـ تحول أسماء أصوات الطبيعة إلى أفعال لازمة بالتحاقها بنهاية تلك الأسماء مثل : لوٚره لوٚر ـ صوت الذئب ، لوٚر + آندن = لوٚراندن ـ عواء الذئب .

كما وتحول أسماء أخرى إلى أفعال متعدية بسبب وطبيعة استعمالها مثل : تەك ـ ( جنب ) ، + آندن = تەكاندن ـ نفض ـ وهو متعد ، هذا إلى جانب تكوين أفعال متعدية لا وجود للوازمها او الاسس التي تكونت منها مثل : خاياندن وهو متعد يدل على الاستغراق للوقت ، ومصادر اخرى متكونة بواسطتها ؛ لوازمها واسس تكوينها بينة مثل : سروه ـ وهو اسم بمعنى صوت الهواء الخفيف ، سرەوان ـ وهو مصدر لازم ـ بمعنى الهدوء سرەواندن ـ وهو متعد بمعنى التهدئة ، دەست سرەواندن و تێ سرەواندن بمعنى الضرب ، إختلاف في المعنى وتشابه في الأصل في الشكل والمعنى وهو الحركة .

٣ـ تحول أفعال غير كردية إلى كردية باكتسابها خصائص الفعل الكردي وخصائص الأفعال التي تلحق بها « آندن » بالتمام مثل : طمر ( عربي ) تەمر + آندن = تەمراندن ـ وهو متعد بمعنى « إطفاء » .

٤ـ تلحق بالأفعال المتعدية او لوازمها لتكوين كلمات مترادفة مثل : دڕان ـ تمزق ـ لازم ، دڕین ـ تمزيق هو متعد ، دڕاندن ـ متعد بمعنى التمزيق أيضاً ، أو تكوين معنى مغاير مثل : زانين ـ المعرفة ، زان (جذر الفعل والمصدر) + آندن = زاناندن بمعنى « الفهم » .

٥ـ كما وتصبح « آندن » مرادفاً للفعل المساعد ( هاتن ) و ( كردن ) أي نستطيع تبديل تلك الافعال بهذه اللاحقة دون تغيير في معنى الكلمة ، وبهذه الطريقة تتحول تلك الافعال المركبة إلى بسيطة وبالعكس مثل : لوره لور كردن ـ لوره لور هاتن ـ لوراندن ـ عواء الذئب ، كما تحول أفعالا اخرى غير المتكونة من أسماء اصوات الطبيعة إقتداء بها ؛ وهذه محاولة جديدة للتخلص نوعاً ما من الأفعال المركبة . وتبسيطها مثل : نەخش ( نقش ) نەخش كردن ـ نەخشاندن ـ وهو متعد .

٦ـ تدخل على بعض الأفعال لتقوم بدور الواسطة ـ كما في الفارسية ـ كالسابقة « پێ » الكردية التي هي علامة للواسطة في هذه اللغة إلى جانب اشتراكها في تكوين الكلمات والمعاني الجديدة مثل : نوسين ـ : الكتابة ، نڤيساندن ـ پێ نوسين ـ تكتيب ( الكتابة عن طريق الغير ) وهكذا .

وفي النتيجة لابد من معرفة بعض خصائص الأفعال والمصادر

التى تلحق بها اللاحقة « آندن » دون تميز أو فرق بين لازم ومتعد، أصلي ومكوّن ، منها تحويل جميع مصادر الافعال الى مصادر دالية تنتهي بالعلامة ( دن ) الا انها تتميز عن المصادر الدالية الاصلية بوقوع المقطع ( ان ) قبلها ، وكذلك عن طريق جذور أفعالها التى تتوحد وتؤخذ بحذف علامة المصدر « دن » ثم قلب « أ » في « آن » الى ـ ى ـ يْ انتهاء كل جذر بـ(يْن) وهذا يوكد دخول « آندن » في صلب تلك الجذور ، كما تتوحد في اخذهـا نفس الضمائر الشخصية الخاصة بالافعال المتعدية دون استثناء .

جميع المصادر التى تتكون بواسطة اللاحقة « آندن » هى مصادر بسيطة وهكذا يزداد عدد المصادر البسيطة وتنضم الى المصادر البسيطة الاصلية في هذه اللغة .

وبما ان اللاحقة ( آندن ) تحوّل اسماء اصوات الطبيعة الى مصادر لازمة فان عدد هذه المصادر يزداد وتنضم الى المصادر اللازمة الاصلية ، وبما ان جميعها تنتهي بالعلامة « دن » فان عدد المصادر الدالية يزداد وتنضم الى المصادر الدالية اللازمة والمتعدية الاصلية . كما ان كثرة عدد المصادر والافعال بواسطة اللاحقة ( آندن ) بالشكل المبين اعلاه تلعب دورها في توسيع هذه اللغة وهذا بدوره يسهل التعبير لكثرة مفرداتها ، ولكن هذا لايعني وجوب الحاق اللاحقة (آندن) بجميع الافعال وانما يخضع هذا لطبيعة تلك الافعال ومدى الحاجة اليها وضرورة استعمالها .

وأخيراً وليس آخراً فقد جرنا البحث الى ذكر ملاحظات

وتوضيحات توزعت على حواشي البحث اما لعلاقتها به او اعانتها له في توضيحه ، كالتطرق الى كيفية تكوين الافعال والمصادر المتعدية فى اللغة التركية وذكر اللاحقة التى تقابل « آندن » فيها والمقارنة بينهما لتأكيد كون هذه اللاحقة هى (آندن) لا (آند) الى جانب توضيح ومناقشة ماذكر عنها من قبل اللغويين الاكراد والمستشرقين رغم قلتهم ، وتصحيح اخطاء وقعوا فيها فكانت النتيجة تشويه شكلها وشكل كلمات على شاكلتها ، ثم كيفية تكوين الافعال والمصادر اللازمة والمتعدية عن طريق الافعال المساعدة ، والتوصل الى جذور الافعال من اقصر واسهل أبوابها ، مقارنة بين جذر واساس الفعل والمصدر ودورهما في التوصل الى اصل المصدر وعلامته وكونه أصلياً او مكوناً ، ثم كيفية التوصل وتصحيح بعض الاخطاء التى ترتكب فى الكتابة عن هذا الطريق ، ثم التطرق الى دور اللهجات في التوصل الى اكتشاف وتوضيح وتأكيد ماذكر ، كما أكدنا الترابط الوثيق بين هذه اللهجات في مسيرتها التطورية ، ثم أهمية الدراسة المقارنة بين لغات العائلة الواحدة في هذا المجال ، وماهية تكون الكلمات والمفاهيم الجديدة والمختلفة في اللغة وتطورها الداخلي وتفاعلها ضمن اطارها مع اللغات المجاورة لها وارتباط هذا وذاك بحيوية اللغة وأصالتها . الى غير ذلك من الملاحظات التى توضحها الادلة والامثلة المذكورة معها .

* * * * * *

# سەرهوستایێ کێش و ڤەهاندنێ مەلایێ جزیری

ئەندامی یاریدەر : صادق بەهادین ئامێدی

## بشکا یەکێ

ژ هەلکەفتێ ، دەست هەل و کەنگەهێت مەزن د دویروکا خویندەڤان و رۆشەنبیرێت کورد نەمازە د دویروکا تۆرێ کوردیێدا ، د چەرخێ پانزدێ ئو شانزدێدا کو جهێ پێ خوزین ، سەربلندیێ ئو شەهنازیێ یە ، هۆزانڤانێ مەزن مەلایێ جزیرێیە .

شمع سر نور نادرت گر او نەکت پر هیز دل
زوق جاما عشقی ناکت گر نەکت امساك روح

معروض و معلوم بت ژبۆ تمام یار و بران اگرچە زحف قیمتدار و نادیده أدبیات کردیه هنه لکن ژ حمیان ممتاز و نامدار دیوانا بحتی آگری عشقا ازلی و تهی نورا جمالا لم یزلی شیخ احمد الجزری‌یە لورا باعتبار معنایێ خوه چوان غایت نفیس و بێ‌همتایه و مشتمله لسر حقائق ، دقائق ، اشارات کثیرة وسان د منظومات ، عبارات ویدا ژی اسلوبکی عالی بلاغتی شعلەداره حتی شیرینتی ، حلاوت و طراوتا د نظم و کلمات ویدا هیی اگر ژ امثال دیوانا ابن فارضی و

دیوانا حافظ شیرازێ فائق و زیدەتر نەبت کێمتر ژی نەین چوان کو د آخر قصیدەکیدا گۆتیە :

گر لۆلۆ منثـــور ژنظم تـــو دخوازی
ور شعری ملێ بین تە بشیرازی چە حاجت[1]

ئەڤە هەلبەستا عبـدورەحیم رەحمێ هەکاری ل دویماهی‌یا دیوانا جزیرێ یا سالا (١٣٣٨ ـ ١٣٤٠) یێدا چاپکرێ بەلایێ جزیرێ هلدایە، هەروەکی نفیسی د دیوانا ناڤبری‌دا دلێ لبەرچاڤێت خوێندەڤانا دانین :

شیرازی لناڤ فرسان کیشا علما عشقی
ملا ! تە برە اوجان حافظ بکە پی مشقی

لـکن بکـراسك دی نور و شفقك تیدا
دیبایـکی کـرمانجی راچاند د جزیریدا

مـــلا تە وکی حافظ فردوسی نەکـر استاد
هم عشق ژ نو هلـکر کرمانجی نەکرا ایجاد

---

(١) الطابع الحقير محمد شفيق الآرواسي الحسيني ، دیوانا جزیری ، مؤلفی شیخ احمـد الجزری ، شهزادە باشی : اوقاف اسـلامیة مطبعـەسی (١٣٣٨ ـ ١٣٤٠) ئەڤ سەرنا دیوانا جزیری یا محمد شفیق ئارواسی نفیسی من وەکو وێ نفیسی بێ گوهۆڕین لبەر چاڤێت خوێندڤانێت کۆڤارا ئەکادیمیا کوردێ ( کۆڕی زانیـاری کورد ) دانا ، وەکو تێبکستەکێ! ( نسوسەکێ ) .

پول د زغل گر دی ته بیك نظری زرکر
مالا کو فقیر مایی تژی در و گوهر کر

کرمانج دفی هردم فخری بتهکن الحق
لکن تو کو منصوری رتبا ته بو (انا الحق)

ژمالا هکاریا عبـــد الرحیم رحمی[٢]

مەلا ل جەم هەمی کوردمانجان نەمازە ل جەم فەقەهان ئەو چەند ناســە کو نە حەوجەیە ئەز وەسفێ وی بدم. مەلا شاعرەکێ متەسەوفە، دیوانا وی د سالا (١٩١٩) زا. دە ل ستانبۆلێ کەتییە چاپێ. بەریا وێ ل پەترەسبورگێ ژی هاتبو چاپکرن. من ژڤێ چاپێ نسخەیەك ل شامێ د تاخا (گەڕەك) کوردمانجاندا دیتییە. چاپا پەترەسبورگێ چاپەکە لیتۆگرافیکە[٣].

مەلایێ جزیرێ ل هندە دڤەرێت کوردستانێ ئو جهو وارێت وێ بناڤی پێغەمبەرێ سەر دەفتەرێ بناڤ دکەن. مەلایێ جزیرێ خودێ پەرست و ژ خودێ بترس بویە، سۆفیەکێ هندێ بناڤ و

(٢) دیوانا جزیری، شیخ احمد الجزری مؤلفی، محمد شفیق ئارواسی، ژ بەدەرێ بەرێ.

(٣) کۆڤارا هاوارێ هەژمار (٣٣)ێ رۆژا چارشەمبی، چریا بێشین سالا (١٩٤١)ێ بەرەڕ (٧) دبن مانشێتا «کلاسیکێن مە»، تێبینا هەرەکۆل ئەزیزان.

دەنگ بوّیە کەهشتییە رێزا وەلیان ، بلبلێ ئەڤینییا دلان ، هۆزانڤانەکێ ناڤدار و مەزنێ کوردان[(٤)] .

مەلایێ جزیری ، گەوهەرەکا ئێکجار بنرخ و بهایە بچو رەنگان و بچو بهان ناهێتە کرین ؛ هەروەسا ژی چرایەکێ چەند بێژی کریسکدار و بچریسکە تو خو دبێژی خەتیرەیە (مەشخەلە) د روهنی ئو رۆشەنییا خۆدا ، وەکی ستێرا گەلاڤێژێ بلقە بلقا روناهییا ولێیە لسەر رێزە چیایێت بلند و هەلکەڤتی یێت جهێ بۆتان ؛ ئەو جهو ئەو وارێت چارکنار ژی روهن و رۆشەنکرینە[(٥)] .

ڤێهرسێ خودلێ زان ، ئەڤیندارێ یەزدان ، شەهسوار ، پوسپۆر و شەهرەزا د هەمی رەنگ و جۆر و ئاوایێت پەنی ئو نەپەن ، مەلەڤان دیەییف و گۆتن و قەسێت خۆش یێت کو گەلەك ژ نەزان و زانان بۆ دکاسۆتی ، ئەڤیندار و حەیران ؛ ئاواز ساز ، حەنەکباز دەست هەل و ژبەرخو دەرکەڤتی ئو سەرت ، سەر هۆستایێ ڤەهاندن ، کێشان و لێکئینان ، ئێخستنە بەرێك ، رێز و سەنك

(٤) خوەندنا لیتراتورایێ بۆنا دەرسخانێد ( ٧ ـ ٨ ) . یەریڤان ١٩٧٣ . میرۆیێ ئەسەد .

(٥) مێژۆوی ئەدەبی کوردی ، علاءالدین سجادی ، بەرگی یەکەم و دووەم ( ١٩٥٢ ـ ١٩٧١ ) .

کێشێ ، شێخ احمدێ جزیرێ‌یە ، یێ بێ بەڤلی[٦] .

## جهو وارێ ئانكو وارگەهێ جزیرێ :

جزیرێ بێ گومان بناڤێ جهێ ژ دایێ بوینێ كو جزیرە هاتیە ناڤ‌كرن . جزیر كەڤنە باژێرەكێ كوردان ، ژ باژێریێت ناڤدار بویە ژ ئەلند و بەری بەیانە ،ژبەركو كەشتی‌یا نوح پێغەمبەر لەسەر كەلاتەكێ ژ كەلاتێت وێ‌كو چیایێ جودی‌یە یێ كو ل نزیك جزیرێ ،كو ل دوی گوتنا دیروكڤانا ( جودی ) بێژەكە ژ ( گوتی ) وەرگێرایە سەر عەرەبی كری‌یە ( جودی ) هەكە وەبت دیارە ژ كەڤنە وارێت ژ رێڤە یێت مللەتێ كوردە ، كو بەرێ بنیاتێ مرۆڤی‌یە یێ كو لوێرێ پاشی گەمی راوەستیایی ، زێندی ب مرۆڤ و جانەوەرێت دی‌ڤە لسەر رویێ ئەردی بەلاڤبوینە[٧] .

باژێرێ جزیرێ لسەر چاخ و دەمێ خەلیفێ دوویێ عومەر كورێ خەتابی ( عمر بن الخطاب ) ب كوماندارییا عیاز كورێ غەنەمی ( عیاض بن غنم ) بێ شەڕ هاتیە ڤەكرن و زێرەسەر هاڤێتیە سەر خەلكێ وێ ئانكو ئاكنجی یێت وێ .

باژێر بخو دوو پشك بویە ،كەلات یاكو لسەر چاخ و دەمی خەلیفە

(٦) العقد الجوهري في شرح ديوان الشيخ الجزري ، احمد ملا محمد زفنگی ، قامیشلو ، مطبعة الرافدين ( ١٩٥٨ ) م .

(٧) مەلا جمیل رۆژبەیانی ، شەرەفنامە ، مطبعة النجاح بغداد بەرپەڕ ( ١٤٨ )

عبدالعزیزی هاتیە ئاڤاکرن و باژێرێ کەڤن کو هەر دو دکەڤنە سەر لایێ رۆژئاڤایا روبارێ دجلەیێ. هەکو ئاڤ رادبیت و بسەر رەخا دکەڤیت رویبار دبتە دوێ پشك باژێر بکەلاتڤە دکەڤنە دناڤدا، کو وەکی گرەکێ هەر چار رەخ ئاڤ بن، کو ژ بەر پارزتنا ئاڤاهیێت لسەر ئاڤێ کو شە نەگەهتێ سکرەکێ ژ کەڤر و بەر و کسلێ دبەرژا چێکر بو، کو رونیشتی ئو ئاکنجی ییێت باژێری ژی لسەر پراژا دەربازدبن ژڤی لایی بویێ دی ژبەر هندێ بناڤێ جزیرێ هاتە ناڤکرن .[8]

ئەڤ باژێرە بوسلمانا بناڤێ « جزیرة ابن عمر » بناڤکر، ژبەرکو لسەر چاخ و دەمێ خەلیفە عومەری هاتە ڤەکرتن سالا (١٧)ێ مشەختی هەڤبەری (٦٣٩) زاینی .[9] ئەڤ باژێرە نهۆ ل کوردستانا تورکیە ل نێزیکی توخوبێ عیراقێ ئو تورکی، ژبەرکو جزیر (٥٥) پێنجەه و پێنج کیلۆمەتران ژ باژێرێ زاخۆ دویرە، نێزیکی (١٤) هزار کەسانە پێتری باژێری ل لایێ رۆژئاڤایە و لایێ رۆژهەلاتێ بچویکترە، دناڤبەرا هەردواندا پرەکە، کو نهۆ رێکا ل ناڤبەرا عیراقێ ئو تورکیایە بەری چەند سالا هاتیە ڤەکرن ژ بۆ بازرگانیێ ئو هاتن و چونێ لناڤبەرا هەردو وەلاتان؛ بەلێ جزیر، ژباژێرێت ناڤدارێت کوردە ییێت کو گەلەك گۆتن، داستان، بەیت، هۆزان و

---

(٨) مەلا جبل رۆژبەیانی ؛ شەرەفنامە ژێدەرێ بەرێ .

(٩) خوەندنا لیتراتورایێ بۆنا دەرسخانێد (٧ ــ ٨) ژێدەرێ بەرێ .

چێرۆك چیڤانۆك و سەرهاتی پێ هاتینە گۆتن ، ب کۆچك و دیوان بشانەشین و بێلان ، ب کەلات و شویرها ولێ یا وەکی کەمەرکێ د چار کنارێت ولێ وەرهاتی ، کو دکولتۆر و لێتراتورا کوردان‌دا پایە ئو پەییسکەکا بلند و بالا هەبویە[10] .

ئەڤ بازێرە ، جزیرا بۆتا پایتەختێ میرگەها بۆتان ، یا کو گەلەك تۆرڤان بناڤێ جزیرا کەسك بناڤ‌دکەن ، دکەڤتە سەر رووبارێ دجلەی یێ‌کو دناڤ بازێری‌ڕا دچیت ل دەشتەکە پان و فرەهدا یاکو رەخێت ولێ بانی ئو کرە زوریێت کەسك بێت رەنك رەنك . ئەڤ بازێرێ لوی وارێ سپەهی ئو رەنکین لهەرچار رەخ و کناریێت کوردستانێ هەتاکو شەرێ یەکێ جیهانی ژی دەنك ڤەدابو ، ژبەرکو ب مێرك و باغێت خۆ بێت دل ڤەکەر و تازە وەکی بویکێت خەملاندی ئو کارکری ئو تڤ‌تڤاندی ئەو جهو وار رۆشەنکربون کو رۆشەنی‌یا وان جهو واران ل رێزە چیایێت دسەردا و بەردا ئانکو ل لایێ زۆری ئو زێری ڤەددا ئەو جهو ئەو وارێت خۆش دل‌ڤەکەر ئێکجار ( شەنك ) و قەشەنك دکرن[11] .

ئەڤ بازێرە ، جزیرا بۆتا بدەشتا ولێ ئو هەر دو رێزە چیا

---

(١٠) خوەندنا لیتراتورایێ ، بۆنا دەرسخانێت ( ٧ ـ ٨ ) زێدەری بەرێ .

(١١) ( البوتی ) ، محمد سعید رمزان ( رمضان ) ، مەم و زین ، تألیف أمیر شعراء الاکراد وأدبائهم احمد الخانی ، دار العلم للملایین بیروت ( ١٩٥٧ ) م .

یێت ل لایێ ژۆری ئو ل لایێ ژێری ، پرتەکە ژ دەشـــت و دو ڕێزە چیا یێت ب بەر ڕۆژهەلاتێڤە درێژ دبن هەتاکو دگەهتە دەشتا سندیا ئو ڕێزە چیایێ مەتینا ل لایێ ژۆری ؛ ئو چیایێ سـپی ل لایێ ژێری کو ژ وێرێ ژی دیسا بەر ڕۆژهەلاتێڤە درێژ دبت دەشت بچیانڤە هـەتا کو دگەهتە دەشتا سـپنەیێ ئو دەشتا زێبیێ ئو ڕێزە چیا مەتینا ئو چیایێ گارەیێ ل ئامێدیێ ، کو ئێـکەتی یەکا سرشـتی ل ناڤبەرا دەڤەرا بۆتان و بەهدینان ژڤێ چەندێ دیار و خویا دێت .

بازێرێ جزیرێ شەرگـەهەکا ئێکجار مەزن بویە ژ شەرگەهێت کوردستانێ د چەرخێ ( سەدێ ) چاردێ هەتا نیڤا یەکێ ژ ســـەدێ نازدێ ژ دابیوینییا عیسایێ ، بڕاهاڤێژا بازرگـانیێ ئو بەرفرەهی ئو ئاڤەدانیێ ، ژبەرکو دەڤەرا بەهدینـا ئو پایتەختێ وێ ئامێدیێ ؛ ب بازێرێ مویســـلێ ، دیاربەکرێ ، مێردینێ ، جـــۆلەمێرگێ و پایتەختێ هەکاریان ؛ ب بایەزیدێ ، مۆشـێ ، ئەرزەروم و وانێڤە بڕێـکێت کەروانی ئو هاتن و چوونی بەستی ئو گرێدایی بویە .

جزیرا بۆتان ژ مەزترین شەرگەهێت کولتـــور و ڕوشەنبیریێ بویە ل کوردستانێ ، ئەڤ ڕاســـتی‌یە ژی ژ هژمارا خویندنگەهـ و مەدرسان و جهێت بەلاڤـکرنا خویندەواریێ دیار و خـویا دبیت . ل سەدێ (چەرخێ) پازدێ ئو شازدێ ژدابیوینییا عیسایێ (س) هژمارەکا مەزن یا خویندنگەهـ و مەدرسـان ل دوی وی چاخی ئو دەمی ل دەڤەرا بۆتان بویە ، کو ل بازێرێ جزیرێ بتنێ خونیدنگەهـ

یێت ب بزاڤ و بزاڤێژ لێ بوینە ژ بلی دەرسێت ل مزگەفتان دهاتنە خویندن(١٢) .

ئەڤ خویندنگەهەنە وەسا پڕپیش و ب بزاڤ بوینە کو هەر سالێ هژمارەکا نەیا کێم ژ زانان و خویندەڤانان خویندننامە ژێ وەرگرتینە کو بوینە بەرپرسیار و دەستومیردایی د بەلاڤکرنا ئۆلی ئوئایینی و هەمی رەنگ و جۆرێت زانستی و زانیاریێ ل کوردستانێ ، ژبەرکو ، خوندکار ، میر و پسمیرێت بۆتان بناڤ و دەنگن وەکی هندە میر و پسمیرێت دی یێت میرگەهێت کوردان ، ژهەکاری‌یان ، دیاربەکر و مۆش و بەهدینان هەتاکو دگەهی‌یە سۆران و بابان رەنگە ژ وان پێتر ژی میرێت بۆتان گوهدایە بەلاڤکرنا رۆشەنبیریێ ونەهێلانا نەزانینێ برێکا ئاڤاکرنا مەدرسان ، خویندنگەهـ و مزگەڤتان ، مەزخاندنا سەرمایەکێ مشە ئو بێ دەستگرتن ل زانان ، دانان و رۆشەنبیران و ل خویندنگەهێت شاگردێت کورد ل هەر چار کنارێت کوردستانێ سەر تێ دکر ژ بۆ دویماهی ئینان بخویندنا خو ئو خویندننامە وەرگرتن(١٣) .

(١٢) ، محمد سعید رمضان البوتی ، مەم و زین ، المصدر السابق .

(١٣) پێش گۆتنا دیوانا مەلایێ جزیری ، یاکو نەمر ئەنوەر مائی بزمانێ عەرەبی تفیسی ئو سەیدایێ گیو موکریانی راڤاکری‌یە زارێ سۆرانی ئو سالا ( ١٩٦٤ )ێ چاپکری .

١ ـ نیشانەیا (بەلـگەیێ ڤێ راستی‌یا هەنێ ژی ئەڤەیە کو باهرا پێتر ژ رۆشەنبیر و زانا، ژ هۆزانڤان و تۆرڤانێت کورد ل کوردستانا ناڤەڕاست و کوردستانا ژۆری ئو رۆژئاڤا د چەرخێ پانزدێ شانزدێ ئو هەڤدێ هەتا هەژدێ ئو نیڤا نازدێ ژی دەمەکـێ نەیێ کورت ل بازێرێ جزیرێ بۆراندی‌یە ئـو گەلەکا ژ وان ژی خوینـدن‌نامە ژ دەست سەیدان و زانایێت جزیرێ وەرگرتی‌یە[١٤]، وەکی جزیری کو وارگەهێ وی بتویە، فەقێ تەیران کو خەلـکێ مکسێ (Miksé)یە ل رۆژهەلا‌تا هەکاری‌یان، ئەحمەدێ خانی ژ ئاکنجی‌یێت بایەزیـدێ بتویە، کوڕێ ئەسیری (ابن الاثیر) دویروکڤانێ بنـاف و دەنـگێ بوسولمانان دگەل هژمارەکا نەیا کێم ژ زانا ئو رۆشەنبیرێت ناڤدارێت بوسولمانان وەکی مەحەمەدێ بەرچاڤلی (محمد البرقعلی)، ئەبابەکر مەولانا، (حەسەنی سورچی)، (ئێزدین یبی) و (سەید عەلی) هتد[١٥].

٢ ـ گەلەك ژ خوندکار، میر و پسمیرێت جزیرێ بخو بدرستی وەکی میرێت گەلەك میرگەهێت دی یـێـت کورد دەستەکـێ بلند و بالا دزمانێت رۆژگارێ‌دا یێت‌کو ل کار بون وەکی فارسی، عەرەبی، تورکی ئو کوردی ژبلی بابەت و جورێت دی یێت زانیاریێ هەبویە، بڕادەکێ وەســا کو بەڤلی‌یا جزیری بخو کری‌یە وەکی میر ئەمادینێ

(١٤) شرفخان البدلیسی، شرفنامه ص (١٢٣)، ترجمة محمد علي عوني (١٩٥٧) دار احیاء الکتب.

(١٥) شرفخان البدلیسی، شرفنامه، ژێدەرێ بەرێ.

(عمـــاد الدين) یێ‌کو بەرێـکانێ‌یا هۆزانڤانیێ دگەل مەلایێ جزیری کری‌یە ، هەروەکی دهندە دەست ڤیسێت دیوانا جزیری‌دا هەیـە کو جزیری بناڤێ ئوستادی ئانـکو سەیدایێ بناڤ دکەت ، میر شەرەفخان کورێ میر ئەبدالی ئو گەلێت دی .

ڤـی وارگەهێ خۆش و سپەهی ، بەرفرهو بەربەردایی ، ب بەر و بیاڤ ، ل جزیرا بۆتان ، ل وارێ مەمێ ئالان و زینا زێدان ، شەرگەهو کۆکا رۆشەنبیر و زانان ، مروڤێت فێهرس و کەنـکەنان ، ژ ئافرەتوین و هەلـکەفتی ئو ژێ‌هاتیان ژێ ژابوینە ، کو مەلایێ جزیری وەکی ستێرەکا گەش‌دار بتویە ل ناڤ وان . هـــەر لوی چاخی ئو دەمی پێتریی میرگەهێت کوردان وەکی ئامێدیێ پایتەختێ بەهدینان ، جۆلەمێرکا رەنگین پایتەختێ هەکاری‌یان و پایتەختێت دی وەکی بدلیسێ ، دیاربەکرێ ئو متوشێ هتد . ج پاش و ج پێشی وان وەکی جزیرا بۆتان بنکوفکا زانان و رۆشەنبیران بونە ، بۆ نمونە : بازێرێ بایەزیدێ وارگەهێ سەیدایێ ئەحمەدێ خانی هنـــاڤ و دل کوزری یێ کورد و کوردستان و دانەرێ مەم و زینا دەنگ ڤەدایێ ل گەلەك وەلاتێت جیهان ، شاگردێ وی یێ چۆیی لسەر شۆپ و رێچا وی ، اسماعیل بایەزیدی ، مرادخانێ بایەزیدی نڤیسەڤانێ زەمبیل فرۆشی ، ئەو چیروك داســتانا هەتا نهۆ ڤێ گـاڤێ ژی لسـەر . ئەزمان و زارێ هەمی کوردا زێدەبار ل لایێ ژۆری ئو کوردســتانا رۆژئاڤا . مەلا مەحمودێ بایەزیدی ، زانایێ ب ناڤ و دەنـگ رێبەر و

خرڤەکەر و راڤاکەرێ پێتر ین جۆرێت روشەنبیری‌یا کوردی ئو دەستێ راستی ئەلـکزەندەر ژابای کونسولێ ئوریسی ، یێ د ژیێ شێست سالیێ‌دا بۆیـــە هەڤکور و هـــەڤ کاری وی ، هەمی رەنک و جۆرێت کولتۆرێ کوردی ل مزگەڤـت و خویندنـگەهو مەدرســـان بو خرڤەکری‌نە کو گەلەك لایێت ژینا مللەتێ کورد لوی چاخی ئو دەمی ، ج رۆشەنبیری ، جڤاکی ، هنەری ، ئەبۆری ، ئۆلی ئو ئایینێ تێدا دیار و خویا بوینه[١٦] . ژبلی کـتێبا مەحمود بایەزیدی یاکو بنـــاڤێ عادات و رسۆمات نامەئی ئەکرادیە یاکو زانا سۆڤێتی یا بناڤ ودەنگ ( مارگرێت ڕودێنکو ) پاشـــی راڤا کری‌یە زمـــانێ ئوریـسی وێنەیێ وێ ب ژاڤاڤە سالا (١٩٦٣)ێ ل مۆسکۆ چاپکری‌یە . بەلـێ ل پایتەختێ بزەخڤە بۆ لایێ ڕۆژئاڤا کو بدلیسە ، شەرگەهەکا مەزن بۆیە نەمازە لسەر چاخ و دەمێ شەرەفخانی دوپروکڤانێ نـــاڤدارێ کورد ، دبەلاڤـکرنا زانین و رۆشەنبیریێ کو چێترین نمۆنە حارسـێ بدلیسی‌یە ، ئیسەڤانێ کـتێبا « لەیلێ و مەجنون » یاکو زانا سۆڤێتی م. ب رودێنـکۆ بزاڤا روسی‌ڤە سالا (١٩٦٥) ێ ل مۆسکۆ چاپکری . بەلێ ل پـــایتەختێ ل لایێ رۆژهەلاتێ‌ڤە پایتەختێ هەکاری‌یان ، ل جۆلەمێرگێ ، یا بناڤ و دەنـگ نەکو هەمی مێرگ و گـۆل و وارێت سپەهی ئو دل ڤەکەرێت پڕ دلگر و ئەڤین ، ژبەر جۆم و جەلالێت

(١٦) ئەو دەست ئیسێت ژابای بهاریکاری‌یا مەلا مەحمودی ئـو زانایێت دی خڕڤەکرین هەمی ل کـتێبخانێت ئوبرسی‌دانە ، بێتری وان دکـتێبخانـا لینبگرادێ یا ئنستیتۆتار رۆژهەلاتزانیۆدا دانە کو هاتینە پارستن .

شەنگین ، ئەو پایتەختێ ل دوی گەلەك وڵاتنا هندە ڕۆژهەلاتزانا وارگەهو وارێ ژڕێڤە ئو وەلاتێ بابینیێ یێ مللەتێ کورد بویە ، شەرگەه و بنگەهێ زانـــین ، وارێ کولتورێ کوردی یێ بنیاتین ، ژبەرکو پێتربنی زانا و دانا ئو هۆزانڤانێت کەڤن (کلاســیکی) ، ل دوی سەروکانیان لڤێ دەڤەرێ ئو ڤی وارێ کوردا ڕابوینـــە وەکی عەلی هەکاری ( حەکاری ) یێ بناڤێ ( شیخ الاسلام ) ناڤدار بویە[17] یێ کـو سەیدایێ شێخ عەبدولقادر گەیلانی بویە کو دبێژنێ ( غوث الـگیلانی ) . هەروەسا عەلی تەرمۆکی ، عەلی حەریری ، فەقێ تەیران مەلایێ باتەیی ، عەلی تەڕەماخی ، پەرتو هەکاری ، عبدالصمد بابەك ، سیاپۆش هتد[18] . هەر وەکی وان ئامێدیێ پایتەختێ بەهدینان ، جهێ ناڤداریێت وەکی یەحیا مزوری ، مەلا مەنسوورێ گـێرگاشی خالد ئاغایێ زێبـاری ، بەکر بەگێ ئەرزی ، عیسێ دەلا ، ئو هۆزانڤانێ ستران و لاڤژە بێژی ، کوچك و شانەشین و دیوانا ، داوەت ، گوڤەند و دیلانا حەکور .

## چەرخێ جزیری تێدا ژی :

بیر و ڕاییێت شـــەهرەزان و پوسپۆران د کولتورا و تۆرێ کوردیدا د چەرخێ ناڤنجی ، ژ ڕۆژهەلاتزانان یێت هایدار و پسپۆر

(١٧) ئەنوەر ( انور ) المـائی ، ، الاکراد في بهدینـان ص ( ٧٥ ) ، موصل مطبعه الحصان ١٩٦٠

(١٨) کاموران عالی بەدرخان ، ، ڤێربونا خوەندنـا کوردی بەرپەڕ ( ٤٥ ) پاریس ( ١٩٦٨ ) .

بکری ، هەتا کو دگەهی‌یە پسپۆرێت کورد ، ژ دویرو کڤان ، تۆرڤان ، هۆزانڤان و رۆشەنبیران نەمازە ئەوێت لسەر مەلایێ جزیری نڤیسی چەند بێژی دگەلێز و جودانە ، نێزیکی شەش چەرخان ( سەدان ) دگرن ، ژچەرخێ پێنجێ هەتا شەشێ ( ٥ ـ ٦ ) هەتا کو نەهێ ئو دەهێ مشەختی هەڤبەری ( ١٢ ـ ١٤ ) ، هەتا ( ١٥ ـ ١٦ ) لێ ژ دایبوینی یاعیسایی ، کو ژ بو سڤکیێ ئەم دلێ وان بیر و رایێت گەلێز و جودا پارڤەکین سەر ڤان چار پشکێت ژێری :ـ

١ـ بیر و رایێت ئەلکزەندەر ژاباێ دکتێبا : جامعی رسالیا و حکایتان بزمانێ کورمانجی[١٩] . مێجەرسون دکتێبا گرامەرا کرمانجی یان زمانێ کوردی[٢٠] ، بلەچ شێرکو دکتێبا وی‌دا : القضیة الکردیة[٢١] ، ئەمین زەکی دکتێبێت خودا . تاریخ الکرد وکردستان[٢٢] . ومشاهیر الکرد وکردستان في العهد الاسلامي[٢٣] ،

(١٩) اسکندر ژابا ، جامعی رسالیا و حکایتان بزمانێ کورمانجی ، د دار الطبـاعتی أکادمیایی امبراتوریدا د تاریخا حزار و حشت صەد و شیست عیسوی ( ١٨٦٠ ) هەڤبەری ( ١٢٧٧ ) هجرتۆیە ، دبەرپەرێ ( ١٢ )دا .

(٢٠) Soom, Kurmanji Grammar, ar Kurdish Langue, London 1913 P. ( 6 ) .

(٢١) الدکتور بلەچ شیرکو ، القضیة الکردیة ، ماضی الکرد وحاضرم ١٣٤٩ ﻫ ـ ١٩٣٠ ) م مطبعة السعادة مصر .

(٢٢) أمین زکی بك ، تأریخ الکرد و کردستان ، الطبعة الثانیة ١٩٦١ ص ٣٣٦ .

(٢٣) أمین زکی ، مشاهیر الکرد و کردستان في العهد الاسلامی ( ١٣٦٦ﻫ ـ ١٩٤٧م ) مطبعة السعادة مصر ص ( ٢٠٦ ) .

کو بهزرا من ، ب ڤان ژ ئێك و دو ڤەگوهازتنیە ، ژ بەرکو هەر وەکی دیارە مێجەرسۆنی ژ ئەلـکزەندەر ژابایی ڤەگوهـارتییە ، ئو زانایێت کورد لسەر بیر و رایێت ژابایی و مێجەرسۆنی چونە ، ئەو کورتە یا ژابایێ سالا ( ١٨٦٠ ) ێی لسەر هۆزانڤانێت کەڤن د بەرپەرێ ( ١٢ ) ێ ژ کتێبا خو بڤی مانشێتی : رسالەیکە د بحثا شاعر و مصنفي د کوردستانێ کو ب زمانێ کورمانجیـە جهو وکتێب و شعر و حکایە وقصـەیێ د وان بیان دکە نڤیسی لبەر هاتیە نڤیسین و ڤەگوهازتن ؛ نیشانەیا ( بەلـگەیێ ) ڤێ چەندێ ژی ئەو لەنـگی ئو نەڕاستیێنە یێت کو ژابایی کرین چاخێ نڤیسین وەکی ناڤێ مەلایێ باتەیی کرییە « ئەحمەد » کو ناڤێ وی ( حوسین ) ە . ئەڤ بیر و رایەنە چەند بێژی ژ راستیێ دویرن ؛ ئەڤ نە راستیێە ژی ئانکو نە راستییا چەرخێ ژینا جزیری د سەدێ پێنجێ ئو شەشێ مشەختی ( کۆچی ) دا بوون ، ژ هەلبەستێت دیوانا جزیری بخو دیار و خویا دبن :

١ـ د هەلبەستە ( ١ ) یاکو بڤێ مالـکێ دەسـت پێ دکەت :

نەوایا موترب ( مطرب ) و چەنـگی ڤغان ئاڤێتە خەرچەنـگی
وەرە سـاقی هەتا کەنـگی نەشـوئین دل ژ ڤی ژەنـگی

حـەیاتا دل مـەیا باقی بنوشین دابمشـتاقی
ألا یا أیهـا السـاقی أدر کأسـاً وناولهـا[٢٤]

---

(٢٤) دیوانا جزیری ، شیخ احمد الجزیری مؤلفی ، طابعی محمـد شریف الآرواسی الحسینی شهزداة باشی ، أوقاف اسـلامیـة مطبعەسی ( ١٣٢٨ ـ ١٣٤٠ ) ھ .

کو د چەنـــد دیوانێت جزیریێدا وەکی دیوانا ئارواسی (١٣٣٨ _ ١٣٤٠) ه چاپکری و چەندێت د ژیدا ئەڤ هەلبەستا ژۆریێ سەرتا دیوانا ویە بناڤ کریە کو مەلا احمد زڤنگی بدایونا جزیرێ ژ بەرکو جزیری هەر وەکی دیار و خویایە ، لسەر هەلبەستا حافز (حافظ) شیرازیێ بزاماف و کێشا ولێ ژی چێیە یاکو د سەرتا دیوانا حافز شیرازیێ دایە کو بڤێ مالـکا ژێری دەست پێ دکەت :

ألا يا أيهـــا السـاقي أدر كأساً وناولها
كه عشق آسـان نمود أول ولى افتاد مشكلهـــا

ئو بڤێ مالـکێ دویماهیێ دئینت :

حضورى گر همى خواهى از و غايب مشو حافظ
متى ما تلق من تهوى دع الدنيا وأهملها[٢٥]

ژ بلی هندێ ژی چەند نیڤ مالـکێت د هەلبەستا ناڤبری یا حافزێ شیرازیێدا کرینە د هەلبەستا خودا[٢٦] ، یان ژ بـەر باوەری بسەرهێستایا حافز شیرازیێدا ئینان کو ژێهاتی ئو پسپۆرە کو بـدلێ جزیریڤە نویسیایە ، رەنگە هەر ژ بەر هندێ ژی بویە د مالـکا بەری

(٢٥) ديوان كامل خواجه شمس الدين محمد حافظ شيرازى باهتمام محمد رمضانى دارنـدەئی گلالەئی خاور ، در تهران بسال ١٣٣٩ خورشيد چاپ شد ، چاپخانەئی خاور پەڕە ( ٢٥ ) .

(٢٦) شاعیرانی کورد و ئەدەبیاتی فارسی ، د. ئەمین عەلی موتابچی ، گۆڤاری کولیژی ئەدبیات ژمارە ( ١٦ ) ١٩٧٣ ، بەرپەڕ ( ٢٢ _ ٢٤ ) .

مالـکا دویماهیێ ناڤێ حافز شیرازێ ئینـایە گۆتی‌یە :

ژ حافز قوتبی شیرازی مەلا فەهم ئەر بکی رازی

بئاوازێ نەی و سازی ببەی بەر چەرخی پەروازی

بەلێ جزیرێ چونکی زانایەکێ ژ بەرخو دەرکەڤتی ئو شەهرەزا بویە ، ناڤێ هۆزانڤانێت ب دلی ڤەنویسیاین و پەسەندکرین وەکی سەعدی شیرازێ ئو جامی هـەر دوێ هەلبەستێدا ئینانینە گۆتی‌یە :

مرا ژ اول ژ پور خامی کشاند آخر ببەدنامی

ژ رەنـگێ سعدی و جامی ژ شوهرەت پی حەسین عامی

جزیرێ د هەلبەستا خو یاکو ب تیپا ( ت ) دویماهیێ دئینت ، دیسا ناڤێ شیرازێ ئو سەرهۆستاییێت وێ دئینت ، بەلێ ب ئاوایەکێ دی دبێژیت :

گەر لۆلوئی مەنثوری ژ نەزمێ تو دخوازی

وەر شعری مەلێ بین تە ب شیرازێ چ حاجەت

دەڤێ مالـکێدا جزیری بخو پەستا دەست هەلی ئو شەهرەزایا خو دڤەهاندن ، ئێك ئینان ئێخستنە بەرێك ، کێشان و سەنگـاندنێ دکەت دبێژت ، نەپێتڤی‌یە هوین بچنە شیرازێ داکو دڕ و مراری ئو گەوهەرێت بئاویەکێ سپەهی ئو تازە ، شـــەنـگ و پڕ رەنـگ و قەشەنـگ ڤەهاندین ب بینن ، وەرن هۆزانێت مەلایی ئانـکو وی بخو

ببینن ، بخوینن دا ژ نوی هون ببینن ئەو نەهەر لشیرازێ ب تنێ هــەنە .

هەکە هاتو رامان و پەژنا مەلایێ جزیرێ ژ شێرازی هەر وەکی پێترینی زانایێت کورد باوەردکەن سعدی شیرازێ بیت ، سەعدی د سالا (٦٩٠هـ - ١٢٩١م) ، یان (٦٩١هـ - ١٢٩٢م) یا (٦٩٤ - ١٢٩٤) م چۆیە بەر دلۆڤانیێیا خودێ[٢٧] هەکە جزیرێ د سەدێ پێنجێ ئو شەشێ ژی بیت د چەوا ناڤێ سعدی شیرازێ ئینت ، خو هەکە رامان و پەژنا جزیرێ ژ شیرازێ حافز شیرازێ بیت یێ‌کو بچاڤەکێ بلند بەرێ خودایێ بیایە ئو پەییسـکبلند دانایێ د هەلبەسـتا ئەم بدرێژی لسەر پەییڤتین (ئاخفتین) ، لسالا (٧٩١ یا ٧٩٢) شەختی ، هەڤبەری (١٣٨٩ یا ١٣٩٠) ژدایبوینیێیا عیسایێ (لێ) چویە بەر دلۆڤانیێیا خودێ[٢٨] ، دیســا ئەو گۆتن ژ راستیێ دویرتر دبیت .

٢ - بیر و رایێت مەلا ئەحمەد محەمەد زڤنگی لسەر هەلبەستێت د دیوانا جزیری‌دا یێت کو لسەر هندە کریار و رویدانێت مەزن بێت ل رۆژهەلات و لسـەر ئاخا (خاکا) کوردســـتانێ بوین وەکی ڤان مالـکێت د هەلبەستا ژێری‌دا کو هندە زانا ئو تۆرڤانێت کورد ب چاخ د دەمێ ژینا وی دادنن ، یێت بڤان مالـکان ژی دەست پـێ دکەن : -

(٢٧) دکتور ذبیح الله صفا ، گنج سخن ، جلد دوم از نظامی تا جامی ، چاپ چهارم لاپەڕ (١٨٤) .

(٢٨) دکتور ذبیح الله صفا ، گنج سخن ، ژێدەرێ بەرێ لاپەڕ (٢٩٨) .

ژ رەعنا نێرگزێن تەی مەست و خوون رێز
زەمان بوّ عەهدی جەنگ ئەنگیزیّ جەنگیز

تەجانێ من دڤێت ئەی جانی عالەم
ژ من بەستن ب لەعلێن خوّی شەکەر ریز

ل ڤێرە دیارە هەر وەکی مەلا ئەحمەد زڤنگی بخوژی دبێژیت د راڤا مالکا ژ رێڤە دکەت کو ژامان و پەژنا جزیریّ، جوانی، شەنگی، سپەهینی ئو تازەتیّیا چاڤێت زەرییا چاڤ زەر نێرگزی، یێت وەکی چاڤێت مەست و سەرخوەشان زل دبن و دنفیێن، زلبوّن و نقیانەکا خوین رێژێت کاسوّتی ئو ئەڤینداریێت ولی راکرن و دانانا وان چاڤانە، کو ژ دل گوزرین و سوّتن و شەوتینا د دروّن و هناڤێت واندا وە لوان بەنگین و سەرگردانا کرییە ژ هزر و خالا وانڤە چاخ و دەمێ شەژ و جەنگێت جەنگیزخانی مونگولینە وەلاتێ وان سەرێك و بنێك کرییەڤە هەتا کو خوینا دل شەوتی ئو ئەڤینداریێت وان چاڤێت سپەهی وەکی جوّ ئو جوّباران لسەر رویێ ئەردی دزلیێن.[٢٩]

هەر وەسا د هەلبەستا :

ئیروّ ژ شەهکاسا سوژلی مەی هاتە فنجانا سەدەف
مننەت کو ئیروّ دێم دوژلی دا من مەیا حوسنا خو خەف

(٢٩) العقد الجوهری في شرح دیوان الشیخ احمد الجزری، احمد بن الملا البهق الزڤنگی ص ٢٧١ ـ ٢٧٢

هەتا پاشی دکەهتە :ـ

رەف رەف نهشتن زاغ زاغ
دانین لدلێ من داغ داغ
دلێ کی بمینت ساغ ساغ
وەستانە لەشکر سەف بسەف
سەف سەف مە دین هندی و زەنگ
جەنگیزلێ هات تەیمورلێ لەنگ
خەف وان رەشاندن دل خەدەنگ
تەشبیهی تیرێن خان شەرەف

ئانکو : لەشکری زەری ئەسمەران رێز ل دوی رێزلێ وەکی رێزێت لەشکرلێ خو بەرهەڤکری بۆ شەڕی داکو باڤێنە ئەڤینداریێت گوبین و بێسەمیان یا ئێرشێ ب بەنە سەر ، ئەف رێزبوینا زەری ئەسمەران بدرستی وەکی رێزبوینا لەشکرلێ هندیان و قولەڕەشانە د شەڕ و جەنگان ، هەرکەسێ تەماشەی ولێ رێزبوینا وان زەری ئەسمەران بکەت دلێ هزرکەت یا هێتەڤە بیرا وی کو جەنگیزخان پادشاهێ موگۆلانە بلەشکرلێ خوڤە هاتیە دابکەڤتە شەڕ و جەنگێ تەیمورلێ لەنگ . بەلێ لەشکرلێ وان زەری ئەسمەران بنەپەنی و دزیڤە تیرێت خۆیێت سەر تیژ و خوین رێز ب دل و جەرگ و هناڤێت دل شەوتی ئو کوزری ئو ئەڤینداریێت خو دوەرنین و جوویێت

خوینێ ژێ بەردەن ، ئەو تیرێت وان بدرســتی وەکی تیرێت میر شـەرەفدینی خانێ ئازیزی یێ جزیری بینە ، یێت کو بنیڤەکا دلێ دوژمنێت خو ، یێــت کو هەڤزکی ئو بەرێـکانێ دگەل دکر ژ بۆ خوندکاری و مێربتی‌یا میرگەها (میرنشـینا) جزیرا بۆتان[٣٠] .

هندە زانایێت کو وەکی سـەیدایێ جەگەرخوین ، وەسا هزر دکەن کو دەمێ هاتنـا تەیمورلێ لەنـگ مەلایێ جزیرێ زۆکوژە بچویە د جەنـگێ ئەنقەرێ‌دا یێ کو سالا (١٤٠٢)ێ ژ دایبوینی‌یا عیسایی(س) لناڤبەرا تەیمورلێ لەنـگ و سولتانێ عوسمانی بازیدێ یەکێ ، کو بایەزید د ڤێ شەڕی‌دا شکەستی ئو هاتیە ئێخسیرکرن ، کو دگەل بابێ خو چویە ئیرانێ ، پاشی سولتان بایەزید هاتیە گرتن و دویر ئێخستن . مەلا مەحەمەدێ بابێ وی ل ئیرانێ مایە هەتا کو فەرمانا خودێ بجهئینایی ، چویە بەر دلۆڤانی‌یا خودێ[٣١] .

ئەگەرجی ئەڤ بیر و رایا سەیدایێ ناڤدار شێخ موسێ کوڕێ حەسەن ، کوڕێ مەحەمەد ، کوڕێ مەحمودی ، یێ ب نیشانا یا نازناڤێ « جەگەرخوێن » ناڤدار دڤێ نرخدار بت ژبەرکو زانا ، رۆشەنبیر و شەهرەزا ئو هۆزانڤانەکێ بناڤ و دەنـگە ل هەر چار کنارێت کوردستانێ ؛ دەمێ وی هزرکرێ بو ژینا جزیرێ نێزیـکی

---

(٣٠) العقد الجوهری فی شرح دیوان الشیخ احمد الجزری ، المصدر السابق .

(٣١) ژ زاردەڤێ سەیدایێ مەزن جەگەرخوینی رۆژا ٢٧ ـ ٢٨ / ٧ / ١٩٧٠ ل ناڤ باغچەیێ مالا مە ل بەغدا .

راستیێیە هەر وەکی ژ ل دوی چۆن و هەلشکاڤتنا ئەز ل دوی دچم دلێ روهن و خویا بت[٣٢] ؛ بەلێ ئەڤ بیر و رایە یا چۆنا جزیرێ بۆ ئیرانێ دگەل مەلا مەحمەدێ بابێ وی پاشی شەڕێ ئەنقەرێ سالا (١٤٠٢)ێ ، نە ل چو سەروکانیان ، نەژی ل چو کۆڤار و رۆژنامان و نە ژ زاردەڤ ژی نەهاتیە بهیستن و سەیدایێ جەگەرخۆن ژی چو نیشـــانە ، (بەلـگە) بۆ چەسپاندنا بیر و رایا خو نەدانە دەست من .

٣ـ ســـەیدایێ ئەحمەد مەلا محمد زڤنـگی ، مفتیێ قامیشلی ، راڤەکەرێ دیوانا جزیرێ ،ل بەریەڕێ (ل ) د سەرتا دیوانێدا بیر و رایێت خو لسەر لەنگی ئو نەراستی یێت کو دگۆتن و بیر و رایێت رۆژهەلاتزانێ ئویرسی ئەلـکزەندەر ژابایی ئو مارتن فۆن هارتمانی یێ کو لیتۆگرافا دیوانا جزیرێ ب پێش گۆتنەکێڤە سالا (١٩٠٤)زا . ل بەرلینێ بەلاڤـکری ، نەمازە د گۆتنا واندا کو جزیرێ د ناڤبەرا (٥٤٠ ـ ٥٥٦)ێ مشـــەختی زێندی بویە ، لسەر چاخێ خوندکارییا عماد الدینی زەنـگی خوندکارێ مویسلێ ، کو سەیدایێ ئەمین زەکی ژی لسەر گۆتنا وان و کەڤنە سەروکانی یێت دی باوەڕکرییە کو د نیڤا دووێ سەدێ شەشێ مشەختی (کۆچی) جزیرێ ، یێ زێندی بویە ، هەڤ چاخێ عماد الدینی بویە ئو لبەك (دانەیەك) ژ دیوانا خو

(٣٢) چەرخێ ژینا جزیری دسەرێ یانزدێ (١١)ێ مشەختی ، هەڤبەری پانزدەیێ (١٥)ێ ز دایبوینێیا عیسایی (س) .

بدیاری بۆ خوندکارێ تەبرێزێ (خانێ خانان) هنارتی‌یە . ئەڤ بیر و رایەنە ، هـــەر وەکی دیاردبت و تێ گۆتن ژ هەلبەستا جزیری یا ژێری‌نە :-

خانێ خانان لامعێ نەجا تە هـــەر پڕ نور بی

کەشتی‌یا بەختێ تە ئەز بایێ مخـــالف دوَر بی

خانێ خانان ، نیشـانا خومالی یا خوندکارێ تەبریزێ بتویە ، ل دوی زانینا وان ؛ ژ بەر هنـدێ ئەو هزر کری‌یە ، هەر وەسا جزیری ل دوی زانینا وان ، زێدەبار ئەمین زەکی بەگ وەسا هزرکری‌یە کو جزیری ئەڤ هەلبەستە ژی بوی گۆتی‌یە ، ژ بلی دیوانێ ژی یا بۆهنارتی :

ئەی شەهنشاهێ موعەزەم حەق نگەهدارێ تە بی

سوَرەتێ (انا فتحنـــا) دوَر و مادارێ تە بی

هـــەر کنارێ پێڤە وەرگێری عنـــانی همەتی

زوهرە بێ پەیکی تە لو کەیوان رکێبدارێ تە بی

هەر وەسـا ژی ئەڤ مالـکا دڤێ هەلبەستا ژۆری وان کری‌یە نیشانە ژ بۆ چەسپاندنا بیر و را خو :

گەر چ دەر إقلیمی رابع هاتە تەختێ سەلتەنەت

پادشـاهی هەفت اقلیمان سەلامکارێ تە بی

کو رەنگە گومان بژێن لنك وان ژی ئـەڤ مالـكا ژێری بت :

نەی تنێ تەبریز و کوردستان ل بەر حوکمێ تە بن

ســـەد وەکی شاهێ خراسانێ دفەروارا تە بی

ئەڤەنە نیشـــانەیێت ژ دیوانا جزیریێ کو چەرخێ ژینا وی هەر وەکی هزردکەن د ناڤبەرا چەرخێ پێنجێ ئو شەشێدا ژیە کو زڤنگی ژی وەکی پێترین شەهرەزاییێت کورد ولێ چەندێ ب لەنگ و نەڕاست دزانن ، هەروەکی مە بدرێژی روهنکری ، پاشی دبێژیت : ئەڤ گۆتن و پەیڤێت جزیری نەکو بخوندکارێ تەبریزێ گۆتنە ، لێ بەلێ بخوندکارێ جزیرا بۆتا گۆتنــە ، بەلێ بچێشن و ئاوایەکێ زێدە پەسنانێ و کرنە لێڤانە ( موبالەغە ) .

نیشانەیا راستیێا هزر و بیرا مە ژی ئەڤ مالـكا ژێریە یاکو ئەم لسەر ئاخفتین :

خـەف وان رەشـاندن دل خەدەنگ

تەشـبیهـی تیرێن خانـ شـەرەف

د نیڤ مالـكا دوولێدا « تەشبیهی تیرێن خان شەرەف » رامانـ و پەژن میر شـەرەفخانە خونکارێ جزیرا بۆتا یێ کو ل سالا (١٠٠٥)ێ مشەختیێدا هێژ یێ زێندی بوبە ل دوی گۆتنا شەرەفخانێ بدلیسی .[٢٣]

(٢٣) میرشـەرەفخان کوڕێ میر ئەبدالیە ، ژ میرێت زێ هانی ئو بناف و دەنـگێت ڤێ بنەمالا خوندکارێت جزیریێیە ژ ئازیزانە ، کو ب مێرینی ،=

پاشى دبێژيت : ل نك من روهن و رۆشـەنبۆيە ئو گومـان ژى تێدا نينه ، كو مەلايێ جزيرێ ل دويماهىيا چەرخێ (سـەدێ) دەهێ مشەختى (كۆچى) ئانكو بدرستى پاشى (٩٥٠) مشەختى ژىيە ، هـەڤ دەم و هەڤ چەرخێ مير شەرەفخان كوڕێ مير ئەبدالىيە ، ژميرێت ئازيزان يێت بنەمالا وان خوندكارى ل جزيرا بۆتا كرىيە ، دەمەكێ درێژ . شەرەفخان ژى ئەو ميره يێ‌كو خويندنگەها سۆر ل جزيرێ ل سەر شورەها وێ يا دكەڤته لايێ رۆژئاڤا بازێرێ جزيرێ ئاڤا كرى ، چەند گوند ، چەند وارێت ئەردى و ئاقار لسەر وێ خويندنگەهێ وقف كرين . پاشى دبێژيت : « هەروەكى ژ ئاڤاهيێ خويندنگەهێ دياره ، ژ رێز و ژ سەر و بەر و سەخبێرا وێ يا سپەهى ئو بەركەڤتى ؛ هەر وەسا ژى ژ سەر و بەرێ ئۆدێت شاگران ل لايەكى ، يێت سەيدان (مامۆسـتـان) ل لايەكێ دى ؛ بۆ مرۆڤى ديار و خويا دبـت كو هژمارەكا گەلەك ژ شاگردێت زانيارى خازێت ئاكنجى ل خويندنگەهێ ئو سەيدايێت مەلەڤان و شەهرەزا ئو دەست هەل لوێ خويندنگەهێ بوينه ئو لسەرێك‌يان ژ وان زێڕى بۆيە ئو سـەيدايێت وى هەمى رەنگ و جۆرێت زانستى ، زانيارى ئو هـونەرى لوێرێ دگۆتن ، ژين و ژيارەكا ئێـكجار خـۆش ل دوى رۆژگارێ‌ژينه ؛ خارن و

= ميرخاسى ، زراڤ ستويرى هۆشمەندى هاتينه نياسين . ژ بلى هندێ ژى د دەمێ خوندكارىيا وىدا ل جزيـرا بۆتا ، تەنـاپى ، بەرفرەهى ئو ئاڤەدانى ل دەڤەرا بۆتا بەلاڤ ببۆ ، نەمازە ، ئاڤاهى يێت شەنـگ ل بازێرێ جزيرێ .

ڤستن و خویندن هەمی ل خویندنگەهێ بەرهەڤ بوینە . پاشــی زڤنـگی دبێژیت :ـ بەری سیه سالان دەمێ کو ئەز ل جزیرێ بوم ، چاڤێ من بدەفتەرەکا ئەوقافا میریێ ل بازیرێ جزیرێ کەفت ؛ ئـەو خویندنـگەه ( مەدرسە ) ئو مزگەفتێت دبن زێرەڤانی‌یا ئەوقافێ تێـدا ڤیسی بون . من هژمارا وان خویندنـگەهان و مزگەفتان و جامعان و ئەوقافێت ئانکو جهێت لســـەر وان وەقف کرین دوی چـاخی ئـو دەمی ییێت میرێت زێ هاتی ، جوامێر و بەرکەڤتی وەسا بژردی ، بکەرمی و ژ دل پویتە پێ‌کری ئو چاڤێ خۆ دایێ کو بڕاستی ئەز مەندەهۆش و سەرسوڕمایێ وان خودان بەختان بوم ، وان چەند ما ژ هندێ کری‌یە ، چاڤێ خو دایە بەلاڤـکرنا زانین ، زانسـتی ئـو خویندەواریێ و پێ گەهاندنا شاگردێت زانـین خـــواز ؛ برێـکا مەزخاندنەکا دەست بەردایێ ، کو ئەو خویندنـگەه و مزگەفتەنە هەمی ژ خو ئو بهەروە بونە ، ســـەیدان و شاگردان تێڤە ژینە ، د خار و ڤەدخار ، دەرس دگۆتن و دخویندن[٣٤] .

ئەڤ میرە ، شەرەفخان یا میر شەرەف کوڕێ ئەبدالی ، ســـالا

(٣٤) ئەڤ گـۆتنە ئانکو چیرۆکا دیتنا دەفتەرێ لجزیری بەری سیه سالان ؛ دبتە سالا ( ١٩٢٨ )ێ ژ بەرکو سالا ( ١٩٥٨ )ێ دیوانا جزیری بڕاڤاڤە هاتیە چاپکرن ، بهزرا من کو چو گومان تێدا نینە ، نەکو احمد مەلا محمد زڤنـگی‌یە ؛ لێ بەلێ مەلا عبدالسلام نـاجی‌یە ، چکو د ژینە نیگـارا مەلا عبدالسلامی‌دا هەر وەکی د هژمارا (٧)ێ نوسەرێ کورددا بەلاڤ‌بوبی ، مەلا عبدالسلام بو کو ژ جزیرێ هاتیە سوریێ کو دمێ بدرێژی ژوهن کەین .

(١٠٠٥)ێ مشەختی یێ زێندی بویە لدوی گوٚتنا شەرەفنامێ یا شەرەفخانێ بدلیسی بزمانێ فارسی نڤیسی، کو تێدا گوٚتی‌یە : میر شەرەفی ئـەو خویندنگەهـ ئانکو خویندنگەها سوٚر بپارێت خو ئاڤاکربو، سەرێ ژ رێڤە بوٚیە خوندکارێ بوٚتان کو ژ بوٚ بەلاڤـکرنا زانین و زانسـتیێ د رێـکا خودێ وەقف کری‌یە[٣٥] .

هەکە بێت و ئەم هویرك هزرا خو د بیر و رایێت احمد مەلا مەحەمەد زڤنـگی لسەر روهنکرنا چەرخێ ژینـــا مەلایی جزیری بکەین دێ بینین کو پاشی بیر و رایێت زانا ئو روٚشەنبیرێت کورد بیانێ ئێك ل دوی ئێکی دادنیت ، هند بلەنـگ و هندەکا دویر ژ راستیـێ ئو

(٣٥) شەرەفنامە ، سەروکانی‌یا بەرێ ئەڤ گـوٚتن و بەیڤێت احمد مەلا محمد زڤنـگی بەرچاف نەکەڤتن ژ بلی هندێ پێڤە کو دو جارا میر شـەرەفخان بوٚیە خوندکار ؛ ژ بەرکو عزالدینێ برایێ وی هەڤرکـێ وی بوٚیە ، پاشی برایێ وی ب پشتەڤانی‌یا ـ کاربدەستـــان ـ ل ستـــانبوٚلێ کری‌یە خوندکارێ جـزیرێ ، نەبری‌یە ســەر ؛ جارەکا دی ، شەرەفخـان ، زڤراندی‌یەڤە سەر خوندکاری‌یا جزیرێ ، عزالدینی ژ میرانیێ ئێخستی خو بەرهنگاری شەرەفخانێ برایێ خـو کری‌یە بپشـتەڤانی ئو هـاریکاری‌یا جەربەزە ئو بێ تورەیان . بەلێ شەرەفخانی بوسەیەك لبەر ڤەدایە کوشتی‌یە . هەروەسا ژی مێژویا فەرمانا سولتان مراد خانی ( ١٠٠٥ مشەختی = ١٥٩٦ زاینی ) ، چاخ و دەمێ وی بتەنایی ، بەرفرەهی ئو ئاڤەدانی نـاڤدارە ( بەربەژ ١٢٧ ـ ١٣٨ ) شەرەفنامە ، وەرگـێڕ سەیدایێ نەمر محمد علی عونی جوزیا یەکـێ ( ١٢ ) رەمزان (١٣٦٧ھ) بەرانبەری ١٩٤٨/٧/١٩م .

هندەکا نێزیــکی راستیێ دادنیت ؛ دگەهتە بڕیارەکا هشك و گومان بڕ ددەت دبێژت : جزیری د نیڤا دوولێ ژ سەدلێ دەهی مشـەختی (کۆچی) ئانکو ژ (٩٥٠) مشەختی ولێڤە ژی‌یە ، هەڤ چەرخ و هەڤ چاخ و دەمێ میر شەرەفخان کوڕێ میر ئەبدال ، ژ بنە مالا (ئازیزان) یاکـو دەمەکی درێژ خوندکاری ل جزیرێ کری‌یە . مـیر شـــەرەفخانی ناڤبری خویندنـگەها (سۆر) ئانکو مەدرەســـا سۆر ئاڤاکری‌یە ؛ گوند و وارێت وەرزگاری ئو چاندن و داچاندنێ ئو ئاقار لســـەر ولێ خویندنگەهێ وەقف کری‌نە . مەلایی جزیرێ دەرسدارەکێ (سەیدایەکێ) ولێ مەدرەسا سۆر بۆیە . میر شەرەفخان لسالا (١٠٠٥)لێ مشەختی یـی زێدی بۆیە .

زڤنـگی ڤان بیر و ران لسەر چەرخێ ژینا مەلایـێ جزیرێ لبەر چاڤان دادنیت ، بـێ کو نیشانەیێت گومان بڕ ژ تێـکست (نەس) یان بیر و رایێت بـێ گومان لبەر چاڤان دانیت ژ بۆ چەسپاندنا بیر و رایێت خو . نیشانەیێت زڤنـگی بیر و رایێـت خو لســـەر دانانە چەند مالـکێت هەلبەستێت جزیرێ‌نە یێت ، بەری نهۆ مە لبەر چاڤان دانانە . ئەو ژی جهێ هەلشـکاڤتن و کـێنگەشێ‌نە .

تشتێ گومان بڕ یـێ دگۆتن و پەییڤ و بیر و رایێت زڤنگی‌دا هــــەر ئەڤ چەند گۆتنەنە کو پاشـــی ل دوی چـۆنێ بۆ مە دیاربوی کو شەرەفخان کوڕێ میر ئەبدالێ ئازیزان ســالا (١٠٠٥)لێ مشەختی هەڤبەری (١٥٩٦)لێ زایینی بفەرمانا سولتانێ عوسمانێ بو

خوندکارێ جزیرێ[٣٦] .

زڤنگی ل دوی لێکدانا خو سالا ژ دایبوونیێا جزیرێ گۆتی‌یە کو پاشی سالا (٩٥٠) مشەختی (کۆچی)یە ، هەر وەسا سالا زێندیبوونا میر شەرەفخانی کری‌یە هەڤ چەرخێ وی ژ شەرەفنامێ دەرئینایە کو (١٠٠٥)ێ مشەختی‌یە ، بەلێ دیسان بهزرا من چو نیشانە نینن پێت گومان بڕ کو جزیرێ پاشی (١٠٠٥)ێ ژی بیت پاشی میر شەرەفخانی مزگەفتا سۆر ئاڤا کری ئو ئەو بۆیە دەرسدار (سەیدا) .

ژ بلی هندێ ژی زڤنگی سالا ژ دایبوونیێا جزیرێ بدرستی روهن نەکری‌یە کا چەند پاشی سالا (٩٥٠)ێ مشەختی بۆیە (٥) سالا (١٠) سالا یان پێتر یاکێمتر ،کو سالا پاشی (٩٥٠)ێ هەتا سالا (١٠٠٥)ێ کو شەرەفخان بۆیە خوندکارێ جزیرێ ژ نیڤ چەرخی (سەدەی) پێترە ئانکو (٥٥) سالن . ژ بەر ڤێ یەکێ سالا ژ دایبۆینیێا جزیرێ وەکی شەڤرەشێت رەشە مەهی رەش و تاری مایە چو سیناهیەك ژێ دیار نیە . هەر وەسا ژی مێژویا دەستوریر خازی ئو چونا بەر دلۆڤانیێا خودێ ژی ئانکو دنیا لێ تاریبۆن یانی مرن هەر ئێکجار دگۆلا تاریێ دایە . پاشی دا بەرێ خو بدەینە نیشانەیێت (بەلگەیێت) د دەست زڤنگی‌دا کو جزیرێ کری‌یە هەڤ چەرخ و هەڤ دەم و چاخێ میر شەرەفخانێ جزیری :-

---

(٣٦) شەرەفنامە بەرپەڕ (١٣٧ - ٣١٨) زێدەرێ بەرێ .

١ـ مالکا هۆزانا دویماهی ب تیپا ( ف ) یە کو بەری نهۆ زڤنکی بخو ب شباندنەکا ئەڤینداری دایە قەلەمی :

خەف وان رەشاندن دل خەدەنگ

تەشبیهی تیرێن خانـ شەرەف

ئەڤ « تەشبیهی تیرێن خان شەرەف » نیشانەیەکە ( بەلگەکە ) زڤنکی بیر و را خو پێ دچەسپینت ، کەچی زڤنکی بخو د راڤا ڤێ هەلبەستێ د بەرپەرێ ( ٢٧١ ـ ٢٧٢ ) ژ کتێبا خو[٣٧] دبێژیت : ئەڤ هەلبەستا غەزەلی یا جزیری ، بریزا لەشکرێ زەری ئەمیران گۆتییە ، کو رێزکرنەکا وەسا شەنگ و سپەهی بویە بلەشکرێ جەنگیزخانی شباندییە چاخێ خو بەرهەڤکری بۆ شەڕ و جەنگێ لەشکرێ تەیمورێ لەنک وەسا بسەهم و ترس و لەرز بتویە ، بەلێ دربێت وان د دانان کو دل د کوزراندن و شەوتاندن بدرستی شێ تیرێت شەرەفخانی نە کو ل دلێ دوژمن و نەیار وپیلانگێرێت بۆسە لبەر شەرەفخانی دادنان داکو ژ ناڤ ببەن .

٢ـ هەر وەسا ئەڤ مالکا هەلبەستا جزیرییە یاکو دویماهی ب تیپا ( ی ) تێ :

خانێ خانانـ لامعێ نەجما تە هەر پڕ نور بی

کەشتییا بەختێ تە ئەز بایێ غالف دوَر بی

(٣٧) العقد الجوهری في شرح دیوان الشیخ احمد الجزری ( المصدر السابق ) .

هەر ئەڤ مالـکا هەلبەستا جزیریێ یا گەلەك زانایێت کورد ئینانینە سەر بیر و باوەڕا کو جزیریێ د ناڤبەرا چەرخێ پێنجێ و شەشێ ژیێ یە هەر وەکی هاتیە روهن کرن، زڤنکی دبێژیت : رامان و پەژنا جزیریێ ژ « خانی خانان » نە خوندکارێ تەبریزێیە هەر وەکی ڤیسەرێت سەرگوزەشتێیا جزیریێ نڤیسی، بەلێ رامان و پەژن ژ ولێ پەیڤێ میر شەرەفخان کوڕێ میر ئەبدال بەگێ خوندکارێ جزیرا بۆتا بویە. بەلێ زڤنکی چو نیشانە د دەستدا نینن ژ بۆ چەسپاندنا بیر و را خو هەتا خو وەکی بێت وی هزرا وان بلەنگ و نەراست دزانیێ کو خوندکارێ تەبریزێیە کو « خانی خانان » نیشانا (لەقەبا) خوندکارێ تەبریزێ بویە .

٣ـ هەر وەتوڤ دڤێ هەلبەستا جزیریدا :

ئەی شەهنشاهێ موعەزەم حەق نـکەهدارێ تە بی

سـورەئی (انافتحنا) دۆر و ما دارێ تە بی

زڤنکی ڤێ مالـکێ ب هەلبەستڤە دبێژیت بخوندکاریێ تەبریزێ نەکۆتییە، لێ بەلێ ب میر شەرەفخانێ خوندکاریێ جزیرێ هلدایە، نیشانەیا د دەست زڤنکیدا هەر ئەڤەیە کو شویرها جزیرێ ئایەتێت قورئانێ لسەر نڤسیبۆن، رامان و پەژنا مەلایێ جزیریێ بسورەئی « انا فتحنا » شویرها جزیرێ یا نڤسییە. ژ رێڤە چو نیشانە (بەلـگە) نینن کو شویرها د چار رەخێت باژێرێ جزیرێ دوەرهات (وەردهات) ئایەتێت قورئانێ لێ دنڤسی بۆن. یا دووێ ژی : گەلو هەر شویرها

باژێرێ جزیرێ بتنێ ژ شەویرهێت باژێرێت دی ل کوردستانێ ئو ژ دەرڤە ل وەلاتێت بوسولمانا ئایەتێت قورئانێ لسەر نڤیسی هەبوونە؟ یا ژی ژ بلی باژێرێ جزیرێ ژی ژ ریز و سەر و بەر و رەوشتێت بوسولمانا بوینە کو ئایەتێت قورئانێ لسەر مزگەفت و مناران و خویندنگەهێت شاگردێت زانیاریخواز لێ دخویند ئایەتێت قورئانێ لسەر دنڤیسین، کو نموونە ل گەلەك جهان مانە؛ ژ بۆ توبەرك و باوەرێ ئینان ژ بۆ پارزتن ژ دەست ڤەکر و درۆوندان و هۆڤان، نەمازە ل رۆژهەلاتا ناڤین و ناڤەراست یاکو بویە کۆك، شەرگەه و مەیدانا شەرێ و جەنگێت مەزن زێدەبار شەرێ و جەنگێت موگۆل و تەتەران کو دویروکا رۆژهەلاتا ناڤین و ناڤەراست ژ چەرخێ سێزدێ هەتا چەرخێ پانزدێ ژ شلقێت ئێریشێت وان درۆوندان و هۆڤان رزگار نەبویە ئو نەهاتیە پارزتن .

٤ـ ئەڤ مالکا هەلبەستێ ژی نیشانەیەکە د دەستێ زڤنگیدا ژ بۆ چەسپاندنا بیر و را خو :

گەرچی دەر اقلیمی رابع هاتە تەختێ سەلتەنەت
پادشاهێ هەفت اقلیمان سەلامکارێ تەبی .

زڤنگی د راڤا ڤێ مالکێدا دبێژیت : رامان و پەژنا مەلایێ جزیرێ جزیرا بۆتانە، ژ بەرکو باژێرێ جزیرێ دکەڤتە د ناڤ دەڤەرا (هەرێم ـ اقلیمێ) چارێ ژ هەر هەفت دەڤەران (اقلیمان)، لسەر لێك ڤەکرنا کەڤنا دەڤەرێت کوردێ هاتینە لێك ڤەکرن ژ بۆ کارگێری

ئو د رێڤەبرنا کار و بارێت وان ، بەلێ هەر شەش دەڤەرێت دی دلێ کیژبن ، پاشی ڤێ مالکێ ژ هەلبەستێ دکەتە نیشانە :

٥ـ نەیتنی تەبریز و کوردستان لبەر حوکمێ تەبن
سەد وەکی شاهێ خوراسانێ د فەروارلێ تەبی

زڤنکی هەر وەکی مالکێت بەرلێ هزر دکەت کو رامان و پەژنا جزیرێ نەخوندکارلێ تەبریزلێیە هەتا کو ناڤێ تەبریزلێ ژی بەری ناڤێ کوردستانێ هاتبتە گوتنێ ، بەلێ دیسا زڤنکی ب پەسنکرنەکا میرلێ جزیرلێ کو میر شەرەفخانە ب چێشنەك و ئاوایەکێ ئیڤانەڤە کو بناڤێ زێدە کەل کرن و شـــاراندن د دەنە قەلەمێ ، بەلێ هەر وەکی بەرلێ بیر و رایێت رویت مانە بێ نیشانە ئو ئەگەر .

٦ـ پاشی ڤێ مالکی دکەتە نیشانە ژ بۆ گوتنا ڤێ هەلبەستێ هەمێ کو ب میر شەرەفخانی هاتیە هلدان :

ماجزیرلێ شـــبە دار تـەختێ هــــەفت اقلیـم بت
هەم بحکم و ســـەلتەنەت ئەسکەندەر و فەغفور بی

زڤنکی لنك دیار و روهنە کو جزیرا بۆتا یا کو پایتەختێ خوندکارییا تە ببتـە بنـکەهێ کارکێرییا هەر هەفت دەڤەران کو خوندکاریێ ل خوندکار و پادشاهێت وان بکەی ، کو تو بولێ خوندکارییا خو وەکی ئەسکەندەرلێ مەزنی بێ کو وەلاتێت جیهان کری‌نە دبن دەستێ خوڤە .

ئەوانەش کە دەشێ پێشگر یا پێشگری دواکەوتوبن :

بەسەردادان ـ بەسەریدا دا ، دای بەسەریا

بە سەردا کردن ـ بە سەریا کرد ، کردی بە سەریا

بەدەستەوەدان ـ بەدەستیەوەدا ، دای بەدەستەوە

بەکۆڵدادان ـ بەکۆڵیادا ، دای بەکۆڵیا

لەکۆڵ کردن ـ لەکۆڵی کرد ، کردیەکۆڵی

بەڵان ئەو ئاوەڵناوانەی کە یەکێك لەم پیتـانەیان پێوەیە ، نـابنە پێشگر ، چونکی هـەر بە وتەیەکی مانادار دەژمێررێن : « بە ، بێ ، لە ، نا ، نە » . وەك : بەهێزی کرد ، بـێ تینی کرد ، نارێکی کرد ، لەباری کرد ، ناچاری کرد ، نەخۆش کەوت .

لەهەندێ لێکدراوەدا دوو پێشگر پێـك دەگەن ، یەکێکیان یەکەم کەرتە و ئەویتریان بە یاریکارەکەوەیە جا هەریەکەیان بەگوێرەی خاسیەتەکەی ئەرکی خۆی لە لێکدراوەکەدا ئەبینێ ، بەڵام کەرتەکانی تر بە بێ پێشگری یەکەم مانایان تەواو نـابێ . وەك : لێك دابڕان ، تێك وەردان ، پیاهەڵـگەڕان ، پیاهەڵشاخان ، تێ هەڵچوونەوە .. وە دەشێ پێشگرێك یا دوان بکەوێتە ناوەندەوە و لەم بارەدا ئەگەرچی ئەرکی خۆشی دەبینێ بە نیسبەت یاریکارەکەوە بەڵام مانای لێکدراوەکە بە وتەکەی پێشەوە تەواو ئەبێ . وە لەم جۆرە لێکدراوەدا پێشگرەکە دەچێتەوە سەر بنچی خۆی لەکارە تێپەڕەکاندا ئەگەر بەرناوەکانیـان دیاربوون :

تێنەپەڕ :—

خەولێکەوتن ، زەردەهەڵگەڕان ، ڕەشداگەڕان ، خۆهەڵکێشان .

تێپەڕ :—

تەنگ‌پێ‌هەڵچنین ـ تەنگی بە پیاوەکە هەڵچنی .

پڕپیاکردن ـ پڕی بە منداڵەکەدا کرد . دەست‌پێ‌کردن ـ دەستی بە قسە کردن کرد . چاوپێ‌کەوتن ـ چاوی بە بایز کەوت . هەروەها : چاولێ‌کردن ، دان پیانان ، پێ‌پیانان ...

## ( بەشی دوەم — پاشگرەکان )

پاشگر بریتیە لە کۆمەڵە پیتێك کە دەچێتە پشت وشەیەکەوە بۆ مەبەسی گۆڕینێکی کەم لە مانادا . پاشگر کەرتێکی تایبەتی پێك ناهێنێ و وشەکە ناکا بە لێکدراو بە پێچەوانەی پێشگرەوە .

### (أ) : پاشگری « ەوە » :—

ئەم پاشگرە گرنگترینی پاشگرەکانە چونکی زۆر تر بەکارهاتوە و لەئەرکێك پتر دەبینێ لە کارەکان و ناوەکاندا . وە بۆ ئەوەی بە چاکتی ئەم پاشگرە بناسین ، ئەبێ لە پێشەوە بزانین کە لە زمانەکەماندا ئەمراز هەیە و لە هەمان کاتدا لێکچوی ئەمرازیش هەیە لەرواڵەتدا . بە وێنە ئەمرازەکانی بچوك‌کردنەوە :(ۆکە) — بیلۆکە ، شێتۆکە . (ۆڵە) — کیژۆڵە ، نەرمۆڵە .(ۆلکە)—

داسۆلکە ، جامۆلکە . جا دەبینین لە وتەی تریشدا هەمان ئەم کۆمەڵە پیتانە هاتوون و ئەمرازیش نین ، چونکە خاسیەتی ئەرکی ئەمرازیان نیە . وەك : چارۆکە ، جاڵجاڵۆکە ، ریخۆڵە ، ریشۆڵە ، ماسۆلکە . هەروەها دەزانین کەئەمرازی کۆمەڵ (ان) ە ، کەچی ئەم دوَ پیتە لەوتەی تاکیشدا هاتوون و ئەمراز نین ، وەك : ئەرخەوان ، بناوان ، رێگەوبان شیوان .

ت . د . ئەمرازی شـوێن (ایی) لەم وتانەدا بە وێنە : لێوایی ، بەرزایی ، ئاوایی ، تەختایی . کەچی ئەم پیتانە لە وتەی تریشـدا هاتوون و ئەمرازنین : تارمایی ، خۆڕایی ، کوێرایی ، کۆتایی . ئەمرازی (یی) کە ئاوەڵناو دەکاتە ناوی مەعنەوی ، وەك : تورەیی ، پچوکی ، گەورەیی ، لە وتەی تریشدا هاتوە و ئەمراز نیە : بەزەیی ، شێنەیی ، سرکەیی ، شورەیی . جا هەروەها کۆمەڵە پیتی « ەوە » نابێ لە هەر شتێکدا دیمان بەپاشگری بژمێرین . بەڵکو دەبینین لەم چاوگانەدا و کارەکانیشیانا هاتوە بەلاّم پاشگر نیە :ــ

رشانەوە ، توانەوە ، پاڕانەوە ، کولانەوە ، تلانەوە ، خولانەوە ، کوژانەوە ، چەمانەوە ، چۆڕانەوە ، گیرسانەوە ، هۆنینەوە ، دامردنەوە ، دامرکانەوە ، کۆبونەوە ، ئاشت بونەوە ، تێهەڵچونەوە . ت د وە لە رَوداودا « ەوە » لەموتانە و لێکچوی ئەمانەدا ناچێتە ژێر هیـچ پێناسێك [ تعریف ] لەوانەی بۆ ئەو زاراوەیە « پاشگر » داراون ، چونکە چ ئەرکێك یا چ مەبەسێك لە ئەرك و مەبەسی پاشگر پێشـان نادا ، کە یەکێکیان دوَبارە کردنەوەی کارە ، وە یەکێکی

تریان گۆڕینی واتایە مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە وتارەکەیا گوتویە کەوا پاشگری «ەوە» هەمیشە یەکێك لەم سێ مەبەستە ئەگەیەنێ :
(١) گەڕانەوە، هەر دوو نمونەش هەیە بۆئەمە : (هاتنەوە، چونەوە).
(٢) دوبارە کردنەوەی کارێك. (٣) هێواشی و بەرە بەرە «تدریج».
وە نمونەیەکی زۆری لەسەر مەبەسی سێیەم هێناوەتەوە و ئەوانەی کە «ەوە» یان پێوەیە بە لێکدراوی داناون و ئەوانەی نیانە ـ لیستەی لای راست ـ بەسادە، (ل ٢٦٣ ـ ٢٦٧). بەڵام ئەو نمونانە، لەراستیدا، مەبەسی «هێواشی و بەرە بەرە» ناگەیەنن، ژمارەیەکی کەمیان نەبێ، وەك : «خوێندنەوە، کۆکردنەوە، نوسینەوە». وە ئەگەر لەم جورە سروشتە ورد بینەوە لەکارەکاندا ـ چاوگەکاندا ـ بۆمان دەرئەکەوێ کە زۆر کاری لەم سروشتە هەیە و ئەو پاشگرەشیان پێوە نیە، وەك ئەمانەی ژێرەوە :

(چون، رۆیشتن، خواردن، نوستن، درومان، هاڕین، رزین، گریان، برژان، روان، بارین، گەرم بون، پیربون، ئاوسان، هەتاوکەوتن، ئاوابون، خۆشتن، نەخۆش کەوتن، ئاودان، رۆژهەڵاتن، پیاسەکردن، سەوزبون، ئێشك گرتن، بەخێوکردن، پەروەردەکردن، گۆرانی گوتن. ت. د. ئەو کارانەی کە هێواشی و بەرە بەرەیان تیا نابێ، وەك : تەقین، تەقینەوە، قرتاندن، دەرپەڕین، گڕگرتن، پەڕینەوە ـ بە بازێك لە جۆگەکە دەپەڕێتەوە ـ کوژانەوە ـ لەپڕ ـ، ئاوڕدانەوە ـ لەپڕ ـ وەرگەڕاز، بیرکەوتنەوە (هاتنەوەبیر)، هەڵبەزینەوە،

کەوتن یا بەربوونەوە ، داخستن یا کردنەوەی دەرگا بە خێرایی و توندی .
ت . د . جا لەو نموونانەی ســەرەوە هەمویان بۆمان دەرئەکەوێ بە
چاکی کە پاشگری « ەوە » بۆ مەبەسی کاری هێواشـی و تەدریجی
دانەنراوە و هیـچ پەیوەندیێکی بەم نوختەیەوە نیە . دوای ئەوە
ئەبینین ئەو مامۆستایە لە سی لاپەڕەدا هەر لەسەر باری سێوشەی :
خواردنەوە ، چوونەوە و بردنەوە ، رۆیشتوە و بەراوردی کردوون لەگەڵ
بیر و باوەڕی د . نەسرین . . ئێمە نابێ ، وەك وتم ، هەموو « ەوە »
یەك بە پاشگر بزانین ، چونکو دەبێ بە پێی پێناس و ئەرکی ئەم
زاراوەیە بزانین لە کوێدا پاشگرە و لەکوێدا پاشگر نیە . خۆ هەمووشمان
دەزانین مەبەس لە پەندەپێشینانەکەمان چیــە و لەبەرچی کوتراوە :
( هەرچی ریشی سوور بوو هەمزاغایە ) . جارێ ئێمە زانیمان کە
« ەوە » نەبۆتە و نابێتـەپاشگر بە مەبەسی هێواشی و تەدریجی .
کەوابوو ئەو سێ چاوگەیە کە جێی گومان و وتووێژن بوون ناچنە
ژێر ئەو مەبەســەوە یا ئەو باوەڕەوە دوای ئەوەش هیچ کامیان
دووپات کردنەوەی کار ناگەیەنن ، « خواردنەوە » دووبارەی « خواردن »
نیـە ، « چوونەوە » دووبارەی « چوون » وە « بردنەوە » دووبارەی
« بردن » نیە . مەفرووز وایە دووپات کردنەوە لەچەشن و سروشتی کارە
بنجیەکە ـ کاری یەکەمجار ـ بێ ، لەکاتێکا « خواردنەوە » کاری
بنجی و یەکەمی هـەر نیە ، واتا هەر خۆی بنجیە و پەیوەندی بە
« خواردن »ەوە نیــە . وە « چوونەوە »ش خۆی کاری بنجیــە ؛

کابرایەك لە بازاڕ بوو ، ئیشی تەواو بوو و بەرەوماڵی خۆی ڕێگەی گرت ، دەڵێین « چۆوە » یا « ڕۆیشتەوە » ماڵێ ، واتا گەڕایەوە بۆماڵێ . کەوابوو « چوونەوە » یا « ڕۆیشتنەوە » بە واتای گەڕانەوە بەکارمان هێنا ، گەڕانەوەش هەرگیز مەبەسی دوپات کردنەوەی (چوون ، هاتن )ی تیا نیە . هەرواش « بردنەوە » مەبەسی دوپات کردنەوەی « بردن »ی تیا نیە ، چونکە تۆ شتێك لەبازاڕ دەکڕیت و « دەیبەیتەوە » ماڵێ ، ئەم کارە خۆی بۆ یەکەم جارە و بنجیە و هەرگیز بە دوبارە ناژمێررێ . دوپاتکردنەوە بە نیسبەت ئەوکارانەوە کە ئادەمزاد دەیانکا ، بە زۆری لە هەمان شوێنـدا دەبێ کە کاری یەکەمجاری تیا دەکا . وەك دەڵێین « نوستەوە » ، کە ئەمە هەر لەو شوێنەدا دەبێ کە یەکەم جار تیا نوستبوو . هەرواش « دانیشتەوە » ، « هەڵسایەوە » . ت . د .

ئێستا با لەو وتە سادە بە « ەوە » دواهاتوانە بکوڵینەوە کە باسم کردن و وتم لەوانەدا پاشگر نیە ئەو کۆمەڵە پیتە . بە وێنە لەم کارانەدا (پاڕایەوە ، توایەوە ، شاردیەوە ، گواستیەوە) دەبێ لەسەر چ بناغە و دەستوورێك « ەوە » پاشگر بێ ؟! بەپێی پێناسەکەی د. نەسرین کەدەڵێ دەکەوێتە کۆتایی بناغەی وشـە و دەلکێت پێیـەوە ، ئایا دەبێ بناغەی ئەو کارانە چی بێ ، ئایا ئەمانەیە : پاڕا ، توا ، شارد ، گواست ؟ یا ئەمانەیە : پاڕان ، توان ، شاردن ، گواستن ؟ من هیچ لەو باوەڕەدا نیم ئەمانە بناغە

بن ، بەڵـكو چاوگی سادە یا كاری سادە ، هەمو پیتەكانی بناغەیە : پاڕانەوە ـ پاڕایەوە . وە ئەبینین د. نەسرین ئەوەی نەگوتوە كە ئایا ئەم كۆمەڵە پیتە « ەوە » دەبێتە كەرتێـكی تایبەتی یا كەرتی لێـكدەری یان نا . بەڵام مامۆستای خاڵ بە بەشی لێـكدەری ژماردوە و گوتوشیە كەوا لەگەڵ « بەشی كاری » دەبێتە یەك وشـــە . وە لە ڕوداودا هیچیان ـ لەو دوو نوسەرە ـ پاشگری « ەوە » یان بە چاكی ڕوونـ نەكردۆتەوە لە بارێـكدا كە واتای وتە دەگۆڕێ ، بەڵـكو مامۆستای خاڵ ئەم ئەركەی بۆ ئەم پاشگرە هـەر دانەناوە ، وەكو باسم كرد . وە پێناسەكەشی بەم جۆرە دەرخستوە : پاشگر هەمیشـــە واوێـكە لەناوەندی دوو بزوێنا ، وە لەم جۆرە زیاتری نیە .

من لەو باوەڕەدام كە ئەم كۆمەڵە پیتـە « ەوە » لەو بارەدا كە چەسپاو بێ و جیاكردنەوەی لە وتەكە ببێتە هۆی گۆڕانی تەواوی واتاكەی ـ واتایەكی جیـاوەز پەیابێ ـ دیسان پاشگر نیە ، چونـكی پەیوەندیەك نیە لە نێوان جەوهەر و مانای دو وتەكەدا ، وە تەنهـا لە ڕواڵەتدا لێـكچونیان هـەیە و ڕواڵەتیش پێوانەی هیچ‌شتێـكی لەسەر ناكرێ . دوو شتی زۆر جیاوەز لەیەكتر ، ناوەكانیان لێك‌دەچن : كۆڵەكە ـ كتولەكە ، قۆچ ـ قوچ ، كوونـ ـ كون ، كۆڵان ـ كولان . ت . د . وە لەلایەكی تریشەوە ئێمە وتەی وامان هەیە وەك ( بۆوە ) كە ئەمە هـەر كارێـكی یاریكارە و نابێتە شتێـكی تر ، واتا هـــەر دەبێ لەگەڵ وتەیەكی تردا كاری لێك‌دراو پێك بێنێ ، وەك

( بەربۆوە ، رۆژبۆوە ، گلۆربۆوە ) . لە کاتێکا کە ( بۆ ) کارێکی ناتەواوە ـ ناو و ئەنجامی پێدەوڵی ـ وە دەشبێتە یاریکار : ( بەربۆ ، دەربۆ ، هەڵبۆ ، شێتبۆ ) . جا ئایا دەبێ چ پەیوەندێك لەنێوان ( بۆوە ) و ( بۆ )دا هەبێ ، هەر ئەوە نەبێ کە لەشکڵدا لە یەك دەچن و هەردوکیان یاریکارن ؟ ئایا یەکەم گەڕانەوەی دوەمە ، وەیا دوبارەیەتی ، وەیا گۆڕینی واتایەتی ؟ لە راستیدا هیچیان نیە ، بەڵکو هەر یاریکارێکە و بەو جۆرە دامەزراوە و ئەرکی یاریکاری پێسپێرراوە . نەك سێ پیتەکەی دواوە ئەو خاسیەت و ئەرکەیان پێ بەخشیوە لەبەر ئەوە ( بەربۆوە = کەوت ) چ پەیوەندی بە ( بەربۆ )وە نیە ، چونکی مانایان لێك دورە . جا لە بابەتی ( بۆوە ) کاری ( کردیەوە ) شمان هەیە ، بە وێنە ، کە ئەمە کارێکی تەواوە و دەشبێتە یاریکار . بەڵام زۆر لە ( کردی )یەوە دورە . دەڵێین « دەرگاکەی کردەوە » . ئەم کارە دوبارەی ( کردن ) نیە و گۆڕانی ماناکەشی نیە . بەڵکو هەر بەو جۆرە و بۆ ئەو مەبەسە دانراوە لە نێوکەوە ئ سەرەتاوە ـ نەك « ەوە » لە ( کردن )ەوە گۆڕیویەتی و وای لێکردوە . ئەمە جیایە لەگەڵ ( هێنایەوە ) چونکی ئەمیان مانای نزیکە لە ( هێنای ) لەبەر ئەوە سێ پیتی دواوە لەمەدا پاشکرە و بە مەبەسی مانا گۆڕین وەیا دوبارە دانراوە . لەباری یاریکاریشدا ئەم کارەلێکدراوانە پێك دێنێ : ( پاکی کردوە ) ، مانای ئەمەش دورە لە ( پاکی کرد ) ، ( رونی کردەوە ) ، جیایە لە ( رونی کرد ـ پێچەوانەی

خەستیکرد ) ، پێچیکردەوە ، رۆژی کردەوە ، ئاگری کردەوە ، جیای کردەوە ت . د .

بەڵام ( بۆ ) دەبێتە یاریکار : ( بۆوە ) بە مەبەسی دوپات بۆنەوەی کار . وە لەم بارەدا « ەوە » پاشگرە چونکی ئەرك و مەبەسی دیارە . وەك : هەڵبۆوە ، تاریك بۆوە ، پڕ بۆوە ، سەوز بۆوە . ت . د . جا لەو کارانەدا کە ( بۆوە ) پاشگری نیە ـ واتا « ەوە » بنجیەو ئەرکی پاشگری نابینێ ـ بۆ مەبەسی دوبارە بۆنەوە دەبێ وتەی « دیسان » یا « جاریکیتر » بە کاربێنین لەگەڵیان .

وە بۆی هەیە کەسێك بپرسێ ئایا چۆن « ەوە » ی پاشگر جیادەکەینەوە لەوانەی کە پاشگرنین . لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێم : هەر کەسێك خاسیەتی « ەوە » بزانێ لە مانا گۆڕین و دوپات کردنەوەی کاردا ، بە ئاسانی دەتوانێ ئەوەی پاشگرە و ئەوەی بنجیە جیایان بکاتەوە لە یەکتری . بە وێنە کە دەڵێین ( دیتنەوە ، دۆزینەوە ) ، کەس نیە بیری بۆ ئەوە بچێ کە ئەمانە لە ( دیتن ، دۆزین )ەوە هاتۆن ، یا بیری بۆ ئەوە بچێ کە مەبەس گۆڕینی واتا یا دوپاتکردنەوەی کارە . وە شتێکی لەم با بەتە یا لێکچۆی ئەمە لەزمانی عەرەبیدا ئەوەیە بە وێنە ، دوا پیت لەم وتانەدا هەمۆ خوێندەوارێك دەزانێ کە ( ي ) یە : مدني ، قروي ، نوري ، وردي ، شتائي ، ينوي ، يمشي ... وە دەشزانێ لەم وتانەدا ( ي ) نیە و خویندنەوەشی جیایە لە ( ي ) ، گەرچی لەشکڵیشدا هەر ( ی ) یە : نوێ ، درێ ، حلوی ،

استعصی ، قری ، نفی ، مستشفی . ت . د . وه له ئنگلیزیشــدا دیسان لەو بابەتە زۆر هەیە ، بە وێنە ، واژەی ( ING ) که هەمیشه دەکەوێتە دواوە ، له هەندێ وتەدا بنجیه ، وەك : SWING, BRING ، DURING , SPRING , STOCKING , MORNING , بــەڵام له وتەی تردا بنجی نیه ، وەك : SLEEPING , FISHING , DOING , MEANING , ت . د . وه ئێمه دەڵێین : ( رۆناك بۆوه ) و ( تاریك بۆ ) کەوابۆ مەبەس له ( تاریــك بۆوه ) دوپاتی کاره ، هەر وەهــاش ( تاریکی کردەوه ) دوپــاتی کاره ، واتا لەمانەدا « ەوه » پــاشگره ، کەچی له ( رۆناك بۆوه ) و ( روناکی کردەوه )دا بنجیه و پاشگر نیــه .
وه لەروداودا مەسەلەی ئەم ســێ پیته وردیەکی زۆری پێ‌دەوێ ، چونکی لەکاتێکدا دەبینــین بە وێنــه ، « چاك بۆنەوه » جیایه لەگـەڵ « چاك بۆن » ، کەچی دەبینین مانای « چاك کردنەوه » نزیکه له مانای « چاك کردن » . وه لەکاتێــکا که « جولاّنەوه » نزیکه له « جولاّن » کەچی له « کولانەوه ، کۆبۆنەوه » دا ســێ پیتەکه بنجیی و چەســپاون و هەرگیز بە پاشگر ناژمێررێن .

جا ئێمه له بارێــکا هەمۆ « ەوه » یەك به پاشــگر و به کەرتی لێکدەری بدەینه قەڵەم ، بێ‌گومان دەرگایەك بۆ چونەناو کێشەیەکی ناخۆش و نادروست دەکەینەوه ، چونکی باوەڕێــکی وا هەرگیز لەگەڵ روداوی ئەم سێ پیتەدا ناگونجێ ، لەلایەکەوه ، لەلایەکی تریشەوه وتەی « ەوه » دار ، ئەوەنده زۆره له زمانەکەماندا ، کەپێم‌وایـــه

مەنتیق رێی نادا ئەو هەمــوو وتــانە بە پاشگردار و بە لێکدراو بژمێررێن .. ئێستا با سەرنجێکی ئەو وتانەی خوارەوە بدەین ، کە ئەوانەی « ەوە » یان پێوەیە جیــاوەزن بە تەواوی لە مانادا لەگەڵ ئەوانەی کـە پێیانەوە نیە ، واتا ئیمکانی لابردنی «ەوە» لەو وتــانە نیە و ئەگەر لێیان لابرا ماناکانیان بە تەواوی دەگۆڕێ . لەبــەر ئەوە لەو وتانە و لێکچووی ئەوانەدا « ەوە » پاشگر نیە :

کردن — کردنەوە   بەربوون — بەربوونەوە

خواردن — خواردنەوە   کوێربوون — کوێربوونەوە

خوێندن — خوێندنەوە   بەردان — بەردانەوە

دۆزین — دۆزینەوە   هەڵدان — هەڵدانەوە

دیتن — دیتنەوە   دادان — دادانەوە

پەڕین — پەڕینەوە   پیاچوون — پیاچوونەوە

سووتان — سووتانەوە   لێکدان — لێکدانەوە

گێڕان — گێڕانەوە   پاککردن — پاککردنەوە

چنین — چنینەوە   دەنگدان — دەنگدانەوە

لاواندن — لاواندنەوە   دەستگرتن — دەستگرتنەوە

برژاندن — برژاندنەوە   هەڵگەڕان — هەڵگەڕانەوە

بوون — بوونەوە   راستیکرد — راستیکردەوە

بەڵام لەم وتانەی ژێرەوەدا « ەوە » پاشگرە، چونکە مانای وتە بنجیەکەی گۆڕیوە بە کەمێ [جزئیاً]، واتا ئەرکێکی رەچاو کراوی ئاشکرای هەیە و دەشکونجێ لاببرێ بە بێ ئەوەی مانای وتەکە تێك بچێ یان بگۆڕێ بە تەواوێ. وە لە هەندێکیانا دەشبێ پاشگرەکە بۆ مەبەسی دوبارەش بێ، وەك « درۆنەوە. هەڵوەشاندنەوە » :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| وەستانەوە | — | وەستان | بیرچونەوە | — | بیرچون |
| سوڕانەوە | — | سوڕان | بیرکردنەوە | — | بیرکردن |
| جولانەوە | — | جولان | چاكبونەوە | — | چاكبون |
| بەستنەوە | — | بەستن | رەقبونەوە | — | رەقبون |
| پێچانەوە | — | پێچان | چاككردنەوە | — | چاككردن |
| بڕینەوە | — | بڕین | لێپرسینەوە | — | لێپرسین |
| درۆنەوە | — | درۆن | هەڵوەشاندنەوە | — | هەڵوەشاندن |
| چونەوە | — | چون | وەرسوڕانەوە | — | وەرسوڕان |
| هاتنەوە | — | هاتن | خوارکردنەوە | — | خوارکردن |
| بردنەوە | — | بردن | گەرمکردنەوە | — | گەرمکردن |
| هێنانەوە | — | هێنان | گەرمبونەوە | — | گەرمبون |
| شکاندنەوە | — | شکاندن | ساردبونەوە | — | سارد بون |

چەند تێبینیەك :

لێرەدا بە پێویستم زانی چەند تێبینیەکی خۆم دەرخەم لە بارەی ماناگۆڕانەوە، ئێمە لە رودراودا بۆ ئەوە چوین کە شتێك واتای

شتێك دەگۆڕێ بە زۆرێ یا بە کەمێ . بەڵام ئەوەی راستی بێ ،
هەرشتێك گەر خۆی قابلیەتی مانا گۆڕانی تیا نەبێ ، هەرگیز بە هۆی
شتێکی ترەوە مانای ناگۆڕێ . بە وێنە دەبینین (گیرسان) بەم چەشنە
هیچ مانایەکی نیە ، کەچی « هەڵ ، دا ، ەوە » هەر یەکەیان جۆرە
مانا و مەبەستێکی بۆ دروست دەکا : هەڵگیرسان ، داگیرسان ،
هەڵگیرسانەوە . . بەڵام واژەی (چڵەکین) کە ئەمەش بەم چەشنە چ
مانایەکی نیە ، دەبینین هەر « دا » وەر ئەگرێت : (داچڵەکین) .
وەهەروا کارە ماناداره‌کانیش . بە وێنە (دان) ، ئەمە گەلێك
پێشگر و وتەی تر و پاشگری « ەوە » وەرئەگرێت ، وەك : « هەڵ ،
دا ، را ، لێ ، تێ ، لێك ، تێك ، پێوە ، بەر ، لا ، دەر ، سەر ،
رێ ، ەوە ، با ، خول ، سوڕ ، هەناسە ، تێك‌وەر ، تێك‌بەر » . کەچی
« خستن » شەشەکەی دواوە ناگرێتە خۆی ، بەڵام وتەی تر وەردەگرێ
وەك : پەك ، ژێر ، پێش ، دوا . . « نان » کە کارێکی یاریکارە
بە زۆرێ ، هەر حەوت لەوانە دەگرێتە خۆی و وتەی « راو » یش . .
وتەی « ژان » ، دڵ ، رۆژوَ ، دەستنوێژ » لەگەڵ « شکا ، شکاندی »
دا کاری لێکدراو پێك یەنن ، کەچی لەگەڵ « دان ، خستن ،
نان » دا رێ‌ناکەون . وتەی « مردن » پێشگری « دا » و پاشگری
« ەوە » پێکەوە وەردەگرێ نەك یەکێکیان بە بێ ئەویتریان :
(دامردنەوە) ـ « ەوە » لێرەدا بنجیە و ئەرکی پاشگری نیە ـ کەچی
« رۆیشتن » هەر پاشگری « ەوە » وەردەگرێ . . کەوابێ دەبێ بزانین

کە سروشت و خاسیەتی هەمو چاوگێك ـ کارێك ـ لە پێشگر قبوڵ کردن یا لە وتەی تر قبول کردندا نوخێکی مەزنی هەیە. لەبەر ئەوە دەبێ پێناسی پێشگر یا پاشگر ئەم نوختەیەش بگرێتەوە. واتا ئەگەر گوتمان پێشگر مانا دروست دەکا ، یا پاشگر ئەمە دەکا ، بە بێ سنور پێدان [ تحدید ] ، وەیا گوتمان پێشگر یا پاشگر مانا دەگۆڕێ ـ دیسان بە بێ سنور دانان ـ قسەکەمان راست دەرناچێ و پێناسەکەش لە شکلێکی تەواودا نابێ . جا ، من کە سنورێکم بۆ پاشگری « ەوە » دانا ، مەبەسم ئەوە بێ ، کە وتم ( . . بۆ مەبەسی گۆڕینێکی کەم لەمانادا ) ، واتا لە گۆڕانی تەواوی مانادا « ەوە » پاشگر نیە ؛ چونکە ئەو گۆڕانە تەواوەی ـ زۆرەی ـ مانا ، لەراستیدا هەر بە هۆی خاسیەت و قابلیەتی کارەکە خۆیەوە دەبێ . دەنا با « ەوە » بتوانێ مانای ئەم چاوگانە بە تەواوی بگۆڕێ ، وەکو هی ( کردن ) گۆڕاوە و بۆتە ( کردنەوە ) : گرتن ، بردن ، فرۆشتن ، کڕین ، رۆیشتن . ت د .

وە من لەسەر هەمان بیر و باوەڕ دەمەوێ بڵێم پێشگرەکانیش لەولێکدراوانەدا کە بنجەکەیان مانای نیە ، نابێ بە پێشگر بژمێررێن ، بەڵکو لێکچوی پێشگرن لە شکڵدا ؛ چونکە کە دەڵێین ( هەڵقولا ) ، لێرەدا « هەڵ » جیایە لەگەڵ « هەڵ » لە ( هەڵبێ ، هەڵچێ ) دا بە وێنە : « دا » لە ( داچڵەکی ) دا جیاوەزە لە « دا » ی ( دابەزی ) ، وە « را » ی ( رای پسکاند ) جیاوەزە لە

« را » ی ( رای کێشا ) . ت . د . جیاوەزیەکەش بێ گومان لەوەدایە کە لەلێکدراوە یەکەمەکاندا پێشگرەکان لەگەڵ واژەی بێ مانادا هاتون و لەدوەمەکاندا لەگەڵ وتەی مانادار جا یان دەبێ بڵێین پێشگر مانا دروست دەکا لەگەڵ واژەدا ـ یا لەگەڵ واژەیەکی تردا ، چونکی خۆشی واژەیە ـ وەك من ئەم مەبەسەم خستۆتە پێناسەکەوە ، وە ئەم نوختـەیەش بێ گومان هەمو پێشگرەکان ناگرێتەوە ، وەیا دەبێ بڵێین پێشگر لەو جۆرە چاوگ و کارە لێکدراوانەدا نیـە ، بەڵکو لێکچوی پێشگر هەیە لەشکڵدا ، کە کەرتێکی لێکدەریە و لەگەڵ کەرتەکەی تردا مانا پێك دێنن .

## ئەرکەکەی تری پاشگری « ەوە » لە کارەکاندا :

ئەرکی دوەمی ئەم پاشـگرە پێشاندانی دوپـات بونەوە یا دوپاتکردنەوەی کارە . وە لەم بارەدا بێ گومان بنجی نیە لەدامەزرانی چاوگ یا کاردا . وە دەشبێ لاببرێ و وتەکە بچێتەوە دۆخی پێشوی کە مانای دوبارەی تیا نیە سەرنجی نمونەکانی خوارەوە بدە :

ژیایەوە — ژیا هەڵبۆوە — هەڵبو

کەوتەوە — کەوت هەڵچۆوە — هەڵچو

نوستەوە — نوست دەرکەوتەوە — دەرکەوت

فرۆشتیەوە — فرۆشتی دایخستەوە — دایخست

ژماردیەوە — ژماردی دایمەزراندەوە — دایمەزراند

بەڵان ئەو وتانەی کە لەبنجدا « ەوە » یان پێوەیە ، بۆ مەبەسی دوبارەی کار دەبێ یەکێك لەم وتانە لەگەڵیان بەکار بێنین :
« دیسان ، دیسانەوە ، هەمیسان ، دوبارە ، جارێکیتر » ، وەك دەڵێین :

| | |
|---|---|
| دیسان بورایەوە | دوبارە راستیکردەوە |
| دیسانەوە کوژایەوە | دیسان ئاوڕی دایەوە |
| هەمیسان چەمایەوە | هەمیسان پاکی کردەوە |
| دیسانەوە خوێندیەوە | جارێکیتر هەڵی وەشاندەوە |

وە دەبێ بشزانین کە هەندێ کاری لەم چەشنە خۆیان مانایەکی دوبارەیان تیایە کەچی بۆ یەکەم جاریش هەر بەکار دێن . وەك کابرایەك دەست دەکا بە ئیشێك و لە پاشدا دەڵێ : هەڵمەوەشاندەوە ، واتا بەتاڵمکردەوە یا تێکمدا . وە یەکێکی تر کەپرێك چاك دەکاتەوە و لە پاشدا تێکیدەداتەوە ـ بۆ دوەم جار ـ هەردەڵێ : هەڵمەوەشاندەوە . جا لەم جۆرە چەند کارێکمان هەیە کە دەشێ پاشگرەکەی بە بنجیش و بۆ دوبارەش لەقەڵەم بدرێ وەك : هاتەوە ، چۆوە ، رۆیشتەوە ، بردیەوە ..

## پاشگری « ەوە » لە وتەکانیتردا :

ئەم پاشگرە جگە لەکارەکان شوێنی هەمەجۆر وتەی تریش دەکەوێ وە زۆر گرنگە بەکارهێنانی لەم وتانەشدا بە چاکی بزانین .

ئەرکەکانی ئەم پاشگرە لەوتەکانی تردا بەم جۆرەیە :

١ ـ واتا گۆڕینی کەم لەچەند وتەیەکدا :ـ

سەر — سەرەوە        پێش — پێشەوە
ژێر — ژێرەوە        بەر — بەرەوە
بن — بنەوە        دوا — دواوە
خوار — خوارەوە        پشت — پشتەوە
ژوور — ژوورەوە
ناو — ناوەوە

٢ ـ لەگەڵ پیتی « لە » ، بۆ مەبەسی دەرخستنی شوێن یا کاتی دەست پێکردنی کارێك :

لە رەواندزەوە        لێرەوە
لە پردەکەوە        لەوێوە
لەم گوندەوە        لە ئێستاوە
لەو جۆگایەوە        لەمژۆوە
لە منەوە        لە دوێنێوە
لەو انەوە        لەلای راستەوە

٣ ـ ئەو وتانەی بڕگەی (١) ئەگەر پیتی « لە » یان پێش کەوت ، دەبنە هۆکەری شوێن [ ظرف المکان ] ، وە بۆ مەبەسی شـــوێنی دەست پێکردنیش بەکار دێن :

لە سەرەوە ، لە ژێرەوە ، لە پێشەوە . ت د .

٤ ـ لەگەڵ پیتی « بە » دا ، بۆ دەرخستنی بوونی شتێك لە شوێنێکی رەچاوکراودا بەکاردێ :

| | |
|---|---|
| بە ئاسمانەوە | بە درەختەکەوە |
| بە شاخەکەوە | بە دەستیەوە |
| بە دیوارەکەوە | بە قاپەکەوە |
| بە سەریەوە | بە ساقۆکەیەوە |

## ( ب ) : پاشگری « اند » :ـ

ئەم سێ پیتەش یا بنجی دەبن لەدامەزرانی هەندێ کار و چاوگدا ، وەیا دوای کارە تێنەپەڕەکان دەکەون بە مەبەسی گۆڕینیان بە تێپەڕ . وە لەم بارەدا پاشگرە چونکی ئەرکێکی رەچاوکراوی هەیە .

« ا » : بنجیە لە دامەزراندا و لابردنی ئیمکان نیە :

| | | | |
|---|---|---|---|
| نەڕاندی | بۆڕاندی | گرماندی | فڕاندی |
| قیژاندی | ناڵاندی | گڕاندی | ستاندی |
| — | خایاندی | — | وەشاندی |

« ب » : پاشگرە بە مەبەسی « تێپەڕکردن » ی تێنەپەڕ . لەو کارانەدا کە بە « ا » دواهاتوون ، لەبەر ئەوەی دوو ئەلف تێك دەگیرێنەوە ، هەر یەکێکیان بەکار دێ :

سوا — سواندی    سوّڕا — سوّڕاندی    پچڕا — پچڕاندی
دڕا — دڕاندی    بڕژا — بڕژاندی    کوڵا — کوڵاندی
ڕوا — ڕواندی    سوّتا — سوّتاندی    شێوا — شێواندی
هەڵڕژا — هەڵی‌ڕژاند ، هەڵوەشا — هەڵی‌وەشاند
داڕزا — دای‌ڕزانـد ، ڕاکشـا — ڕای‌کشاند

« ج » : بەڵان کارەکانی تر کە ئەلفیان نەبـێ لە دواوە ، دوّ پیتی پێشەوە نەبێ ئەوانیتر لا دەبرێن ئنجا پاشگری « اند » دادەنرێ :

مرد — مراندی    نەوی — نەواندی
خزی — خزاندی    خەوت — خەواندی
نوّست — نواندی    ڕوّیشت — ڕواندی
هەڵپەڕی — هەڵی‌پەڕاند
دابەزی — دای‌بەزاند
دەرپەڕی — دەری‌پەڕاند

« د » : هەر کردەیەك « ەوە » ی پێـوە بێ ، بە پێـی پیتەکـەی پێش ئەو سێ پیتە ، دەستوّری « ب » یان « ج » بەکار دێ و « ەوە » دەخرێتە دواوە :

بڕایەوە — بڕاندیەوە    هەڵسایەوە — هەڵی‌ساندەوە
نوشتایەوە — نوشتاندیەوە    ڕاکشایەوە — ڕای‌کشاندەوە
وەستایەوە — وەستاندیەوە    هەڵوەشایەوە— هەڵی‌وەشاندەوە

نوستەوە — نواندیەوە     دامردەوە — دایمراندەوە
سڵەمیەوە — سڵەماندیەوە .

لەو کارانەی سەرەوەدا ، وە لێکچوی ئەوانە ، « اند » نابێتە پاشگر ؛ چونکی « ەوە » پاشگرە ، بەڵکو هەر بەشدارە لە دامەزرانی ئەو کارانەدا و ئەرکەکەی خۆشی بەجێ دێنێ ، هەر وەك زانیمان کە لە هەندێ لێکدراودا پێشگر دەکەوێتە ناوەوە و ئەرکەکەی خۆشی بەجێ دێنێ .

هەندێ کاری تێنەپەڕ « اند » وەرناگرن ؛ چونکی تێپەڕیان هەیە بە بێ ئەم پاشگرە . وەك ئەوانەی ژێرەوە :

کەوت — خستی     راهات — رای‌هێنا
مایەوە — هێشتیەوە     دەرکەوت — دەری‌خست
بەربۆ — بەری‌دا     ساردبۆوە — ساردی‌کردەوە
کوم‌بو — کومی‌کرد     بەسەرچو — بەسەری‌برد
پەکی‌کەوت — پەکی‌خست     بیری‌کەوتەوە — بیری‌خستەوە

وە چەند کارێکیش هەیە بە هەردوَ جۆرەکە کراون بەتێپەڕ .
وەك :

دەرچو — دەری‌هێنا ، دەری چواند
گەڕایەوە — گێڕایەوە ، گەڕاندیەوە

وە هەندێ کاریش لەلێکدراوەکان تەنها بە بەکارهێنانی پیتی

( پـێ ) دەکرێنە تێپەڕ . وەك :

بازیدا — بازیپێکرد مەشقیکرد — مەشقیپێکرد
رایکرد — رایپێکرد ئیشیکرد — ئیشیپێکرد

## پاشگر کەرتی لێکدەری نیە :

سێ پیتی « ەوە » یا « اند » ئەگەر بنجی بوون لەچاوك یا لە کاردا ، وەیا پاشگر بوون ، نابنە کەرتی لێکدەری .

ئەگەر بنجی بوون ، لەبنەڕەتی دامەزرانی وتەکەدا بەشدارن ؛ وە لە باری لابردنیاندا [ حذف ] ، دامەزرانی وتەکە تێك دەچـێ و مانای نامێنێ — ئەگەر لە ناوەنـدا بێ بە مەبەسی تێپەڕکردن ، وە لامـــان برد ، کارەکە یا چاوگەکـەنە دەبێتەوە بە تێنەپەڕ — وە بە باوەڕی من چ رێیەکی تێ ناچێ ئەمانە کەرتی لێکدەری بن و ئەو هەموو وتە سادانەمان بکەن بە لێکدراو — مەگەر وتەکە لێکدراو بێ بە هۆی پێشگرێك یا وتەیەکی ترەوە — .

وە ئەگەر پاشگریش بوون ، هەر نـابنە کەرتی لێکدەری ، ئەگەرچی بە لابردنیشیان دامەزرانی وتەکە تێك ناچێ بە جۆرێـك کە واتای نەمێنێ . ئەمانە لە هەر شوێنێکدا هاتن دەبنە کەیەنەری مەبەس بە پێی ئەرکەکەیان ـ ئەگەر بنجی نەبـوون ـ وە دەچنـە دامەزرانی ئەو وتەیەوە کە پێوەی دەبن .

سروشتی « ەوە » فەرزی کردوە لەسەری کە هەمیشە لە دواوەبێ و لکانی هیچ شتێك قبوڵ نەکا . جا بە هەڵای ئەم سروشتەیەوە ـ نەك لەبەر ئەوەی کەرتی لێکدەری بێ ـ فەرزبوە لەسەری کە جێگە بۆ راناوەکان لە کاردا بکاتەوە و بکەوێتە دوایانەوە . لە کاتێکا کە سروشتی « اند » رێی بە لکانی ئەو راناوانە دەدات . لەبەر ئەوە دەبینین راناوەکان دەکەونە ناوەندی « اند » و « ەوە » ئەگەر کارەکە هەردوکیانی تیابێ . وەك : چەمایتەوە ، چەماندمەوە ، چەماندیانەوە . هەروەها راناوی پێکراو [ مفعول بە ] لەهەمان شوێندا دەبێ : وەك : نواندمنەوە ، پەڕاندیاٸەوە ، وەستاندیانینەوە . جا ئەم کارانە ، هەرچەند ژمارەی پیتەکانیشیان زۆر بوبێ ، هەر سادەن . پاشگر و ناوی کەسێ و راناوی پێکراو هەمیشە دەچنە دامەزرانی کارەکانەوە بێ ئەوەش هیچیان ببێتە کەرتی لێکدەری . بەڵام دیارە کە سەرچاوە چ راناوێکی تیا نابێ ، وە لەویشدا « اند » و « ەوە » پاشگر بن یا نەبن ، لە دامەزراندا بەشدارن . وە لە وتەکانی تریشدا کە پاشگری « ەوە » یان پێوە دەلکێ بۆ هەر مەبەسێك ـ وەك باسمکرد ـ ئەم پاشگرە یا پاشگری « دا » کە دیسان دوایان دەکەوێ بۆ هەندێ مەبەس ، نابنە کەرتی لێکدەری . بەڵکو ئەم پاشگرانە ـ ئەوانە نەبێ کە بنجین لە لە دامەزراندا ـ وەکو نیشانەی جیاوازی [ علامات فارقة ] وەهان بۆ دەرخستنی ئەو مەبەسانە کە بۆیان دانراون . وە هەروەها ئەو

ئەمرازە هەمە جۆرانەی کە دەچنە پشت وتەکانەوە و پیێـــانەوە دەلـکێن . ئەوانە و ئەمانە ئەگەرچی هیـچ کامیشـــیان لە بنج و بناغەی وتەکەدا نەهاتوە و بەشێـکی رەسەنیـــش نیە لە پێك‌هاتنی وتەکەدا ، بەلاّم ناشێ بلێین کـەرتی لێکدەریـە . کەرتی لێـکدەری ئەوەیە کە لە بناغەی وتەدا سەربەخۆ و هەمیشەیی [ دائمی ] بێ .

ئەو پیتە پاشگر و ئەمرازانە هەمیشەیی نین لە وتەکاندا . کە دەڵێین بە وێنە : ( زۆرەوەیە ) ، ( لەوزۆرەدایە ) . ئەم دوَ رستـەیە هەر یەکە سێ بەشە : ( ۱ ) لە ، لەو ( ۲ ) زۆرەوە ، زۆرەدا ( ۳ ) یە « ەوە » و « دا » کە لە بەشی دوەمدا هاتون هیچیان کەرتێك نیە لە وتەکەدا ، بەڵـکو هـــەر یەکەیان لـکاوە بە وتەکەوە بـۆ مەبەســـێك ، نەك بە شکـڵی کەرت و کردنی وتەکە بەلێـکدراو ؛ چونـکی ئەو مەبەسەش هەمیشەیی نیە لە وتەکەدا . ئەمرازی پێناس « کە » و هەمو ئەمرازەکانی‌تر بە وتەی هەمە جۆرەوە دەلـکێن ، بەلاّم نابنە پاشگر ، وەناشبنە کەرتی تایبەتی ، چونـکە هەمیشـەیی نـین بە وتەکانەوە بەلاّم « ەوە » و « اند » کە هەمیشەیی دەبن لە کارەکەدا ، واتا بنجی دەبن لە بناغەدا ، ئەوە گومانی تیا نیە کە کەرت دروست ناکەن ، چونکی چ ئەرکێـکیان نابێ جگە لە بەشداری لە بناغەدا .

وە من بەم بۆنەیەوە دەڵێم ئێمە ژمارەیەکی زۆر وتەی وامان هەیـە کە لە لێـکدراو دەچن بە رواڵەت ، بەلاّم لەو باوەڕەدام کە دەبێ بە سادە بژمێررێن ، بە تایبەتی چونـکی لـێکچوی دامەزرانی

ئەم جۆرە وتانە، لە زمانی ئنگلیزیشدا هەر بە سادە دراونەتە قەڵەم. وەك ئەم وتانە بە نمونە : بەروانکە، دەسرازە، ئاوزەنگی، شیرێژ، کامێش، ماشێنە، پێشکەش، مامۆستا، بناوان، بنچینە، هەڵەکۆك، پێقەلە، شەوکەرد، مارمێلکە، خۆڵەمێش، کوێرەوەری، بیرەوەری، گوێسوانە، کۆڵوانە، تۆپەوانە، پتوزەوانە، دوزەڵە، بناویلە، کرمەك .

وە ئەوەی راستیە، لە زمانی ئنگلیزیدا یەکجار زۆر وتە هەیە کە چەشنی لێکدراون، بەڵام هیچ وتەیەك بە لێکدراو نەژمێرراوە ئەوانە نەبێ کە کەرتەکانیان هەر یەکە وتەیەکی مانادارە . واتا مەرجی وتەی لێکدراو ئەوەیە کە لە دوو یا پتر بەشی مانادار پێکهاتبێ ئەگەرچی مانای لێکدراوەکەش زۆر یا کەم جیاوەز بێ لە مانای کەرتەکان وەیا نزیك لێیان

* * * * * *

# البريفكس والسوفيكس
## ( البادئة واللاحقة )

العميد احمد حسن

## المقدمة :

لقد ورد في المجلد الأول من مجلة المجمع العلمي الكردي - ١٩٧٣ - مقال للدكتورة نسرين فخري تحت العنوان المذكور ؛ ثم نشر تعقيب على المقال مع بعض التوضيحات في المجلد الثاني - ١٩٧٤ - للاستاذ الشيخ محمد الخال . ونظراً لأهمية الموضوع وعلاقته الكبيرة بقسم من المصادر والأفعال البسيطة والمركبة ، ولتأثيره على تعلم وتعليم هذه المواضيع في لغتنا - الكردية - رأيت من الضروري أن أشترك في معالجة موضوع البادئات واللاحقات واعقب على بعض ما ورد في المقالين المذكورين . لاشك في ان لغتنا كمعظم اللغات الآرية تحوى الكثير من الكلمات والمصطلحات المركبة . فمن وجهة البناء هناك نوعان من المصدر ، وتبعاً لذلك يوجد نوعان من الفعل . ان المصدر البسيط كلمة واحدة فقط ومن ضمنها حرف المصدر ( ن ) ، وفيما اذا وجدت فيه مجموعة الحروف « ەوە » أو لم توجد . نحو : ( نوستن ) النوم ،

( كردنەوە) الفتح ، (رۆيشتنەوە) الرجوع . كما ان الفعل البسيط بدوره كلمة واحــدة ، حتى لو دخل عليه حرف المضارعة أو حرف الأمر . ان الفعل المركب عبارة عن مسـاعد وبادئة أو أية كلمة ذات معنى تسبق المسـاعد وأي جزء آخر إن وجد والمساعد هو مصدر بسيط أو فعل بسيط في البناء المركب . مثلاً ، (دانيشتن) مصدر مركب يتألف من : (دا) البادئة ، (نيشتن) مصدر بسيط وفيــه حرف المصدر (ن) وهو المساعد ، ومعنى هذا المركب هو الجلوس . (دانيشت) مشتق من المصدر بحذف حرف النون ، أي جلَس . (نيشت) فعل ماض بسيط وهو المساعد . (دادەنيشێت) أي يجلس ، وهو مؤلف من : البادئة + حرف المضارعـة « دە » ويليه المضارع المنتهي بضمير الغائب المفرد . (دابنيشە) أي اجلس وفيه حرف الأمر « ب » . فيكون كل من المضارع البسيط (دەنيشێت) والأمر البسيط (بنيشە) مساعداً في الفعل المركب . وكذلك لو كان الفعل يحتوي على الثــلاثة حروف « ەوە » . (راوەســتايەوە ، رادەوەستێتەوە ، رابوەستەوە) ، هـذه الأفعال المركبة التي تعني : وقف ثانية ، يقف ثانية ، قف ثانية ، كل منها عبارة عن البادئة وفعل مساعد بسيط . تتشابه البادئة واللاحقة في عدم امكان استعمال أي منهما بمفردها ، وفي اشتراكهما في المصدر . وتختلفان في ان الاولى تسبق المساعد دائماً ، في حين ان الثانيــة تلتصق بنهايته ، وتشكل البادئة جزء تركيبياً أي لا وجود لها في الصيغ البسيطة ، في حين ان اللاحقة لا تشكل جزء تركيبياً وتشترك في الصيغ البسيطة . وقـد توجد البادئة واللاحقة في مركب واحــد ، مثل : (هەڵبژاردنەوە) إعادة الانتخــاب ، و

( دامەزراندن ) أي البناء ، التأسيس . ونلاحظ كثرة البادئات في اللغة الكردية ،لذلك ولكي نتمكن من تمييزها عن غيرها يتوجب ان يكون لها تعريف معين .

## ( القسم الأول ـ البادئات )

اذا كان الجزء الأول من أي مصدر أو فعل مركب ، لفظة أو حرف أو جار و مجرور ، وغيّر معنى المساعد كثيراً أو قليلا ، أو أحدث معه معنى معيناً ممّى بالبادئة . ونقصد باللفظة مجموعة حرفين أو اكثر لن تستعمل بمفردها لعدم وجود معنى مستقل لها . والالفاظ الاكثر شيوعاً بين البادئات هي : ( هەڵ ، دا ، را ) . ولنأخذ مثلا البادئة ( هەڵ ) وتلفظ بتضخيم اللام ، فهي تكون مع الفعل ( هات = أتى ) فعلا مركباً ومغيرة معنى الفعل كلياً ، أي عندما نقول ( هەڵهات ) فان هـذا الفعل المركب يعني أشرق . وتدخل على الفعل ( مژی ) أي مصّ لتكون معه الفعل المركب ( هەڵیمژی ) أي امتصّ ، ويظهر من هـذا انها غيرت المعنى قليلا . أما اذا دخلت على مساعد لا معنى له مثل ( واسی ) فتكون معه فعـلا مركباً وله معنى معين ( هەڵیواسی ) أي علق . وكذلك تكون وظيفة كل من البادئتين الاخريين ( دا ، را ) أما الألفاظ البادئة الاخرى فمعظمها يكون مع المساعد فعلا لازماً ومع الآخر فعلا متعدياً ، نحو : ( فێربو ) تعلم ، ( فێری کرد ) علم ، ( گلۆربۆوه ) تدحرج ، ( گلۆری کردەوه ) دحرج ، ( پەکی کەوت ) تعطل ، ( پەکی خست ) عطل . وهكذا . وبعضها يكون فعلا مركباً واحداً فحسب . والبادئات الحروف كذلك . أما النوع

الآخر من البادئة فعبارة عن جار ومجرور باستعمال حرفي الجر ( به ، له ) مع اسم ذي معنى غالباً وغير ذي معنى نادراً ، ويعقبها للساعد . نحو : ( بەســەرچۆ ) أي مضى وانقضى ، ( لەبەرىكرد ) أي ارتدى . ونلاحظ في هذه البادئة ان الجار والمجرور ليسا بجار ومجرور الا من حيث الشكل ذلك لأنهما يمتزجان في معنى المركب ويصبحان جزئي تركيب ليس إلا . هذا وان أية كلمة اولى ذات معنى مستقل ، في المصدر أو الفعل لن تعتبر بادئة ، انما تـكون جزءاً تركيبياً ويمتزج معناها في معنى المركب . فعندما نقول مثلا : ( سەرکەوت ) وهو فعل مركب من جزءين ، الأول اسم معنـاه الرأس أو الأعلى « فوق » ، والثاني فعل ماض بسيط بمعنى وقع أو سقط وهو للساعد ، نرى أن الفعل المركب المتـكون منهما يعني صعد أو نجح . وبالرغم من اننا لا نتحرى معنى كل جزء من الجزءين لنقارنهما مع معنى المركب ، لأن ذلك لا ينسجم مع واقع الـكلمات المركبة ومدلولاتهـا - سواءاً في اللغة الـكردية ، أو الانـكليزية مثلا - الا اننا ينبغي أن نلاحظ ما اذا كان للـكلمة الاولى معنى مستقل ، وفي هذه الحالة لا نعتبرها بادئة سواء احتفظت بمعناها الأصلي في المركب أو لم تحتفظ ؛ أما اذا لم يكن لها معنى مستقل فتعتبر لفظة وبادئة ..

## ( القســم الثاني - اللاحقات )

اللاحقة عبارة عن حرفين أو اكثر تلتحق بالمصدر والفعل لغرض تغيير معناها تغييراً قليلا . وهي لا تشكل جزء خاصاً ولا تجعل الكلمة مركبـة ، أي تـكون في ذلك على عكس البادئة . واهم اللاحقات هي

مجموعة حروف « ەوە » . ولكن هذه الحروف الملتصقة ببعض الأفعال والمصادر البسيطة أو المركبة ، ليست كلها لاحقات ، بل ان من الأفعال والمصادر ما تكون الحروف الثلاثة جزء من بنائها ولا يمكن فصلها منها بأي حال ، كهذه المصادر مثلا :

( توانەوە ) أي الذوبان ، ( کوژانەوە ) الانطفاء ، ( کۆبونەوە ) الاجتماع . وفي الحقيقة لا تدخل الحروف الثلاثة الموجودة في تلك المصادر وأفعالها ومشتقاتها وفي مماثلاتها ضمن أي تعريف منسجم مع مصطلح اللاحقة . فالاستاذ الشيخ محمد الخال ذكر في مقاله ان اللاحقة تفيد مقاصد ثلاثة :

( ١ ) العودة ( ٢ ) تكرار الفعل ( ٣ ) التدريج ، كما وحسب الحروف الثلاثة أينما وردت انها لاحقة واعتبرها جزء تركيبياً كما ان . الدكتورة نسرين بدورها اعتبرتها جميعاً لاحقات كما يفهم من مقالها ، الا انها لم تذكر وظيفة « التدريج » للاحقة ولم تتطرق الى كونها جزء تركيبياً أم غير ذلك .

والواقع ان هناك الكثير من الأفعال التي ليس لها أية علاقة بالمقاصد أو الوظائف التي ذكرها الاستاذان المرموما اليهما للاحقات . والخلاصة ان علينا ملاحظة للمصدر أو الفعل البسيط أو المركب المنتهي بـ « ەوە » ، فاذا ظهر لنا ان تلك الحروف ليس لها وظيفة معينة ، أي ان حذفها من الكلمة سيؤدي الى تغيير معناها تغييراً كلياً ، أو الى تقويض معناها ، فلنعلم عندئذ ان تلك الحروف هي أصلية في بناء الكلمة ، وليست لاحقة . اما اذا لاحظنا انها جاءت لأحد عرضين

وهما : تكرار الفعل ، وتغيير المعنى تغييراً جزئياً ، لنعلم انهـا لاحقة في كل من الحالتين ، أي اننا لو حذفناها لن يبقى معنى التكرار ، أو يتغير المعنى الى معنى قريب من المعنى الأول . وان هذه الحروف ليست بجزء تركيب مطلقاً .

أمثلة على الحالات المذكورة :

(ا) ليست الحروف الثلاثة بلاحقة :

شارديەوە = أخفى – هەڵگێڕایەوە = قلب

(ب) انها لاحقة تفيد التكرار :

نوستەوە = نام ثانية – دەرکەوتەوە = ظهر ثانية .

(ج) لاحقة تفيد تغيير المعنى جزئياً :

بەستن = ربط الشيء أو الشد .

بەستنەوە = ربط الحيوان بحبل الى شجرة أو وتد وماشابه .

رەقبوون = التصلب أو التجمد .

رەقبونەوە = تجمد الانسان او الحيوان من شدة البرد وموته .

كما ان هذه اللاحقة تعقب حرفي الجر ( بە ، لە ) ، على أن يقع المجرور بهما في الوسط ، وذلك بقصد الدلالة على المكان الذي يوجد فيه شخص أو شيء ما ، أو الدلالة على مكان بدء عمل ما .

وهناك ثلاثة حروف اخرى هي ( اند ) ، وبدورها تكون أصلية في بناء بعض الافعال اللازمة أو المتعدية ، مثل (قیژاندی) صرخ ، ( رفاندی ) خطف ، وتكون لاحقة أو أداة تعدية في البعض الاخر .

وهى أيضاً في الحالتين لاتعتبر جزء تركيبياً : ( ســـوڕا ) دار — ( سوڕاندی ) أدار ، ( کولاٚ ) فار — ( کولاٚندی ) فوّر ، ( هەڵپەڕین ) الرقص — ( هەڵپەڕاندن ) الترقيص . أما اذا وجدت « ەوە » مع الفعل اللازم ، فعند تغييرها الى متعدی باستعمال ( اند ) توضع هذه اللاحقة قبل الحروف « ەوە » ، مثل :

( بڕایەوە ) انتهى — ( بڕاندیەوە ) انهى

( وەستایەوە ) توقف — ( وەستاندیەوە ) اوقف

( هەڵسانەوە ) النهوض — ( هەڵساندنەوە ) الانهاض .

* * * * *

# هەندێك
# لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن *

ئەندامی یاریدەر : جەمال بابان

## بەشی دووەم

| زاراو | واتاكانی | پەیوەندی یا جیاوازییان بە رای من |
| --- | --- | --- |
| ئاخ | وشەی داخ و خەفەتە لەكاتی ئازار و خەمدا [1] . خۆڵەمێش . خاك . | ئەشێ لە مانیدا یەك بكەون . |

(*) لە بەشی یەكەمی بەرگی دوەمی ( گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد )دا . نزیكەی ( ٣٥٠ ) وشەیەكمان ، لەوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن ، بلاو كردەوە ، بە رونكردنەوەی پەیوەندی یاخود جیاوازی ناو خۆیانەوە . هەر لەو ژمارەیەشدا بە پێشەكیەكی كورت هۆیەكانی ئەو فرەواتاییەمان رونكردەوە و تكامان لە خوێندەوارانی بەڕێز كرد كە چەند لە توانایاندا بێت یارمەتیمان بفەرمون . وا ئەم جارە كاك حەمەبۆر ، چالاكانە هاتە=

(١) فەرهەنگی خاڵ ج ١ ل ٤١

| | | |
|---|---|---|
| ئاخلە | خەرمانەی دەوری مانك و ڕۆژ . دیوار بە دەورا . کلاختە . | دەوران دەورەکە یەکیان ئەخات . |
| ئاداب | کێم و جەراحەت . ئەدەب (عەرەبی) . | ڕێکەوت (جیاوازن) . |
| ئاسۆ | تارمایی . فەرەنتو . تاپۆ . ڕۆشنایی . سنور . ملە .[٢] | بەدی کردنی سێبەریان یەکیان ئەخات . |
| ئامان | هاتن ، پەناوهانا[٣] . قاپ . دەخالەت (عەرەبی) . | هەندێکیان پەنابردن یەکیان ئەخات . |
| ئاوکێش | خواردنی چەور و ترش و سوێر کە ئاو خواردنەوەی زۆری ئەوێ . سقاء (عەرەبی) | ئاوەکە یەکیان ئەخات . |

= پێشەوە و بە هەردوکمان ئەم بەشەی ترمان پێشکەش کرد کە زووربەیان لە فەرهەنگەوە دەرهاتون کە لە شوێنی خۆیاندا پەنجەیان بۆ ڕا کێشراوە .

ئومێد ئەکەین هەر بەمەوە نەوەستین و یارمەتی تریش بدرێین .

بەم بۆنەیەوە زۆر سوپاسی کاك (بەکر عەبدوللا گەردی) ئەکەین ، کە هەندێك تێبینی خۆی لە سەر بەشی یەکەم ڕوون کردبۆوە ، بۆ ئەم جارە بێتەوە بە شانازییەوە ئەویش بلاو ئەکەینەوە ، لەگەڵ شتی تردا کە بۆمان بێت .

(٢) ف . خ . ل ٤٩ .

(٣) وەك باسکە دزێزی ڕێگای قەرەداغ .

| | | |
|---|---|---|
| ئاهۆ | فێ . شێتێ . رشانەوە . | نەخۆشــێ یەکیان ئەخات کە ئاهو نالەی پێوەیە . |
| ئەخورێ | خواردن . خوراندن . | رێکەوت ( وشەی هاوکــۆ ) |
| ئەرێ | بەڵێ . ئایا . | کــفتوکــۆ یەکیان ئــەخات |
| ئەژێ | ئەهێنێ ( بەنرخ ) . ژیان . | نرخ یەکیان ئەخات . |
| بێ | وەرە . دوهەمین پیتی هیجایە و بە حسابی أبجد ئەکاتە (٢) . | رێــکەوت ( جیاوازن ) . |
| بابان | باوان . بنەماڵــە و حکومەت و ناوچەی بابان . | بە ( بابا ) بە واتای باوك یاخود گەورە یەکن . |
| باڕە | باڕەکەو و کەڵەشــێر ... باڕە باڕ (باعە باعی ئاژاڵ ، مەڕ .. بزن ) . | رەنــك هەیە بە تەمەن یاخود بە دەنــك یەکە بن . |
| باسك | قۆڵ . بایەســك . جۆرێــکە لە مەلە . قەد شاخ و پاڵ[٣] . | قۆڵ و شان یەکیان ئەخات. |
| باکێش | بــــۆری و کـــلاورۆژنــەی ماڵ و حەمام . ولاخی باکێش ئەوەیە کە زۆر بای لێ بـــەر ئەبێتەوە . کە لە شاخی عەجامات . | بواردنی با یەکیان ئەخات . |
| بانــك | بانك‌کردن . بانك‌دان ( أذان ) . جاڕدان . بانــك بە کوێدا دان . | دەنــك یەکیان ئەخات |

| | | |
|---|---|---|
| بڕ | هەندێك ، کەمێك . بڕی گاو . بڕی دار . بووار ( ئەمگاوە بڕنادا )[٤] | پارچە زۆریان یەك ئاخات . |
| بزەڵە | زیت و جوان . بێچوەبەراز (بڵاز)ە | زیکەڵەیێ یاخود تەمەن یەکیان ئەخات . |
| بزوت | جوڵایەوە . سەرە بزوتی داری ستوتاندن . | رێکەوت . |
| بن | ژێر . بنی ئافرەت واتا پەردەی کچێنێ . ( ابن : عەرەبی ) . | ژێر یاخود خوارەوە یەکیان ئەخات (لە زمانێکی ترەوە) . |
| بۆ | بۆن . ( الى ) ئەچم بۆ شار . بۆچی ؟ بۆکێ ؟ بۆکەی ؟ | رێکەوت ( وشەی هاوکۆ ) . |
| بۆتە | بۆتۆ . بودقە . | رێکەوت . |
| بۆر | رەنگی خۆڵەمێشی . واوی سەر پیت ( ضمه ) . هەڕەمە : زۆر بێ و بۆر بێ . | رێکەوت ( وشەی هاوکۆ ) . |
| بۆسە | بۆسەنانەوە ( کمین ) . ماچ ( بوسەی عەرەبی ) . | ( لە زمانێکی ترەوە ) . |
| بۆڵە | بۆڵە بۆڵ ( تذمر ) . بۆڵە ترێ . | رەنگە هەیە پارچە پارچەیێ نزیکیان بخاتەوە . |

(٤) ف . خاڵ ل ١١٢ .

| | | |
|---|---|---|
| بیبیلە | گلێنەی چاو . ساوا (تیتیلە و بیبیلەی دایە) . | وردیلەیی یەکیان ئەخات . |
| بەبلانە | لانەی منـدالْ . مندالی بچوك . بچوکترین بوکی مندالْ . | ساوایەتی مندالْ یەکی خستون . |
| بەران | پێشان . بەرانی بەڕ و مەڕە کێوی | بەرانیش پێش مێـگەلە . بەرایی یەکیان ئەخات . |
| بەرە | بەرەی ولاخ . جۆرە خشـلێکی کوردییە . دەسـتە . لـەوە . بەرەباب . | پێشەوە و بەرایی هەندێکیان یەك ئەخات . |
| بەرەللا | سـەربەست و ئـازاد . کراوە (بێستانەکە بەرەللا کرا) . | بەردان یەکیان ئەخات . |
| بەردان | شوێنی بەردەلان . بەربونەوەی شت . بەرەللا کردن . خسـتنە پشت گوێ . دەست لێ هەلگرتن (تەلاق دان) . بەری میوەدان . | وەك تل و جوڵە یەکی خستبن . |
| بەڕۆ | ڕۆتایم (بێ شەرم و قسە لەڕۆ) ، بەری دار بەڕۆ . | لەوە ئەکات رەقی یەکی خستبن . |
| بەزین | بۆڕخواردن . ولاخی زیندار . پەڕینی ولاخی بەرزە . دابەزین(٥) | زوربەیان پەیوەندییان بـە ولاخی بەرزەوە هەیە . |

(٥) سەیری بەرگی دوهەم ، بەشی یەکەمی سـالی ٩٧٤ لاپەڕە ٥٧٩ لەم گـۆڤارە بکە .

| | | |
|---|---|---|
| بەستە | جۆرێکە لە گۆرانی . (رزمە). بەس‌تە : کفایەتیە . | رێکەوت و ( لەزمانێکی ترەوە ) . |
| بەستران | بەستنی ئاو (بەستەڵەک) بەستن پێکەوە : گرێدان . | جوت‌بون و گرێدان یەکی خستون . |
| بەستراو | بەستنی پیاو بەرامبەر بە ژن ( نەکەوتنە کار و دروست نەبون) . | |
| بەقا | بژوا . ( بقاء : عەرەبی ) . | لە زمانێکی ترەوە . |
| بەم | بەئەم ئالەتێکی مۆسیقیە . وەتەرێکی عودو کەمانە . ( اصطلاح ) ێکی مۆسیقیە . | لە زمانێکی ترەوە . |
| بەند | رست ، (فصل)، بەش (لەکتێبت). چامە بەستنەوە و (حبس) کردن . بەندی بەیت و هەڵبەست . بەندی کاغەز . | جگە لە ( حەپس ) ەکە هەمۆ بەش یەکیان ئەخات . |
| بێزار | بێ‌زمان ( زمان لە دەمیا نیە ئەوەندە بێ‌دەنگە ) . دڵی هەڵکەنراوە . | ئەبێ مانی یەکیان بخات . |
| بێن | بۆن . بێنەوە : وەرنەوە | رێکەوت ( زۆری شێوە ) |

| | | |
|---|---|---|
| بێن | گەردن ، قوڕگ ، بیناقاقا . بێنا (چاو) . قوم ( بینی پێوەگرت) . | بێنای چاوەکە نەبێ ئەوانی تر قوڕگە یەکیان ئەخات . |
| پات | دوپات کردنەوە (تکرار) . هەوێر . پێی تۆ . | ( زۆری شێوە ) . |
| پارە | نەختینە ( نقد ) . جۆرێکە لە نەختینە وەك چلپارە و سەدپارە . لەتلەت (.. جەرگم بە خەنجەر پارەکە) . | پارچە یەکیان ئەخات . |
| پاس | بلیت ( بطاقە ) ی تێپەڕین پاس . ( حراسة ) . پاس (ئۆتۆمۆبێل B.U.S ) . | ( لە زمانێکی ترەوە ) . |
| پاون | پاوان ( مرعی ) . پێوەندێ ولاخ . پاوەنی أسترلینق : جنیە Pound . | زۆری شێوە و لە زمانێکی ترەوە . |
| پزۆ | نەخۆشیەکی ئاژاڵە پزۆی دەرپێ و ملیوانی گراسی کوردێ دەمی رەشەکەی کاکێشان . | وشەی هاوکۆ و زۆری شێوە . |

| | | |
|---|---|---|
| پس | ئەو کەسەیە بەسەری زمان قسە بکات . (جنین) . کوڕ (ابن) وەك : پسمام (ئامۆزا) . | زۆری شێوە . |
| پشم | رق و تووڕەیی . پۆمێنتی دوهەم جار . | ئەبێ هەڵچوون یەکیان بخات . |
| پۆپە | لوتکەی شــاخ و پۆپــەی درەخت تەپڵەسەری هەرشتێك . پۆپنــەی مریشك و کەڵەشێر و عەلەشیش . | ئەپڵە سەر یەکیان ئەخات . |
| پۆڕ | مــەلە و گۆشتی ئەخورێت . تەنکە ئەستوور ( پان و پۆڕ ). مو . خورێ . | رێکەوت ( وشەی هاوکۆ ) . |
| پۆز | لووت[6] . خۆبەرزگرتن . بەچکە بەراز ( بزەڵە ) . قنــك ( لە پزۆەوە ) . | رێــکەوت . |
| پۆس | پۆستە ، قەرەوڵ ، ئێشکچی[7] . پێست ، پێستە . کڵاو . | هەندێــکیان چــاودێری ، باقیەکەی ئەندامی لەش یەکیان ئەخات . |

(٦) خاڵ ٢٢٥ .

(٧) خاڵ ٢٢٥ .

| | | |
|---|---|---|
| پتۆلەکە | پتۆلەکەی ماسی (حراشف) . پتۆلەکەی کەوش[8] . پتۆلەکەی جل . قەتماغەی برین . | خڕی و تەنکی یەکیان ئەخات . |
| پەنا | قوژبن ( زاویە ) . سایە و دالْدە (پەنا بە خوا) . پەسێوا[9] . | ( زۆری شێوە ) . |
| پەروانە | پەپولە[10] . پەروانەی فڕۆکە و ئۆتۆمۆبێل . | سوڕانەوە یەکیان ئەخات . |
| پەستەك | بەرگێکی پێاوانەی کوردە . پەستێوراو . | سفتی یەکیان ئەخات . |
| پەشم | خوری . ئاوریشم . قسەی هیچ و پوچ . | ئەشێ نش و فۆلی یەکیان بخات . |
| پەیك | کەسێکە نامە ببا بۆ خاوەنی . ئەستێرەیەکی بچوکە بە دوای گەورەوە ، بەردەستێکی بچوکە لە گەورە جیا نەبێتەوە[11] . قۆڵ . تیر . دەنک . | گورج و گۆڵی و بچوکی یەکیان ئەخات . |
| پیت | فەڕ و بەرەکەت . (حرف) . (أداة) . | ڕێکەوت ( وشەی هاوگۆ ) . |

(٨) خاڵ ٢٢٩ .

(٩) خاڵ ٢٣٥ .

(١٠) خاڵ ٢٣٦ .

(١١) خاڵ ٢٤٧ .

| | | |
|---|---|---|
| پیرك | ئەنك . جالجالۆكە . | رەنـگ هەیە پەرپوتێ یەکیان بخات . |
| پێن | پان . لەقەی ولاخ . | ( زۆری شێوە ) . |
| تا | تاوەکو ( هـەتا .. ) . لەرز و تا . تای تەرازوَ . تای بار . تا و تو ( ئالۆکۆز ) . | رێـکەوت ( وشەی هاوکۆ ). |
| تاتۆ | باوك ، مـام ، خوشـکی گەورە[12] . هەورامێ . لەش . | نزیکایەتی و خزمایەتی یەکیان ئەخات . |
| تاتێ | سەکۆ . لبادی راختن . | هەردوکیان لە سەریان دائەنیشن . |
| تاس | جام . تاس ولوس‌دان ( تجمیل ) . تاس بردنەوە ( بوورانەوە ) . تاسی سەری ژنان ( کلاوزێڕ ) . | لە زمانێـکی ترەوە . |
| تاف | تافەتاف ( کوڕی ئاو ) . توف ( سەرما و بەفر و بـاران ) . تاوی گەرما . تـاو ( کات ) . تافی جوانی . | گشتیان لە ( کـوڕ ) و ( تین ) دا یەك ئەگرنەوە . |
| تاکە | تاکی پێـلاو . تاکە و تاك ( بێچـەوانە ) . تاراتی ( پارەی کۆن ) . | هەمو بارچەن . |

(١٢) خال ٢٦٩ .

| | | |
|---|---|---|
| تاڵە | مەڵای لەش سپی و دەموچاو بۆر[۱۳] . رەنگی ئەسپ و ماینی تۆخ . هەوری تاڵ ، تاقە شتی تاڵ ، روی تاڵ . تاڵەدانی مەشکە و کوننە و جەوەنە ( خۆشە کردنیان ) . | رەنگی بۆر و تالی ناخۆش یەکیان ئەخات |
| تانۆك | تەیمان ( سیاج ) . گاسن . | هێزێك یەکیان ئەخات کە توانای پاراستن و کێڵانە. |
| تاوك | خێوەت . دارەبەن . | سێبەر و بنهان یەکیان ئەخات. |
| ترش | تاقە ترش . ممـاق . جۆرە دڕکێك . روی گرژ و ترش . | جۆرە ناخۆشیەك یەکیان ئەخات . |
| ترەکین | قڵیشانی پێست : زاینق سەگ و گورگ هاتنە دەنگ ( بۆ دوژمن و نـاحەز ) . دان پیانان لە لایەن ناحەزەوە ( اعتراف ) . | دەربڕ یەکیان ئەخات |
| تل | تەلەبەرد ، بەردی گەورە . تل خواردن بە خەفەت و ئازارەوە . تەپاو تل سەگلۆ . | هەندێکیان جۆری جوڵانەوە یەکیان ئەخات . |

(۱۳) خاڵ ۲۷٤ .

**تۆران** — عاجزبوون. ولاتی تورك (رۆم). — (لە زمانێکی ترەوە).

**توون** — کەسکوون (بۆتام و بۆن).
توونی حەمام و توونی بابا.
ئەوانەتوون (داری توون).
— رێکەوت (وشەی هاوگۆ).

**تەپ** — سل. پان بوونەوە و کەوتن.
تەپاوتل. فێ. تەم و مژ.
بێدەنگ و مات. لێدان (تەپ و کوت دا کرتن).
— ئەشێ پان بوونەوە یەکیان بخات.

**تەل** — تەلی (معدن). خشل: خڵۆی
لە تەل داوە و خڵۆی رازاندۆتەوە
تەلی سەری بەران و مەڕ
(کڵۆڵنکەیەکی خوریە بە
سەریانەوە).
— ئەوەی (بۆ رازاندنەوە ئەشێ) یەکیان ئەخات.

**تەمانە** — بە تەمای (ئەتەوێ). (طماطه). — (لە زمانێکی ترەوە).

**تەن** — لەش. تن (قنگ). (طن. TON).
— (تن) هەر ئەندامی لەشە، بەلام (طن) بێگانەیە.

**تەنگە** — ناوقەد. تەنگەی ولاخ:
پشتێنی زین و کورتانە. تەنگەتاو
(تضایق).
— گوشین یەکیان ئەخات.

| | | |
|---|---|---|
| تەهل | تاڵ . ڕوی گرژ . تاڵـــەدانی مەشکە و کوننە و جەوەننە[14]. | ( زۆری شێوە ) . |
| تیتك | پور ( خوشکی دایك ) . ئەگریجە . تێکەڵاو . بەشێـکی شۆڕبووەوەی پەتك یا شلك . | جۆرە ( پەل هاویشتن ) ێك یەکیان ئەخات |
| جـۆ | جۆگە وەك : باڵاجۆ ، جۆگەیەکە لە ناوچەی تانجەرۆ . جـــۆرە مورویەکی شێوە جۆیی ڕەنـگـا و ڕەنگە . دانەوێڵە . یارییەکە ( هەی جۆ هەی جۆ ) . | ڕێکەوت ( وشەی هاوکۆ ) . |
| چارە | ڕوو : ( چارەم چارەی ناوێ ) . چارە ســـەر کردن ( علاج ) . دەسەڵات : ناچارم . چوارە . | ڕێکەوت . |
| چاوەش | ســـەردەستەی لـۆتیـەکان . ( عریف ) . چەنەباز و زمان درێژ | چاکۆش ( چاكبێژ ) یا جوزە پێشـکەوتنێك یەکیان ئەخات . |
| چـەق | چەقی ڕێـگە . چەقی گۆشت . چەقچەقەی ئاش . چەق ئاوەستو . | |
| چەقە | دەنـگە دەنـگ و هەراهـەرا ( چەقەچەق ) . پێســـتی تەنکی | ( زۆری شێوە ) . |

(١٤) بڕوانە تاڵە .

| | | |
|---|---|---|
| | غاطی . چـەقەلـۆ چـەقەچنۆ . چەقەچیرە . | |
| چـەم | چاو . چەشم ، رۆبار . | رۆنی یەکیان ئەخات . |
| چەمەرە | کەوانە . پرسەو (تعزیە) . | (زۆری شێوە) . |
| چـــڕ | سفت (بۆ شـــت)، پـڕ (بـۆ بێشەلاّن) ، خەستی (بۆ دۆشاو) . | جـوۆرە یەکگرتنێك کۆیان ئەکانەوە . |
| چیلە | ماکەو . خوێندنی کەو . حیلاندنی ئەسپ و ماین . سنقور . | دەنـك و رێـکەوت یەکیان ئەخات . |
| چـین | ولاّتی چین . دەستە و (طبقە) . چینی دیوار . ئەوانە چین ؟ | دەســتە و چێنی دیوار (نزیکایەتی) یەکیان ئەخات . |
| خار | دۆك . خوار . خوارەوە (اسفل) . | دوانەکەی پێشــەوە چەوتی یەکیان ئەخات . |
| خالاّنە | بەدەردی ، هەروەك ، وەك خالّ . خالّ (نقطە) ی نۆهەمێـن . | (لە زمانێکی ترەوە) . |
| خام | خاو (کالّ) (مواد اولیـــة عەرەبی) . قوماشـی سپـی . | خاوی و سەرەتایی یەکیان ئەخات . |
| خاو | خام (کالّ) . خەو ، خەوبینێن . پێســتەی تەپلّ . پێچەوانەی کرژ و گورج (شل و سست) . | |

| | | |
|---|---|---|
| خەتەرە | سەرکردنی نیشـان پێرکردنەوە (خاطرە) . | (لە زمانێکی ترەوە) . |
| خەم | خەفەت . پێچ (قوس) . قەف . چەماوە (کۆم) . | خواری و جوزە گیرییەك نزیکیان ئەخاتەوە . |
| خەو | نوستن . خەوبینیـن . | خەوتن لێکیان ئەدات . |
| خڕخاڵ | پاوانەی زەنگوڵەدار . ورد و خاش بونی شوشە و کاشی . خاڵی خڕ . پڕخاڵ (خالاوی) . | ئەشێ هەمـو لە وردیدا یەکبگرنەوە . |
| خرلێ | دانە پانەکانی دواوەی ناو دەم . خاڵۆزنی . | (زۆری شـێوە) . |
| خـۆ | کەس و کار ، دۆست ، پێچەوانەی بێگانە (ئاو ببڕێ لە رۆخانە خۆ نابێ بە بێگانە) . هێشتا (خـۆ دڵی نەگەیشتوە ، دوکەڵ بکات) . خۆ بە واتای (نفس) دێت وەك : خۆپیشاندان . | زۆریان خۆیتی یەکیان ئەخات . |
| خـو | رەوشت (اخلاق) ، سـلوك ، عادة) . فێ (صرع) . خو کردن لەمندال بۆ ترساندنی . رەوشتی خراپی ماین و ئەسپ . | هەمو رواڵەتەکانیان رەوشتن . |

| | | |
|---|---|---|
| خوا | یەزدان . خوێ . خۆڵەمێش . | (زۆری شـێوە) . |
| خواس | باس و خواس (خێر) . (خواز) (خواست) . خاوَس . | ڕێکەوت (وشەی هاوگۆ) . |
| خوم | بۆیەی رەنگ کردن . مەرکانەی شەراب . زەوی خۆ خواردوەوە . | تاریکی رەنـگ دوانیان یەك ئەخات |
| خۆ | حەوتەم پیتی هجایە و بە أبجدیش ژمارەی (٦٠٠) ە . خوێ . | ڕێکەوت (وشەی هاوگۆ) |
| خێو | خاوەن . لەخەراڤاتدا دێـو و درنج و جنۆکە . | خاوەن یەکیان ئەخات . |
| دایە | دایك ، بەربۆك ، دایەن ، دایك بانـگ کردن . دایە دەستی ، یاخود پێی دا . دادێـت و ئەبێتـە مۆدە . داهاتن (شق) کردن . | ڕێـکەوت . |
| دڕ | شەڕانی . زبر . تیژ . درز . | جـۆرە (نابەسـەندی) یەك نزیکیان ئەخانەوە . |
| دۆ | دۆی خواردنەوە (سـپیاتی) . دوێنێ . | زوری شـێوە . |
| دوَپشك | دەمارە کۆڵ (عقرب) . دوَبەش . | زوری شـێوە . |
| دوێت | دۆت (daughter) پـــی . مەرەکەبدان . | زۆری شـێوە . |

| | | |
|---|---|---|
| دلی | گوند . دێت ، یەت . | ڕێكەوت . |
| دێم | زەوی وشكەلان . من دێم لە كەلتا . | ڕێكەوت . |
| دین | ئایین ، شێت . ئەوان دێن . | ئەوسا هەبوّ شێتی‌ئایین بوّ ، دوانیەكە ڕێكەوتە . |
| راست | راستگۆ ، راستەوراست . جۆرێكە لە هەڵپەركێی كوردی . مقامێكی گۆرانیە . (ئاقار : لە راست)[15] . | هەموویان رواڵەتێكی (بێ گرێ و رەوان) یەكیان ئەخات . |
| رم | سڵ . (رمح) . | توبڵێی سڵیان لە رم نەكردبێتەوە وئەمە بەیدا بوبێ ؟ |
| روخ | رۆ . بەر . قەراغ و تەنشت . دەسكەلای یاری شەترنج . مەلی سیمرخ (كە مەلێكی ئەفسانەییە) . | زۆری شێوە و لە زمانی نزەوە . |
| رۆت | رۆتۆقوت (بێ‌بەرگ) . رۆی تۆ . | ڕێكەوت (جیاوازن) . |
| رەش | رەنگی رەش . كون (قنگ) : وەك ئەڵێن بەرەشی بابیەوە . سڕینەوە (رەش كردنەوە) . ناشیرین (لەبەر چاوی رەش بوە) . جۆرە هەنجیرێكە[16] . | هەموو رەنگێكی تارێك یەكیان ئەخات . |

(١٥) خاڵ ج ٢ ل ١٧٣ .

(١٦) خاڵ ج ٢ ل ١٩٤ .

| | | |
|---|---|---|
| رەوان | سك‌چوون . شــتی بۆ کرێی و تۆرت : دەرسەکەم رەوانە[17] . رەوانە کردن . فڕاندن : ژنەکەی رەوان . تەرەکردن . | هەمو ( رەو )ێکی بۆ کرێ یەکیان ئەخات . |
| رێ | رێــگە . پیت ( ر ) کە ژمارەی ئەبجەدیەکەی ( ٢٠٠ )ە . ( مبدأ ) | رێــگە و ( مبدأ ) یەکن . |
| رێویی | سی ( رئة ) . نەخۆشــی کرمی سی لە ئاژەڵدا . نەخۆشی‌سنگ و کـۆکـە لە ئاژەڵدا . لاواز . ( رێبوار )[18] . مام رێوی . | رێبوار و مامرێوی نەبێت ، ئەوانی تر نەخۆشــی یەکیان ئەخات . |
| ریت | رشت . ئاوی‌پیاو و ژن فڕێدان ( قذف ) ، ( تەکان . شــڕە و کڵۆنە ) .[19] | ئەوەی دوایی نەبێت ئەوانی تر رژاندن یەکیان ئەخات . |
| زا | نەوە، وەك : کوڕەزا ، ئامۆزا . منداڵ بوون ئاوتێزان . زین | زین نەبێت ئەوانی‌تر ( زا و زێ ) نزیکیان ئەخانەوە . |
| زاخ | سمڵ و زاخ ( شب ) . ( تاوێری گەورە )[20] هێز . | دوانەکەی هــەوەڵ ( کان ) یەکیان ئەخات . |

(١٧) خاڵ ج ٢ ل ٢٠١ .

(١٨) خاڵ ج٢ ، ل ٢٠٧ .

(١٩) خاڵ ج٢ ل ٢٠٧ .

(٢٠) خاڵ ج٢ ل ٢١٠ .

| | | |
|---|---|---|
| زەڕ | زێڕ . زەڕەی کەر . | ڕێکەوت ( وشەی هاوگۆ ) . |
| زەر | کچ . بچوك . جوان . زەرد | ئەوەی دوایی نەبێت ، هەمو زیکەڵەیتی بەکیان ئەخات . |
| زەڕە | گۆشت . بەشێکی هێجگار بچوك ( ذرەی عەرەبی . ( چارە یا ئێسك : زەڕەتاڵ ، زەڕەگران . زەڕەی کەر .[21] | هەندێکیان گۆشت و ئێسك یەکیان ئەخات ، ئەوانی تر بە ڕێکەوت . |
| زێ | ڕوبار . زێیی ئافرەت : ڕەحم و ئەندامی جنسی . دەزوی زۆر قایمە بۆ درومانی زین و کەوش . پیتێکی هجایە و بە ئەبجەد ژمارەی (٧) ە . ( ڕێگە . ڕەوشت . ئەندازە .[22] | پیتی ( ز ) نەبێت ، ئەوانی تر بە شێکیان لە قوڵی و بەشێکیان لە درێژیدا نزیکن . |
| ژوَر | هۆدە . سەرو . ناوەوە ( داخل ) . ( بەرسێلە ) .[23] | ئەوانەی پێشەوە ( شوێن ) نزیکیان ئەخاتەوە . |
| ژەم | جار ، خۆرە[24] . ژەمی خواردن . مێشك . مۆخ . | |

(٢١) خاڵ ج٢ ل ٢٢٨ .

(٢٢) خاڵ ج٢ ل ٢٣٤ .

(٢٣) خاڵ ج٢ ل٢٤٢ .

(٢٤) خاڵ ج٢ ل ٢٤٢ .

| | | |
|---|---|---|
| ژەنگار | ڕەنگی سەوزی تێـر ، مۆروە شـێنە(٢٥) . ڕەنـگی شـینی پیرۆزەیی . دوَکەڵ . ئەو شتەی ژەنگ ئەگرێت . ناوچەی سنجار (ژەنـگـال) . | هامـۆ ڕەنـگ بەکیان ئەخات . |
| ژیـر | عاقل و لەســەرخۆ . ڕزین . ژیرکردنەوەی . مناڵ یاخــود کریاو . | |
| سرکە | ( خل ) . سرپە ( سرکە سرك(٢٦) | ڕێـکەوت ( وشەی هاوگۆ ) . |
| سنـگ | سنـگی دار و ئاسن . (صدر) . پێش . ( کرمی نـاو سك سۆژن )(٢٧) . | ڕێکەوت ( وشەی هاوگۆ ) . |
| سۆراخ | لەت . کون . سۆسەکردن . | لەت و کون تێبکن . سۆســەکردنیش دۆزینەوەی ( ثغرە ) یەکە . |
| سۆچ | گۆشە (زاویە) . گونـاه . | ڕێـکەوت ( وشەی هاوگۆ ) . |
| سۆك | پێچەوانەی قورس . ئاســان . بۆ (اخلاق) . | سوکایەتی بەکیان ئەخات . |

(٢٥) خاڵ ج٢ ل ٢٤٢ .

(٢٦) خاڵ ج٢ ل ٢٥٧ .

(٢٧) خاڵ ج ٢ ل ٢٦٤ .

| | | |
|---|---|---|
| سەبیل | قلیان . (خیرات) . ڕێگا (بە عەرەبی) . | لە زمانێکی ترەوە . |
| سەرچڵ | مرۆی نارەحەت . سەرلق . هەناری سەرچڵ . | هەمو (سەر) یاخود (باڵا) یەکیان ئەخات . |
| سەردار | سەرۆك . سەری دار . | |
| سەوزە | (خضراوات) . ئەورەنگە سەوزە . رەنگی مرۆ : سەوزە مەڕۆ سەوزەکە ، سەوزەکەی ماڵم .... | رەنگی سەوز یاخود مەیلەو سەوز یەکیان ئەخات . |
| شامی | شوتی . خەڵکی شام یاخود شتی شام . ئێوارەیی . | لە زمانێکی ترەوە . |
| شایی | ناوی پارەیەکی ئێرانە . شایی و زەماوەند . پادشایی . | رێکەوت (جیاوازت) شاییەکەش شادییە . |
| شەق | درز ، لەت کردن . تێ هەڵدان (شتی لەق)[۲۸] . | زەبر پێ گەیاندن نزیکیان ئەخاتەوە . |
| شەمتۆ | بتۆکەبەبارانە . رۆژی شەمتۆ . | زۆری شێوە . |
| شیر | شیری ئاژاڵ (حلیب) . شێری شەڕ (سیف) . | لەوە ئەکات رەنگی (صاف) نزیکیان خاتەوە . |

(۲۸) خاڵ ج ۲ ل ۳۳۹ ،

| | | |
|---|---|---|
| شێن | رەنگی شێن . شیوەن . پیتی ئەبجەدە و ژمارەی (٣٠٠) ە . | دوانەکەی هەوەڵ رەنگ یەکیان ئەخات . |
| ڤاڵ | ڤاڵ گرتنەوە (فأل) ، نوقڵانەی باش[٢٩] . هاتنەبای وڵاخ (بزوتنەوەی هێزی جنسی) . | خۆشی یەکیان ئەخات . |
| فرۆ | جۆرێک لە شیرەمەنی . هێنان ، هێنانە پێشەوە . تێ‌رۆچوون . | ئەمانەی دوایی جولانەوە یەکیان ئەخات . |
| فێ | خێ (صرع) پیتی هجایە و بە ئەبجەد ژمارەی (٨٠) یە . | رێکەوت (جیاوازن) . |
| قاپ | قاج . قاپی نان خواردن (ماعون) . قاپ گرتن : پەلاماردان . | رەنگ هەیە هەمویان (قەپ) یەکیان بخات . |
| قات | نهۆم (طابق) . قاتی جل و بەرگ . قات و قڕ (قرط). | رێکەوت (جیاوازن) . |
| قاف | کێوی قاف (کێوێکی ئەفسانەیی کوردە) . پیتێکی هجایە و بە ئەبجەد ژمارەی (١٠٠) ە | لە زمانێکی ترەوە . |

(٢٩) خاڵ ج ٢ ل ٣٦٥ .

| | | |
|---|---|---|
| قڕان | جۆرە پارەیەکی کۆنە ( تارانی ) . قڕ تێکەوتن . بۆ قڕاندن ( فأل )ی خراپ . قڕاندن قاژو . | پارەکە نەبێت ، ئەوانی تر ، شۆتێ و قڕتێکەوتن یەکیان ئەخات . |
| قڕە | پاشکەوتێ ، لە دوای هەموانەوە . قڕەقڕ : دەنگە دەنگ . | ڕێکەوت ( جیاوازن ) . |
| قەوچە | هەوسار . قسەی بێجێ . دەم تەقاندنی ماکەر بە گەرم بێونی هێزی جنسێ . | نۆڵێتی قسەی بێجێ کە لە دەم هاتۆتە دەر بە قەوچەی ماکەر دانەنرابێت ؟ |
| کا | تور . مەکۆ . کای ئالیکی وڵاخ . کورت کراوەی کاك وەك : کانەبێ . | زۆرێ شێوە . |
| کاس | وڕ و بێمێشك . سەرسۆرمان . کاسەی سەر . | سەر هەموێان یەك ئەخات . |
| کام | نەخۆشیەکە تێشی دەمی وڵاخی بەرزە ئەبێت . کامیان : کامەیان حەزکردنی مرۆیە لە خواردن کەلێی قەدەغە بکرێت : با کوڕەکە کام نەکات . | دوانیان لە ئاوزانە دەم و لیکدا یەك ئەگرن . |
| کان | ( معدن ) . کانی خورما . | چالێ شوێنەکە یەکیان ئەخات . |

| | | |
|---|---|---|
| کایە | نۆرە لە یاریدا . ئەوە ( کا ) یە ( تەتەڵە میران )[30] . | ڕێکەوت . |
| کز | بێدەنگ . خاوبونەوە . کورك . | مانێ یەکیان ئەخات . |
| کلك | کلکی ( حیوانات ) . کلکی بێڵ و خاکەناز . پەنجە قامك . کلك پێوەکردن : گاڵتە پێ کردن . | درێژایێ یەکیان ئەخات . |
| کول | چەقۆی کول . بڕین . بۆمێشك . کولڵێدان : هەوانتە خۆرێ . | هەمۆ ( نانوانایێ یەکیان ئەخات . |
| کۆڵ | کۆڵێ شاخ و پەنجە و نینۆك . باری زەلام . ( کوریس )[31] پشت : بیکەرە کۆڵ . | کۆڵێ شاخ و پەنجە و نینۆك ، جۆرە کورتێ و خڕیەکی تێدایە ، هەروەها باری زەلامیش کە ئەکرێتە کۆڵ . ئەمیش لەگەڵ کوریسدا پەیوەندیان هەیە . |
| کۆڵ | دارێکی ناوکۆڵراوە ئاژاڵ ئاوی تیائەخواتەوە . سەکۆ ( لوشە : گیایەکی کوێستانیە ئەکرێتە دۆکلیوەوە )[32] | ڕێکەوت ( جیاوازن ) . |

---

(٣٠) فەرهەنگی کشتوکاڵ . بەرگی دوەم . معروف قەرەداخی . لاپەڕە (٤٥) .

(٣١) قەرەداخی . ب٢ . ل ٦٣ .

(٣٢) سەرچاوەی پێشو ل ٦٣ .

| | | |
|---|---|---|
| کەر | کوڵی درێژ ، بێ عەقـڵ  قـەرز . کەرت ، لەت . | رێـکەوت ( جیاوازن ) . |
| کەڕك | فەرەنجی ئەستوور و شـۆڕی شوان . کەپەنك . مریشك . | رێـکەوت ( جیاوازن ) . |
| کەرە | کەرە و ماست . کابرایەکی کەرە : بێ ئەقڵە . | رێـکەوت ( جیاوازن ) . |
| کەور | کەوڵ . بەرد . چیا . کەندەڵان بە بەرزیەوە . | زۆری شێوە . |
| کێش | قورسایی . را کێشان و هێز . وەزنی شیعر . کێشانی جگەرە . کێشە لێکردن : گواستنەوە . جەفا کێش : کێی تریش ؟ . هەوری و مشکی بەسەرەوە بەستن. | سەنـگ و کـێشان زوربەیان یەك ئەخات . |
| کێشان | (وزن) کردن . کێشە لێکردن و گواستنەوە . مژین را کێشـان . جگەرە کێشان . پیاکێشان و بەسەردا کێشان . (چاك کردنی ماینە لەئەسپ و ماکەر لە نێرەکەر)[٣٣] | سەنـگ و کـێشان زوربەیان یەك ئەخات . |

(٣٣) دیسانەوە ل ٦٦ .

| | | |
|---|---|---|
| گاشە | هەرا : مەیکە بە گاشـــە . بەردی گەورە. | بۆ بەرد ئەبێ لە (گاتاش)ەوە هاتبێ . |
| گەز | گەزی پێـوان . جۆرێـکە لە درەخت . گازگر . | زۆرێ شێوە . |
| گەنجینە | ژوورێـکی بچـووك لە کەلەکی یا پشت هەیوان . گەنج و سامان . | رێـکەوت ( وشەی هاوگۆ ) |
| گۆڕ | قەبر . مەیدان ( ساحة ) . | رێـکەوت . |
| گۆڵ | سەگی نێر . گورج و گۆڵ گۆڵی یاری فوتبۆڵ Goal . | نۆ بلێی سەگی نێر گورج و گۆڵتر بێ لە دێڵ ؟ . |
| لام | پیتێکی هجـا و کوردییە بـە ئەبجەدیـش ژمارەکەی (٣٠) یە . لای من ، لەلام وایە . | رێـکەوت و لە زمانێکی ترەوە . |
| لەبەر | ( حفظ و درخ ) . لە پێـش . بەهۆی . لەبەر خاتری . | رێـکەوت ( وشەی هاوگۆ ) . |
| لنگ | قاچ . تاك : خاوەنی لنگەگایەکە و بەس . | تا کێ یەکیان ئەخات . |
| لۆچ | بلۆچی ؟ . پێچی شت . لۆچـی ورك . چرچ و لۆچ : ژاکاو . | زووربەیان ( لۆ ) نیابوونەکە نزیکیان ئەخاتەوە . |
| لێخوڕین | هاژوانی ئۆتەر . دەنگ لێ کردن . | جوڵە پێکردن یەکیان ئەخات . |

لێهاتن — (لائق) . (ژان‌کردنی چارەولی یا ژن لە کاتی منالٚ بوونا[٣٤]. — رێکەوت (جیاوازن) .

ماش[٣٥] — جۆرێکە لە دانەوێڵە . تەیمانێکە لە نـــاوئاودا بۆ گلدانەوەی پۆش و پەلاش . هیچ و فیروسیا. — رێکەوت و زۆری شێوە .

ماڵ — خانوو ، ماڵی خۆمان . زلی یاخود ئەندامی جنسی مێیینە . مـــاڵی کەوان وەك ســـالم ئەڵێ : تـــا خەدەنگی قامەتی تۆی کرتە باوەش ماڵی قەبر ـ پشتی‌تاقانەت لەخەم خەم بۆ وەکو ماڵی‌کەوان . — هەمۆشوێن یەکیان ئەخات .

مان — (بقـــاء) . مانگرتنی ولاخ و چارەولی . مانەوە . — گل‌خواردنـــەوە یەکیان ئەخات .

مت — مات‌بوون ، خۆخپ‌کردن . سەکۆ. — شوێن یەکیان ئەخات .

مشت — لوێچ ، مشتەکۆڵە (لـکمە) . پر . دارماڵ . — زوربەیان دەست یەکیان ئەخات .

مشك — (فار) . (عطر) . خۆڵەمێـش . رەشتی دوکەل . — هەنرەکە نەبێ ، ئەوانی تر رەنـگ یەکیان ئەخات .

---

(٣٤) قەرەداخی ب٢ ل ٩٦ . (٣٥) قەرەداخی ب٢ ل ٩٩ .

| | | |
|---|---|---|
| مشکۆ | خۆڵەمێش ، کێشی سەرپێچ . ڕەشێ دوَکەڵ . | ڕەنگ یەکیان ئەخات . |
| مەردوَم | کەس ( مرۆ ) . بیبیلەی چاو . | ڕێکەوت و زۆرێ شێوە . |
| مەکۆ | مەکۆی جۆلایێ . ( کمین ، مخبأ ) . | ڕێکەوت . |
| میم | پیتێکی هجایە ، بە ئەبجەد ژمارەی (٤٠) ە . بێور لە دایکەوە . بەهەر ژنێك ئەوَترێ سەری ڕەش بێ . | دوانەکەی دوایێ ( ژن ) یەکیان ئەخات . |
| ناودار | ( مشهور ) . ( محشی ) . ناوی دار . لە ناو دار و درەختدا . | ڕێکەوت ( وشەی هاوکۆ ) |
| نمەك | خوێ . دڵسۆزێ ( وفاء ) . | دڵسۆزیەکە لە ئەنجامی ( نمەك ) کردنەکەدایە . |
| نەخت | نەختێك ( کەمێك ) . نەختێنە ( نقدی ) ، شیربایێ . | چەند ( مقدار ) یەکیان ئەخات . |
| نەو | تازە و نوێ . لباد . | ڕێکەوت و زۆرێ شێوە . |
| نێو | لە ناو . ناو ( اسم ) . | ڕێکەوت و زۆرێ شێوە . |
| ومچە | نەتەوە . لق و چڵ . | لق لێبوَنەوە یەکیان ئەخات . |
| هار | ئارد . ئاش . دەستاڕ . هار و هاج . ئەخلاقێ هارێ . | سیانەکەی پێشەوە ( هاڕین ) یەکیان ئەخات . دوانەکەی دواشەوە چەنۆنێ . |

| | | |
|---|---|---|
| هاڵە | نەخۆشی ولاخی بەرزە (سفلس) . بەرسێلە . | رێکەوت و زۆری شێوە . |
| هۆ | (سبب) . بۆ بانگ کردن لە دوورەوە وەك : هۆهۆ حەمەکە هۆو . دەنگێکە لە کاتی جووتدا بۆ لێخوڕینی گاجووت بەکار ئەهێنرێت . | دوانەکەی دوایی دەنگ یەکیان ئەخات . |
| هۆڵ | ( ساڵۆن HALL ) . گەوڕەی مەڕ . چۆڵ : چۆڵ و هۆڵ . | ئەمە سەیرە کە ساڵون و گەوڕی مەڕ وا نزیکن لە شوێندا ، هەرچەند لە ( استعمال ) دا جیاوازن . |
| هەجك | قۆچەقانێ دوایی . سەرنووك . | رێکەوت و زۆری شێوە . |
| هەرچی | هەرچی هەیە و نیە . هەرچی و پەرچی . | |
| هەس | ماست . هەیە . | رێکەوت . |
| هەڵاو | گیا . هاڵە ( نەخۆشی فەڕەنگی ولاخ ) . هالاو . | رێکەوت و زۆری شێوە . |
| هەڵەسوور | گوڵێکی سوورە . جۆرە ترێیەکە . | خڕی و سووری یەکی خستوون . |
| هەڵکزا | سووتا . بێ کەیشت و دەوڵەمەندبوو . | رێکەوت . |
| هەمانە | هەمانەی ئارد و برنج . ئێمە هەمانە . | رێکەوت . |

| | | |
|---|---|---|
| هەنگ | مێـــش هەنگ . کرمێکە لـــە پشتی ئاژەڵ دەریەت و باڵ ئەکرێت. هەزار و هەنـــگ : هەزار و ئەوەندە .. | وردی و زۆری یەکیان ئەخات . |
| هێک | هێلکە . یەکێک . | زۆری شێوە . |
| یاڵ | گرد ، شاخ ، باسکە شاخ . یاڵی وڵاخ . | نیرەشانی یەکیان ئەخات . |
| یانە | خانو ، نادی ، شـوێنەوار . یان نەء : یاخود نەء . | ئەوانەی پێشەوە ( شوێن ) یەکیان ئەخات . |

* * * * * *

## ـ ملخص المقال ـ

# بعض المصطلحات الكردية
# التى لها اكثر من مدلول

العضو المؤازر : جمال بابان

### ـ القسم الثانى ـ

نشرنا فى القسم الاول من المجلد الثاني من مجلة المجمع العلمي الكردي ما يقارب (٣٥٠) مصطلحاً من المصطلحات التى لها اكثر من مدلول مع شرح العلاقة فيما بينها ، كما قدمنا فى نفس المقال اسباب تعدد تلكم الدلالات ، والتمسنا من القراء الكرام التعاون معنا فى هذا الحقل . فشمر الاخ (حەمەبلار) عن ساعد الجد ، فقدمنا معاً هذا القسم الثاني الذي استقي اكثر مصطلحاته من المعاجم مع الاشارة اليها .

نرجو مخلصين من القراء الكرام المزيد من التعاون . وبهذه المناسبة نشكر الاخ (بكر عبدالله گەردى) الذي قدم قائمة ببعض الملاحظات حول القسم الاول من المصطلحات ، ولاريب اننا سوف ننشرها بكل اعتزاز مع ملاحظات اخرى ان وردنا شيء منها .

* * * * * *

# ڕوونکردنەوەیێکی پێویست

کۆڕی زانیاری کورد ، لە ڕۆژانی سەرەتای دامەزرانیەوە ، چەند لیژنەیێکی پێك هێنا بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی کە بە پێی یاسای دامەزرانی بۆی دیار کراون .

بۆ خەریك بوون بە زمانی کوردییەوە ، کە یەکێکە لە ئەرکە هەرەگرنگەکانی کۆڕ ، لە هەوەڵەوە لیژنەیێك دامەزرا بە ناوی (لیژنەی زمان)ەوە بە ئەندامەتی ئەم مامۆستایانە : پاکیزە رەفیق حیلمی ، کامیل بەصیر ، گیو موکریانی ، عەزیز ئەحمەد ، صادق بەهائەدین ، نوری عەلی ئەمین و ئەحمەد تاهیر نەقشبەندی . نەختێك دواتر مامۆستا حافز موستەفا قازیش خرایە سەر لیژنەکەوە و بوون بە هەشت ئەندام . ئەم لیژنەیە لە ڕۆژی ۱۹۷۱/۵/۳دا کەوتە سەر کار کردن و دوازدە جاران کۆبۆوە و بەسەردا هەڵوەشایەوە و یەکێکی تری لە جێگە دانرایەوە بە ناوی (لیژنەی زمان و ئیملا) و لەم ئەندامانە پێك هێنرا : مەسعود محەمەد ، هەژار (عەبدوڕڕەحمان) ، پاکیزە رەفیق حیلمی ، نەسرین فەخری ، کامیل بەصیر ، صادق بەهائەدین ، عەبدولحەمید ئەترۆشی و نوری عەلی ئەمین .

لە یەکەم نیگاوە دەر دەکەوێت لە هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەم

لیژنانە لایەنی گرتنـەوەی زوربەی شێوەکانی ئاخاوتنی کوردیی رەچاو کراوە تاکو رێزمانێك کە لە ئەنجامی تۆژینەوەی لیژنەیێـکی ئەوتۆوە بەرهەم بێت سەرلەبەری شێوەکانی کوردیی تێدا خوێندرابێتەوە بەو نیازە کە وا لە بەراورد کردنی زۆرینەی شێوەکانەوە هەل پتر چەنگ کەوێ بۆ دۆزینەوەی دەستوورە رەسـەنەکانی رێزمانی کوردیی . ئەم مەبەسەش بەلاوە بنـدرێ مەبەسی رۆیێو کردنی هەمو زمانەکمان ، ئەگەر مومکین بێت ، لە رێی تێخوێنـــدنەوەی هەمو شێوە ئاخاوتنەکانیەوە کارێـکە بایەخی تایبەتی خۆی هەیە و گەلێك یارمەتی زمانزان دەدات هەم بۆ پێك هێنانی فـکرەیێکی گشتی لە بارەی زمانی کوردییەوە و هەم بۆ تێبڕ کردن لە گەشتی پسپۆڕانە و تێهەڵـکشینەوەی مێژوَناسان بۆ ناو جەرگە و بۆ سەر بنجی زمانەکە .

بێگومان رەچاو کردنی ئەم مەبەسانە لە سەرەتاوە وای کرد پێكهێنانی لیژنەکان باوەش بە ژمارەیێـکی زۆر لە ئەندامان دابگرێ ، بەڵام بە تاقی کردنەوە دەرکەوت لیژنەی زۆر ئەندام بە هۆی درێژە کێشانی دەمەتەقەی نێوانیانەوە بڕشتی ئەوەندە کەم دەبێ کە لەگـەڵ ئەرك و کاتەکـەی چ گونجانێـکی نەبێ ، بۆیێ ئـــەم لیژنەیەش هەڵوەشـــایەوە و ئەمجارەیان لە رۆژی ١٩٧٢/١١/١٢دا دوَ لیژنەی لێکەوتەوە : یەکێـکیان بە ناوی (لیژنەی زمان) کە لەم ئەندامانە پێك هێنرا : مەسعوود محەمەد ، هەژار ، نەسرین فەخریی ، صـادق بەهائەدین و نوری عـەلی ئەمین . ئەوی‌تریانـ بە ناوی (لیژنەی لێـکۆڵینەوەی زمان) کە لەسەر رێبازێـکی تایبـەتی خۆی خەریکی تۆژینەوەیە و چ پەیوەندیێـکی بە لیژنەکەی‌ترەوە نیە .

لیژنەی زمان بەردەوام بو لەسەر چالاکی خۆی تا رۆژی ٥/١١/٩٧٣ . لەم رۆژەدا بڕیارێکی نوێی لە ئەنجومەنی کۆڕەوە دەرچو لیژنەیێکی تازەی پێك هێنا لە ژێر ناونیشانی (لیژنەی زمان و زانستەکانی) بە ئەندامەتی : مەسعود محەمەد ، نەسرین فەخری ، صادق بەهائەدین و نوری عەلی ئەمین . مامۆستا هەژار خۆی لە ئەندامەتی ئەم لیژنەیان دەرهاویشت بۆ مەبەسی یەکلابون لەگەڵ چالاکی لیژنەکانی‌تر کە تێیاندا ئەندام بو ، بە تایبەتی لیژنەی ئەدەب . کاری ئەم لیژنەیە درێژەکێشانی کاری لیژنەکەی پێشوترە کە ناوی (لیژنەی زمان) بو ، چی لێرەدا دەیخوێنیتەوە بەرهەمی دوو لیژنەی یەك لە دوا یەکی (لیژنەی زمان) و (لیژنەی زمان و زانستەکانی)یە لەو رۆژەوە کە کەوتنە سەر کاری سەربەخۆیانەوە .

لیژنەکانی سەر بەزمانەوە لە سەرەتاکانی خەریك بونیانەوە بەزمان رێنوس و رێزمانیان تێك بەستبو ، واتە چارەسەرکردنی گیروگرفتی رێنوس و دۆزینەوەی دەستورەکانی رێزمانیان لە هەمان کاتدا دەست تێوەردەدا ، لەمەشدا ئەم راستییەیان رەچاو کردبو کە بەشێکی زۆری چۆنیەتی نوسینی وشە و کەرتەکانی ئاخاوتن بەندە بە دۆزینەوەی ئەو دەستورانەی رێزمان کە دیار دەدەن تەرکیبی وشە و رستە چۆنە و لە چیەوە هاتوە و کامی بە کامیەوە لە نوسیندا بلکێ وەیا نەلکێ . بەڵام زوبەزو دەرکەوت بەستنەوەی دانانی رێنوس بە دەرهێنانی دەستورەکانی رێزمانەوە لەگەڵ پێویستی خێراکردن لە دانانی رێنوسێکی یەکگرتو ناگونجێ ، چونکە فەرمانی رێزمان کارێکی نەفەس‌درێژ و بەرفرەوانە ، لەوانەیە چەند ساڵ تێپەڕێ بەر لەوە لیژنە

وەیا تاك لێی ببێتەوە لە کاتێکدا گیروگرفتی ڕێنوسی کوردی لە کوردستانی عیراقدا پێویستی بە چارەسەرکردنێکی خێرا و سەربەخۆ هەیە بەڵکو بتوانرێ یەك شێوە ڕێنوس بکرێ بە دەستوری گشتی بۆ هەمو لایەنێك و هەمو نوسەران . ئەم تێبینییە وای کرد لیژنەکانی ڕێزمان خۆ بدزنەوە لە گیروگرفتی ڕێنوس و یەکلا بنەوە بۆ تۆژینەوە لە ڕێزمان .

کاری ئەم لیژنەیەی (زمان و زانستەکانی) کە درێژەکێشانی کاری (لیژنەی زمان)ە بۆ ئامانجێکی دیارکراو بوە لە لایەن کۆڕی زانیاری کوردەوە ، کە بریتییە لە ڕێکخستنی پوختەیێکی ئەوتۆی ڕێزمانی کوردی دەست بدا بۆ خوێندن لە پلە هەڵکشیوەکانی فێرگەکانی ڕەسمی و کۆلێجەکان ، مەبەس ئەوە نەبوە لە تۆژینەوەیدا قوڵ بێتەوە بۆ بنج و بناوانی زمانی کوردی کە سەر دەکێشێتەوە سەر لێکۆڵینەوەی مێژوی زمان و خەریك بون بە فلانەتیکەوە سەرەڕای گەیاندنەوە یەکتری زارە جوداکانی کوردی لە ناوچەیێکەوە بۆ ناوچەیێکی تری کوردستانی گەورە .

لیژنە لە خەریك بونی بە باسەکانی ڕێزمانەوە ویستویەتی هەرجارە چاوێك بە بیروباوەڕی زمانزانانی کوردیدا بخشێنێ و بەراوردێکیش بکا لە نێوانی زمانی کوردی و ئەو زمانانەی کە ڕێزمانەکانیان بەلای کوردەوارییەوە نەختێك ئاشنایە . بۆ ئەم ئامانجە تا لەتوانایدا بوبێت سەرەتای لێکۆڵینەوەکانی بە هێنانەوەی ئەو بیروباوەڕانە و دەستوری ئەوان زمانانە دەست پێکردوە ، بەڵام

هەندێ هۆی کە سەردەکێشێتەوە سەر ناچاری و دەست نەرۆیشتن :
لیژنە خاوەنی زۆر و کتێبخانە و ئەرشیفی تایبەتی خۆی نیە بتوانێ
سەرچاوەی ئەو بەراوردکردنانە ، کە کتێبەکانی رێزمانی کوردی و
هی زمانەکانی بێگانەیە ، هەمیشەکات بەردەست بکات . هەر یەکێك
لە ئەندامەکانی ، وەك کتێبخانەیێکی بچووکی گەڕۆك ، هەرجارە
چ کتێبێکی رێزمانی لا هەبێ بۆ کۆبوونەوەی لیژنە لەگەڵ خۆی
دەیهێنێ . لەم هاتوچۆیەشدا زۆر جاران وا دەبێ کتێب بزر دەبێ و
جێ گریشی نیە بێتەوە جێی یاخود بە درەنگەوە جێگر پەیدا دەبێتەوە ،
ئیتر لە کۆبوونەوەکانی دواتردا کەلێنی ئەو کتێبە بزربوانە دەردەکەوێت
تا رۆژێك کە کتێبی تازە لە لایێکەوە بەردەستی لیژنە دەکەوێت .
واش دەبێ یەکێك لە ئەندامانی لیژنە ناتوانێ لە کۆبوونەوەیێك ، وەیا
زیاتر ، ئامادە بێت ئیتر بە خۆی و بەو کتێبە رێزمانییەی کە هەیەتی
لە لیژنە دادەبڕێ و بایی ئەو سەرچاوەیەی کە لایەتی کەلێن دەکەوێتە
تۆژینەوەی ئەو کۆبوونەوەیە و پڕکردنەوەشی دەبێتە فەرمانی دوارۆژ .
سەرەڕای ئەمانە گۆڕانی ئەندامان لە دامەزراندنی لیژنەی تازەدا وا
دەکا ئەو کتێبەی کە لە هەوەڵەوە لەبەر دەستی لیژنەدا بوو نەکەوێتەوە
بەر دەستی بە هۆی لێکەوتنی خاوەنی کتێبەکە لە ئەندامەتی لیژنەی
نوێ . بە نموونەی رۆن کردنەوە دەڵێم تاکە نوسخەی کتێبێکی رێزمانی
مامۆستا تۆفیق وەهبی کە دەستی لیژنەی بەسەر رادەگات ئەو
دەستنووسەیە کە لای د. نەسرین فەخری هەیە و خۆی شکڵ نووسی
کردوە لە بەر کتێبەکە ، دەوجا چەندێکی د. نەسرین لە کۆبوونەوەی

لیژنه دابڕابێت کتێبەکەی مامۆستا وەهبیش نادیار بوە . وا چاوەڕوان دەکرێت ئەم کەموکەسرییە لە کەرستەی دیراســـە و باری لەبار بـــۆ چالاکی لیژنە ، بە تەواو بڕۆنی خانوی تازەی کۆڕ بەسەر بچێ لەو ڕووەوە کە مەودای بەرفرەوانتر و جێـگە و ژێـگەی رێـکوپێـکتر و کتێبخانەی دەوڵەمەندتر بۆ لیژنە پەیدا بێت .

لێرەدا پێویست دەبینم بارێـکی گرنگی‌تری چۆنیەتی کاری لیژنە و شـێوازی توێژینەوەی لە ڕێزماندا ڕوَن کەمەوە :

لیژنە وای بە چاك زانی نەخشەیێـکی گشـتی بۆ لێـکوڵینەوەکانی بکـێشێت تاکو پـێ بە پـێ و هەنگاو بە هەنـگاو و لە چارچێوەی ئەو نەخشەیەدا بەرەوپێشەوە بڕوا بۆ ناو باسەکانی ڕێزمانی کوردی . لەم ڕێبازەدا شێوازی کلاسیکی توێژینەوەی زمانی تێـکەڵ کرد لەگەڵ شێوازێـکی مەیلەو خۆکرددا : بڕیاری دا لە سەرەتاوە کەرت و بەشەکانی ئاخاوتنی کوردی دەســت‌نیشان بکات و بەپێی باوەڕی خۆی لێیانەوە بدوێت و ناو و زاراوەیان بۆ دابنێت ، بەدوا ئەوەدا بکەوێتە ســەر لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی دروست کردنی رســتە و داڕشتنی گوتە لە زمانی کوردی‌دا . لە تێـکڕای دانانی نەخشە و بەســـەردا ڕۆیشتنی ، ئەوەشی ڕەچاو کرد کە نیگای خۆی ببڕێتە ســـروشت و تایبەتی ئاخاوتنی کوردی نەك لە کولانەی ڕێزمانی ئاخاوتنەکانی بێگانەوە سەیری زمانی کوردی بکات ، واتە لە بەر تێشکی ناوەکی سەلیقەی کوردی‌دا ڕێزمانەکە شـــی کاتەوە نەك لە دەرەوەڕا چرای بـــۆ بخوازێتەوە . لە پێك‌هێنانی ئەم مەبەستەش‌دا بە درێژایی کات دەبڕ ســەقافەتی جـودا

جودای هەر چوار پێنج ئەندامەکانی لیژنە بێتەوە سەر یەك شەقامەڕێی تۆژینەوە ، قەناعەتەکانی تایبەتی ئەندامەکانیش بەلاوە بنرێ بۆ ئیحتیمالی دۆزینەوەی راستییێکی تازە و شرایەوە لە رێزمانی کوردییدا . هەرچەند ئەم خۆلەبیرکردنە کارێکی زەحمەت بوە و هەمیو جاران لە توانادا نەبوە ، بەلام لە بەشی هەرەزۆری تۆژینەوەکان هەوڵ دراوە بیروباوەڕی هەمیو ئەندامەکان لەسەر یەك رای کۆبێتەوە چەنداوەکیو ئەم هەوڵدانە داخوازیی دەمەتەقە و کێشەیێکی دوور و درێژیشی کردبێ . کە بێیت و سەیری (محضر)ی کۆبونەوەکانی لیژنە بکەیت دەبینی وا بوە چەند کۆبونەوەیێك تێپەڕیوە بێ ئەوە چ مەودایێکی ئەوتۆ بڕابێ لە تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەدا کە لەگەڵ درێژ خایاندنی ئەو دەمەتەقانە بکونجێت ، چونکە هەوڵ دانی بێ وچان بۆ گەیشتن بە بیروباوەڕێکی یەکگرتیو لیژنەی لە بزوتنەوە خستوە . هەندێ جار نەگونجانی رای ئەندامانی لیژنە گەیشتوەتە رادەیێك وا پەسند دیتراوە لیژنە دەستی خۆی لە تۆژینەوەی شوێنی رێك نەکەوتنەکە بکێشێتەوە و گرفتەکە بخاتەوە بەر چاوی ئەنجومەنی کۆڕ تاکو ئەو بەپێی دەسەلاتی خۆی بڕیار بەسەر شتێکدا بدات ، بەلام هەمیو جاران لە حاڵی وەهادا کۆڕ گرفتەکەی بۆ لیژنە گێڕاوەتەوە بێ ئەوە هیچی لێوە بڵێ لەو روەوە کە وا تاکیو کۆتایی کاری لیژنە ، هەرچی هەبێ سەر بەتۆژینەوە لە رێزماندا ، بەجێ بهێڵرێ بۆ لیژنەکە خۆی نەکا بەرهەمەکەی ببێتە مزاش وەیا وەك دەغڵی هەڕەمەی لێ بێت . لەمەڕا دەردەکەوێت ئەوپەڕی دیمۆکراسی لە دەربڕینی بیروباوەڕ و شێوازی کاری لیژنەدا بەکار هاتوە و لە هیچ لایێکەوە هیچ شتێك بەسەریدا

نەسەپێنراوە .

لێکۆڵینەوەکانی لیژنە ، لە ماوەی رابردوودا ، کەڵاڵەیێکە پێویستی بە رێکخستن و پوختە کردن هەیە بۆ ئەوە ببێتە بەرهەمێکی شایان بە بڵاو کردنەوە و شکڵی کتێبی رێزمان وەرگرێ . لیژنە بە ئومێد بوو لە پاش تەواو کردنی هەموو باسەکە جارێکی تر بەسەریدا بێتەوە و کەلەبەرەکانی پڕ کاتەوە و ناڕێکیەکانی لەبار کاتەوە ئەوسا بیخاتە بەر چاوی ئەنجومەنی کۆڕەوە تاکوو ئەویش بۆ دواجار دەسبژارێکی بکا و بڕیار لەسەر راست و هەڵەی بدا ئەوجا لە شکڵی کتێب وەیا چەند گوتارێك لە گۆڤارەکەیدا بڵاو بکرێتەوە . بەڵام وا دیارە دیوانی سەرۆکایەتی بەرژەوەندی لەوەدا دیت بەرهەمەکە خێراتر بخرێتە بەر چاوی خوێنەری کوردییەوە بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندن و رەخنە لێ گرتنی . ئەم خێرایی کردنە بوە هۆی مانەوەی جوداوازیی بیروڕای ئەندامانی لیژنە وەك کە هەبوو ، چونکە وەك گوترا ئەنجومەنی کۆڕ جارێ بڕیاری لەسەر هیچ راییێکیان نەداوە تا بیکاتە ئەو دەستوورە کە خۆی رای لێیە و وەك پێش نیاری کۆڕ بیخاتە بازاڕی نرخاندن و رەخنەی خوێنەرانەوە . لێرەدا بیروباوەڕی ئەندامانی لیژنە لە سەر حاڵی کەڵاڵەیی ماوەتەوە بێ هیچ بژار کردن و سازدان و رێکخستن ، کەس لە لاوە دەستێکی پوختە کردنی بۆ ئەم کەڵاڵەیە نەبردوە .

ماوەتەوە بڵێم لیژنە لە پێشەوە چ بڕیارێکی سەرەتایی نەدا لە بارەی چەند بوونی بەشەکانی زمانی کوردییەوە ، ئەم چەند بوونە درایە

بەر حوکمی تۆژینەوە لە زمانەکەدا جا زۆر بێ یاکەم . لەم مەیدانەدا تەنها ئەوەندەی کرد کە دەست بکا بەو بەشانەی چ گومان نیە لە بۆنیان و سەربەخۆیی‌یان و لە هەمۆ زماناندا بە بەشێکی سەربەخۆی ئاخاوتن ژمێرراون بۆیەیە راستەوخۆ لە پێشەوە یەخەگیری بەشی ( ناو ) و تاقمەکەی بۆ .

مقـرر ( دەمڕاست )ی لیژنە

مەسعود محەمەد

* * * * * *

## ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی

## بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی «زمان و زانستەکانی»

# بەشەکانی ئاخاوتن

# ١ - ناو

ناو ئەو وشەیەیە سەربەخۆ واتایەك دەگەیەنێت کە بە کاتەوە نەبەستراوە ، وەك : کاوە ، ساڵ ، بەرد ، پیاوەتی ، هەولێر ، ڕۆیشتن ، گوڵ ، پەپولە ، فڕۆك ، بەستەڵەك ، هەڵپەڕکێ ، تێهەڵکێشان .

[ تێبینی و ڕوون کردنەوە :

کە دەگوترێ ( بە کاتەوە نەبەستراوە ) بۆیەیە هەتا کتوو ناوەکانی ( ظرف زمان ) وەك ڕۆژ ، شەو ، ساڵ ، مانگ ، سات ، کات .. هتد بەر ئەم تەعریفە بکەون و نەچنە ناو تەعریفی کار ( فعل )ەوە ، چونکە لەو ناوانەدا ( کات ) ناوەرۆکی وشەکانە نەك پێیانەوە بەستراوە . لە عەرەبیدا دەڵێن ( غیر مقترن بالازمنة الثلاثة ) ، واتای ئەو ( اقترانه )ی عەرەبی بەسترانەوەکەی کوردییە لەم تەعریفەدا .

دەمڕاستی لیژنە ]

ناو لە دوَ ڕووەوە باس دەکرێت :

١ـ لە ڕوَی پێکهاتنەوە .

٢ـ لە ڕوَی واتاوە .

یەکەم ـ ناو لە ڕوَی پێکهاتنەوە دەکرێت بە دوَ بەشەوە :

١ـ سادە

٢ـ ناسادە : سادەش دەبێتە دوَ بەش :

أ ـ لێکدراو

ب ـ داڕێژراو

١ـ ســادە : هەتا ئێستا بۆ ئەم زاراوەیە ئەم وشانە دانراون .

١ـ سەعید صدق ( تەنیا )ی بەکارهێناوە .

٢ـ توفیـق وەهبی ( ســـادە )ی لە فەرهەنگە ئینگلیزیەکەیدا بەکارهێناوە .

٣ـ مەردۆخ ( سادە )ی لە فەرهەرەنگەکەیدا بەکارهێناوە .

٤ـ شێخ محمدی خاڵ ( سادە )ی لە فەرهەنگەکەیدا بەکارهێناوە .

٥ـ کوردوییێف ( ئاسان )ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکارهێناوە .

٦ـ ڕشیدێی کورد ( خوڕی )ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکارهێناوە .

٧ـ جگەرخوێن ( سادە )ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکارهێناوە .

٨ـ نوری علی أمین ( پەتی )ی لە ڕێزمانەکەیدا بەکارهێناوە .

٩ـ هەژار وا پێشنیار دەکات کە وشەی ( ساکار ) بەکاربهێنرێت .

پێناسینی ( تعریف ) ناوی ســاده :

لیژنه بۆ دۆزینەوەی تەعریفێکی تەواو دوَر و قوڵ لەم باسـه کۆڵیەوە و ئەو تەعریفانەی کە لەمەوبەر بۆی دانراوە هێنایەوە بەر چاو :

ســەعید صدقی دەڵێت : اسمێکە اسمێکی تری لەگەڵا نەبێ ، وەکو ( علی ، مراد ، شار ، بازاڕ ) .

مەردۆخ دەڵێت : ناوی ســاده لە یەك واژە دروس بوگە ، وەك دەرز ، کێو ، قورسی ، بلبل .

زوربەی نوسەرانی‌تر هەر ئەو تەعریفەی بۆ ناویان دانــاوە کردوَیانەتە تەعریف بۆ ناوی سادە ، دوایی تەعریفێکی ســەربەخۆیان هێناوەتەوە بۆ ناوی لێــکدراو .

لیژنە بە دوا ئەم چاو پێداخشاندنە بەو تەعریفانەدا کەوتە سەر لێــکۆڵینەوە لە تەواوی و ناتەواوی تەعریفەکان لە بەر تیشکی واتای ( سادە ) خۆیدا . هەریەك لە ئەندامەکان رای تایبەتی خۆی دەربڕی ، لە ئەنجامی بەراوردکردنی هەمو لایەنێکی باسەکە و رایەکان لیژنە ئەم تەعریفەی پەسند کرد :

ناوی سادە ئەو ناوەیە کە لە تەنیا وشەیێك پێكهاتبێت ، وەك :

بەرد ، با ، مرۆف ، دەشت ، رەك ، مەڕ ، گۆشت .

[ تێبینی و ڕوون کردنەوە :

سادەبوونی ئەم وشانە لە ڕواڵەتی ئێستاکەیانەوە دەفامرێتەوە ، لیژنەش هەر ئەم ڕواڵەتەی کردوە بە بنکەی بڕیاری سادەبوونیان . توێژینەوەی لیژنە بەرەو سەرچاوەی وشەکانی فەرهەنگی کوردی تێهەڵنا کشێت تا کوو هەموو وشەیێك بباتەوە سەر بنجی مێژوویی خۆی و سادەیی و ناسادەییان دەر خات . ئاشکراشە ئەم وشانەی لە ڕواڵەتی ئێستاکەیاندا بە سادە دەژمێررێن هەر بە سادەیی دەمێننەوە هەرچەند توێژینەوەی مێژوویی ناسادەییشیان بسەپێنێ چونکە کەس نایێ لە نووسیندا بە شکڵی ناسادەیان بە کار بێنێ وەیا لە وتوویێژدا بە غەیری جۆری ئێستایان بڵێتەوە . کە بێین و ئەو وشانەی ئێستا بە سادە دەناسرێن هەڵیان وەشێنینەوە وەك ئەوەی « کلۆج » بکەینەوە « کل وجە » ، ئاخاوتنی کوردیمان دەگۆڕێت بەرەو ناقۆلایی و دزێویەوە کە ئەمە کارێکە دژی هەموو بەرژەوەندێکی زمانی کوردی .

دەمڕاستی لیژنە ]

٢ـ ناسادە : هەتا ئێستا بۆ ئەم زاراوەیە ئەم وشانە بەکارهێنراون :

١ـ سەعید صدقی ( تێکەڵ ) .
٢ـ توفیق وەهبی ( لێکدراو ) .
٣ـ مەردۆخ ( پەیوەست ) .
٤ـ کوردوییێف ( بارگران ) .

٥ـ نوري علي امين ( ئاوێته ) .
٦ـ رشیدی کورد ( لێکدائی ) .
٧ـ جگەرخوێن ( پەرچەم ) .

پێناسینی ناوی ناسادە :

لێرەنە بۆ دۆزینەوەی تەعریفێکی تەواو دوور و قووڵ لەم باسە کۆڵیەوە و ئەو تەعریفانەی کە لەمەوبەر بۆیدانران هێنانیەوە بەر چاو ، وەك :

سەعید صدقی دەڵێت : اسمی مرکب اسمیکه اسمی تری لەگەڵدا بێت وەکو علي مراد ، شاربازێر .

مەردۆخ دەڵێت : ناو پەیوەس ئەو ناوەس یا لە دو واژە یا زیاتر دروس بوکە ، وەك خداداگ ، باخەوان ، خۆرەتاو ، کولاو .

کوردوییێف ناوی لێکدراو دەکا بە دوبەشەوە ، بەشێکیان بە یاریدەی ناو و ئاوەڵناو هتد ... پێك دێت یا ئەوانەن کە بە بۆنەی پێشکر و پاشکرەوە پێك دێن .

نوري علي أمين لە ڕێزمانی کوردیدا دەڵێت . وشەی لێکدراو ئەو واژەیەیە کە لە دو وشە یا پترپێك هاتبێت ، وەك : مێرگەسور ، مارماسی ، بەرداش .

لە دەستوری زمانی فارسیدا دەڵێت : ناوی لێکدراو ئەو ناوەیە کە خاوەنی دو پارچە بێت ، وە هەر پارچەیەیان واتایەکی جودای

هەبێت و بە هەردوَکیان ببنە ناوێك ، وەك کەروێشك .

لیژنە دوای هەڵسەنگاندنی ئەم تەعریفانە ، هیچ کامێـکیانی پەسند نەکرد و کەوتە سـەر ورد بوَنەوە و لێکوَڵینەوە بوَ ئەوەی بکات بە تەعریفێـکی دروست .

لە هەمان کاتدا لیژنە کەوتە سەر لێدانەوە لەوە ئاخوَ دابەش کردنی ( ناو ـ یاخود وشە بە جوَرێـکی گشتی ) لە سەرەتاوە بکرێ بە دوَ بەشەوە :

١ـ سادە .

٢ـ ناسادە .

ئەوجا ناسادە بکرێتەوە بە :

١ـ لێـکدراو .

٢ـ داڕێژراو .

یاخود یەکسەر ناو لە روَی فوَرمەوە بکرێ بە سێ بەشەوە :

١ـ سادە .

٢ـ لێـکدراو .

٣ـ داڕێژراو .

لە کاتی دەمەتەقە لە سەر ئەم پرسیارە پێشنیارێـکی سێیەم هاتە ناو ئاخاوتنەوە بوَ ئەوە ناو بـکرێ بـە دوَ بەشەوە :

١ـ سادە ٢ـ ناسادە بۆ ئەوە ناسادە دابەش بکرێتەوە بۆ : (لێکدراو ، داڕێژراو) .

دوای ئەم موناقەشانە لیژنە کەوتە سەر هەڵبژاردنی یەکێک لەو دابەش کردنانە : د. نەسرین فەخری و نوری عەلی ئەمین پەسندیان کرد کە ناو لە سەرەتاوە بکرێ بە سێ بەشەوە :

١ـ سادە ، ٢ـ لێکدراو ٣ـ داڕێژراو ـ دروستکراو ـ بۆ ئەوە ناوی ناسادە بێتە ناوەوە .

مەسعود محمد ، هەژار و صادق بەهائەدین لەو باوەڕەدا بوون ناو لە سەرەتاوە بکرێت بە ١ـ سادە ٢ـ ناسادە . ناسادەش بکرێ بە ١ـ لێکدراو ٢ـ داڕێژراو .

لیژنە پەیڕەوی رای زۆرینەی ئەندامانی کرد و بڕیاریدا لە نوسینەکانیدا ناو بکا بە ١ـ سادە ٢ـ ناسادە . ئەوجا کەوتەوە سەر لێکۆڵینەوەی باسەکە .

١ـ ناوی سادە . لیژنە ئەم تەعریفەی پەسند کرد بۆ ناوی سادە :

« ئەو ناوەیە لە وشەیێك و زیادی پێك هاتبێت ئەوجا زیادیەکە وشە بێت یا ئامراز یا پێشگر یا پاشگر یا هەر شتێکی تر » .

ئەم تەعریفە بۆیە پەسند کرا چونکە هەموو جۆرەکانی ناسادە (لێکدراو و داڕێژراو) دەگرێتەوە ، وەك :

مارماسی ، بەردەنوێژ ، بنبەردەقیلە .

ئەوجا ناوی ناسادەش دوَ جۆرە :

١ـ لێکدراو : ئەو ناوەیە کە وا بە لانی کەمەوە دوَ وشەی واتاداری تێدا بێت ، وەك : دڵشاد ، کەومار ، روَپاك ، شەولەبان ، کوڵەکەنم ، شەکرەسێو ، باگردێن .

٢ـ داڕێژراو : ئەو ناوە ناسادەیە کە تەنیا وشەیێکی واتاداری تێدا بێت ، وەك : داسوَلکە ، پیاوەتی ، ملوانکە ، هەڵکەوت ، داهات .

[ تێبینی و روَن کردنەوە

لە تەعریفی ناوی داڕێژراودا کە گوترا (تەنیا وشەیێکی واتاداری تێدا بێت) و باسی پێویستی بوَنی (زیادە)ی تێدا نەکرا بۆیەیە چونکە لە سەرەتای تەعریفەکەوە گوترا (داڕێژراو ئەو ناوە ناسادەیە . ) لە ناسادەشدا بوَنی (زیادی) مەرجە ، ئیتر پێویست نامێنێ بە باس کردن و مەرج گرتنی بوَنی زیادەکە دەنا دەبێتە (تحصیل حاصل) .

دەمڕاستی لیژنە ]

دووەم ـ ناو لە روَی واتاوە :

لەپێشەوە نمایشێکی ئەو دابەشکردنانە دەکەین کە لەمەوبەر لە لایەن زمانەوانەکانی کوردییەوە بۆ (ناو) لە روَیمەعناوە دانراون :

١ـ مامۆستا سەعید صدقی ، هیــچ جیاوازی لە میانی فۆرم و واتای ناوەوە دەرنەخستوە تەنیا لە ڕێبازێکی ترەوە بۆ باس کردنی ناو چوە ، ناوی کردوە بە دوَ بەشەوە . .

آ ـ ناوی عام

ب ـ ناوی خاص

٢ـ مەردۆخ ، ناوی لە روَی مەعناوە کردوە بەم بەشانەوە :

١ ـ ناوی شـخصی . رۆستەم
٢ ـ ناوی جـــع . گـەل
٣ ـ ناوی نـوع . ئەسپ
٤ ـ ناوی جنـس . گیاندار
٥ ـ ناوی زمان . دوێنێ
٦ ـ ناوی مـکان . کوردستان
٧ ـ ناوی صوت . باڕە
٨ ـ ناوی لون . سوَر
٩ ـ ناوی عدد . چوار
١٠ـ اسمی صفة . پانی
١١ـ اسمی طعم . تاڵی
١٢ـ اسمی مصدر . بوَن ، چوَن
١٣ـ اسمی فاعـل . بڕ ، بکوژ
١٤ـ اسمی مفعول . فرۆشیاگ (فرۆشـیاو)

١٥ـ صیغەی مبالغه . گرینۆك
١٦ـ صفەی مشبه . درێژ ، کۆتا
١٧ـ اسمی معنی . هۆش .
١٨ـ اسمی ضمیر ئێمه .
١٩ـ اسمی اشاره . ئـەم
٢٠ـ اسمی کنایه . ( فلاّن ، فیسار . . . )

٣ـ مامۆستا خاڵ . ناو دەکات بە دوَ بەشەوە لە فەرهەنگەکەیدا :

١ ـ عام ( تێکڕا ) ، وەك : دار ، بەرد ، پیاو .
٢ ـ خاص ( تایبەتی ) ، وەك : نەریمان ، کرماشان .

٤ـ نوری علی لە رێزمانەکەیدا ( بەرگی دوەم ) ، ناو لەروَی مەعناوە دەکات بەم بەشـانەوە :

١ ـ ناوی تایبەتی : شـاسوار
٢ ـ ناوی گشتی : شـار
٣ ـ ناوی مادی : دەرگا ، زێڕ
٤ ـ ناوی مەعنەوی : ئازایی ، بەختیاری
٥ ـ ناوی تاك : منداڵ
٦ ـ ناوی گەل : مەڕان ( ئەم مەڕانە )

٥ـ کتێبی دەسـتوری زمـانی فارسی بۆ پۆلی یـەکەمی

ناوەندی ، ناوی لە ڕوَی مەعناوە کردوە بە شەش بەشەوە :

١ـ اسمی عام
٢ـ اسمی خاص
٣ـ اسمی ذات
٤ـ اسمی معنی
٥ـ اسمی مفرد
٦ـ اسمی جمع

٦ـ لە ڕێزمانی ئینگلیزیدا ( ئەمە بۆ نموونە لە زمانەکانی ڕۆژاوا تا کو ڕوَنبێتەوە لەو زمانانەشـدا ناو لە ڕوَی واتاوە دەکرێت بە چەند بەشەوە ) کراوە بەم بەشانەی خوارەوە :

| | |
|---|---|
| ١ـ الاسم العام | Common Noun |
| ٢ـ الاسم المعنوی | Abstract Noun |
| ٣ـ الاسم المادی | Concrete Noun |
| ٤ـ اسم العلم | Proper Noun |
| ٥ـ اسم الجمع ( الجنس ) | Collective Noun |

پاش نمایش و بەراوردکردنیان لەگەڵ زمانی کوردیدا ، نـاو کرا یە سێ بەشەوە :

١ـ ناو لە ڕوَی ( مفهوم ، مضمون ) پەراوێزەوە ، واتە چەند تاکان دەگرێتەوە ، ئەمیش دەکرێت بە سێ بەشەوە :

١ـ ناوی گشتی (عام): مەڕ ، کوڕ ، شار .
٢ـ ناوی تایبەتی (خاص ، علم) : هەڵەبجە ، نەسرین ، تانجەرۆ .
٣ـ ناوی کۆمەڵ (اسم الجمع) : لەشکر ، پۆل ، گەل .

٢ـ ناو لە رۆی زایەندەوە[1] (جنسەوە) . ئەمیش دەکرێت بە چوار بەشەوە :

١ـ ناوی نێرینە : ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ زایەندی نێر دانرابێت ، وەك پیاو ، ئەسپ ، کەڵەشێر ، پیرۆت ، بەران .

٢ـ ناوی مێیینە : ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا هەر بۆ زایەندی مێ دانرابێت ، وەك مایین ، پۆر ، مریشك ، کچ ، چێڵ ، مەڕ ، ژن .

٣ـ ناوی دوَ لایەن (دوَ زایەند) : ئەو ناوەیە کە بۆ نێر و مێ بەکار دێت ، وەك : کەو ، کیسك ، وەستا ، شاگرد ، کاوڕ ، بەرگدروَ ، دۆست ، دوژمن .

هەندێ جار ناوی دوَلایەن (دوَزایەند) لە رێی بەکارهێنانی وشەیێکەوە لە گەڵیدا ، بە لایەکدا دەخرێت و زایەندی بۆ دیار دەکرێت وەك :

---

(١) وشەی (زایەند) بە واتای (جنس ، Gender) جەلادەت بەدرخان بە کاری هێناوە بە دوا ئەودا رەشید کورد و نوسەوانیتریش بەکاریان هێناوە .

| ناوی دوو لایەن | بۆ نێرینە | بۆ مێیینە |
| --- | --- | --- |
| کیسك | کیسکە نێر | کیسکە مێ |
| سەگ | گۆڵەسەگ | دێڵەسەگ |
| گاو | نێرەگاو | ماگاو |

٤ـ ناوی بێلایەن ( بێزایەند ) : ئەو ناوەیە کە لە بنەڕەتدا زایەندی نێر و مێی نیە ، وەك : دار ، خانوو ، هاوار ، نوێن ، ڕۆیشتن ، خورتی ، خواردەمەنی .

تێبینی : لە شێوەی ژوورودا ( کرمانجی ) هەموو نـاو بە ئیزافە کردنی ئامرازی نێر و مێ لە یەکتر جیاواز دەکرێنەوە ، وەك :

هەوارا دوی گورگی ( مێیینە )

ســـەرێ مەزن ( نێرینە )

وشەی ( دار ) ئەگـەر وشك بوو ( نێر )ە ، وەك دارێ گوێزێ ، ئەگـەر سەوزبوو ( مێ )یە ، وەك دارا گوێزێ .

هەروەها لە شێوەی خوارووشدا ، بە تـایبەتی خۆشـــناو و باڵەکانی ، لە بانـگ هێشتن و ئیزافەدا وەك شێوەی ژوورو جیـاوازی لە نێر و مێدا هەیە . جـگە لەوانەش لە شێوەی سلیمانی و هەولێر و کۆیە و موکریانیشدا لە بانـگ هێشتندا جیاوازی نێر و مێ هـەیە ، وەك :

پۆرلی وەرە (لی)
کوڕە مەڕۆ (ە)

٣ـ ناو لە ڕوی سەربەخۆیی هەبونەوە : دەکرێ بە دو بەشەوە :

١ـ ناوی مادی : هەندێ لە رێزمانەکان بەم جۆرە تەعریفیان کردوە .

آ ـ رێزمانەکانی کوردی[٢] : وشەی ( بەرجەستە )یان بۆزاراوەکە بەکار هێناوە ، بەم جۆرەش تەعریفیان کردوە ( ئەو ناوەیە کە قەوارەیەکی هەیە و بەر دەست و بەرچاو ، واتە دەگیرێت و دەبینرێت ، وەك ماست ، بەفر ، دەرگا ، گۆشت ... ) .

ب ـ رێزمانی فارسی دەبێژێت : اسمی ذات (مادی) ناوی شتێکە کە خۆی لە خۆیدا وجودی هەیە ، وەك درەخت ، ئاو ، هەوا ، تەهران .

ج ـ رێزمانی ئینگلیزی دەڵێت : ناوی مادی ئەو ناوەیە کە وجودی هەیە و دەگیرێت ، وەك پەنیر ، شیر ، زێڕ ، ئاسن .
بەڵام لیژنە بەم جۆرە تەعریفی ناوی (مادی) کرد :

ناوی ئەو شتەیە کە بەر هەست دەکەوێت ، وەك خوێ ، کەرە ، زێڕ ، شیر ، با ، دەنگ ، بۆن ، تریفە ، بروسکە ، ئاورنگ ، قەل ، مرۆڤ .

(٢) قوتابخانەکان

[ئەم تەعریفە هەمتو ئەو ناوە مادییانە دەگرێتەوە کە چاو نای بینی وەیا دەست نای گرێ ، چونکە بەر هەستێکی تر دەکەوێت وەك (دەنگ) .

دەمڕاستی لیژنە]

٢ـ ناوی معنوی (گوزارە) :

١ـ ڕێزمانەکانی کوردی[٣] زاراوەی (واتایی) بۆ بەکار هێناوە ، بەم جۆرەش تەعریفی کردوە : (ئەو ناوەیە کە نابینرێت و ناگیرێت بەڵام بە ئەندێشە لە دڵدا وێنەی بۆ دەکێشرێت و هەستی پێ دەکرێت ، وەك کوردایەتی ، باوەڕ ، شەرم ، زانین ...)

٢ـ مەردوخ ، تەنیا ئەوەندە دەڵێت (بۆ ناسینی گوزارە دانراوە ، وەك هۆش ، زانست ، جەنگ ، بڕستی) .

٣ـ لە ڕێزمانی ئینگلیزیدا بەم جۆرە تەعریفی ناوی مەعنەوی (مجرد) ـ Abstract Noun ـ کراوە .

« ئەو واژەیەیە کە حاڵێکی موعەیەن وەك (نەخۆشی) یاخود چۆنیەتێکی تایبەتی وەك (جوانی) رادەگەیەنێت و بە دەست ناگیرێت و بە بیر و خەیاڵدا دێت وەك : ڕەشایی ، تاریکی ، بەختیاری ، نەخۆشی ، پیاوەتی ، هێز » .

---

(٣) قوتابخانەکان

٤ـ لە ڕێزمانی فارسی‌دا ئەم تەعریفەیان بۆ داناوە : ناوی مەعنا گوزارەیەك دەگەیەنێت کە وجودی لە شتی‌تردایە و ناوی حاڵەتێك وەیا صفەتێکە ، وەك : هۆش ، ڕەشایی ، ستەم ، خەم ، نەخۆشی ، دەست‌کورتی .

لیژنە ویستی بە پێی باوەڕی خۆی تەعریفێکی باشتر و گونجاوتر لەگەڵ واتای ( ناوی گوزارە ـ معنی ـ مجرد ) دا بدۆزێتەوە . دوای بەلاوە نانی گەلێك پێشنیار ئەم تەعریفەی پەسند کرد : ناوی گوزارە ناوی شتێکە کە بوونی سەربەخۆی نیە بەڵکو لە شتی بەرهەست وەیا لە بیر و خەیاڵ ( تصور ) دا پەیدا دەبێت وەك : پیاوەتی ، هێز ، چاکە ، جوانی ، نەخۆشی ...

[ ڕازی نەبوونی لیژنە بەو تەعریفانە ، سەرەڕای ئەوە کە تەعریفەکان هەموو ناوەکانی گوزارە ناگرنەوە ، لەوەشەوە دێت کە داڕشتنیان لە هی تەعریف ناکات کە دەبێ دەست لە سەر سروشتی تەعریف کراوەکە دانێت ، بەڵکو پتر لە هەڵنانی سنوورێك دەکات بە دەوری موفرەداتی تەعریف کراوەکەوە بەڵام هەر دوو سەری ئاڵقەی سنوورەکەش نەگەیشتبنەوە یەکتر .

مەبەس لە « هەست »یش ئەو پێنج هەستە مەشوورەکەی ( دیتن ، بیستن ، چێشتن ، بێن‌کردن و هەستی پێست ـ لمس ـ )ە ، بەو پێیە هەر شتێك بەر یەکێك وە یا پتر لەو هەستانە بکەوێت دەبێتە ناوی

مادی ، کە بەر هەستیش نەکەوت و بە بیر و خەیاڵ زانرا دەبێتـــە ناوی گوزارە .

وا دەبێ بە پێی ئەم تەعریفە هەندێك شت هەڵ بگرێ پێی بگوترێ ناوی مادی و ناوی گوزارە وەك « جەنـــگ » . ئەوەی ڕاستی بێ لە هەمو تەعریفەکاندا ئەم دوو لایی یە پەیدا دەبێ بەڵام من قســەم لەگەڵ تەعریفی لیژنەیە . بە کورتی دەڵێم هەریەك لەو ناوە دوولایی یانە کە ساغ بۆوە بەر هەستێك دەکەوێ ، دەبێتە ناوی مادی هـەرچەند بە دەست نەگیرێ وەیا قورسایی نەبێ وەیا هیچ جۆرە بونێــکی مادی نەبێ وەك ( بێن ، ڕەنـگ ) . لەم کورتەیەی قسەکەمدا دەمەوێ بڵێم کە هــات و ( بونی مادی ) کرا بە مەرج بۆ ( ناوی مادی ) ئەوسا تەعریفی لیژنە کورت دێنێ لە ئاست ئەو مەرجەدا .

دەبێ ئەوەش بزانین ئەگەر ( مادەبون ) کرا بە مەرج گەلێك جاران بڕیاردان بۆ مادە بون و نەبونی شتان کارێــکی ئاسان نابێ . بە نمونە وشـــەی ( دەنـگ ) کە دەلالەتی شتێــکی هەیە بەر هەست دەکەوێ بە پێی تەعریفی لیژنە دەبێتە ناوی مادی ، بەڵام ســـاغ کردنەوەی ( مادی بون و مادی نەبونی ) دەنـگ هـــەڵ دەگرێ دەمەتەقەی دوور و درێژی لەسەر بکرێ و هەندێك بڵێن چ وجودی مادی لە دەنـگدانیە و کەسانی تریش بڵێن چونکی دەنگ لە شەپۆل و لەرانەوەی هەوا وەیا مادەیێــکی تر پەیدا دەبێ شتێــکی ( مادی ) یە .

وا هەیە ناوێــکی گوزارە لە ناوێــکی ترەوە وەردەگیرێ کــە

ئەویش هەر گوزارەیە وەك چاوگی (ترسان) کە لە (ترس)ەوە هاتوە . لەمەدا چ دژیێك پەیدا نابێ لەگەڵ تەعریفەکەی لیژنەدا .

دەمڕاستی لیژنە ]

ناوی گوزارە لە بنەڕەتدا دوو جۆری هەیە :

١ـ بنجی : ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە هەر لە بنچینەدا بۆ گوزارە داناراون وەك : باوەڕ ، جەنگ ، هۆش ، زانین ، ترس ، مەرگ ..

٢ـ دروستکراو : ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە لە وشەیێکی ترەوە وەرگیراوە بە هۆی ئامراز وەیا داڕشتنێکی تایبەتییەوە . بە زۆریش لە ناو و ئاوەڵناوەوە وەردەگیرێت لە رێی بەکار هێنانی پاشگرەوە .

أ ـ دروستکردنی لە ناوەوە :

پیاو + ەتی = پیاوەتی
کورد + ایەتی = کوردایەتی
کوڕ + ێنی = کوڕێنی

بـ دروستکردنی لە ئاوەڵناوەوە :

جوان + ی = جوانی
رەش + ی = رەشی
رەش + ایەتی = رەشایەتی
دۆست + ی = دۆستی

دۆست + ایەتی = دۆستایەتی

خراپ + ە = خراپە

پوختەی باسی ناو ئەمەی خوارەوەیە :

یەکەم ـ ناو لە ڕوی فۆرمەوە :

آ ـ ناوی سادە .

ب ـ ناوی ناسادە :

١ ـ لێکدراو .

٢ ـ داڕێژاو ( دروستکراو ) .

دووەم ـ ناو لە ڕوی گوزارەوە :

١ـ ناوی گشتی
٢ـ ناوی تایبەتی
٣ـ ناوی کۆمەڵ
ناو لە ڕوی مفهومەوە ( ١ )

٤ـ ناوی نێر
٥ـ ناوی مێ
٦ـ ناوی دوولایەن
٧ـ ناوی بێلایەن
ناو لە ڕوی زایەندەوە ( ٢ )

٨ـ ناوی مادی
٩ـ ناوی گوزارە :
ناو لە ڕوی سەربەخۆیی هەبونەوە ( وجود مستقل ) ( ٣ )

آ - بنجی .
ب- دروستکراو .

[ ڕوَن کردنەوە :

زاراوەی ( لە ڕوَی مفهومەوە ) زاراوەییێکە لە لایەن هەندێك زمانزانانەوە بەکار هاتوە ، کە ئەندامێکی لیژنەش لەوانە ، بۆ ڕوَن کردنەوەی مەبەس بە پێی لێکدانەوەی تایبـەتی ئەو کەسانەوە . لێرەدا مەبەس لە (مفهوم) ئەوەیە ئایا تاکە ناوێك چـەند تاکی وەك خۆی دەگرێتەوە: کە گوتت (ئازاد) یەك ئازادت مەبەسە. کە گوتت (مەڕ) هـەمو تاکێـکی جینسی مەڕت مەبەسە .کە گوتت (لەشکر) تێـکڕای ئەو کەسانە و ئەو شتانەت مەبەسە کە لە واتای (لەشکر)دا هەیە . پێشتر لەگەڵ (مفهوم)دا وشەی (پەراوێز)یش بەکارهات بۆ ڕاگەیاندنی ئەم لایەنە .

دەمڕاستی لیژنە ]

## ٢ ڕاناو - ضمیر

ڕاناو لە گەلێك سـەرەوە باس دەکرێت ، پێ بە پێ لێیان دەکۆڵرێتەوە و بە پێی بیروباوەڕی لیژنە ڕوَن دەکرێنەوە :

یەکەم : ڕاناو لە ڕوَی زاراوەوە :

هەتا ئێستا نوسـەرانی کورد لە بری (ضمیر ـ Pronoun ) ئەم زاراوانەی خوارەوەیان بەکارهێناوە :

١ـ مامۆستا سەعید صدقی : زاراوەی « ضمیر »ی بەکار هێناوە و بەم شێوەیەش تەعریفی کردوە (ضمیر لفظیکە جیگای اسم دەگریت) . ضمیریش دو نوعە

١ـ ضمیری متصل ـ وەکو بە قەلەمت دەنوسم

متصلیش دەکا بە دوَ بەشەوە :

أ ـ ئاشکرا وەکو خویندم

ب ـ شارراوە وەکو نوست

٢ـ ضمیری منفصل وەکو من خویندم ، ئەو هەلستا .

مامۆستا سەعید صدقی هەر ئەمەندە لە سەر راناو دواوە ، لە هەمو روَیێکیشەوە پەیرەوی زمانی عەرەبی کردوە کە ئەوسا بۆ ئەو تاکە سەرچاوەی لێکۆلینەوە بوە .

٢ـ لە کتێبی ڕێزمانی قوتابخانەکاندا (راناو) بەکار هاتوە و بەم جۆرەش تەعریف کراوە :

راناو ئەو وێژەیەیە جێی ناوێك دەگرێت وەکو (ئەیکڕم) و دەشکرێ بەم بەشانەی خوارەوە :

١ـ راناوی کەسی ـ ئەمیش دوَ جۆرە :

أ ـ کەسی لکاو وەکو :کەی ئەڕۆیت (یت)

ب ـ کەسی جوێ وەکو : من ، ئێمە ، ئەوان . . .

راناوی خۆیی ، وکو (من خۆم هاتم) بۆ تەوکیدی ناو یا راناو بەکار دەهێنرێت .

٣ـ راناوی ئیشاری وەکو (ئەمە ، ئەوە ...)

٤ـ راناوی گەیەنەر وەکو (ئەو کچەی کە لەگەڵمدا دەڕۆیشت خوشکم بو) لەم رستەیەدا وشەی (کە) راناوەکەیە .

٥ـ راناوی پرسیاری ، وەکو : کێ ، چۆن ، چلۆن ، کوا ، کام ، کەی ، کوێ ، چی ، چما ، چەند ... هتد .

٦ـ راناوی نادیار وەکو : یەکێ ، کەس ، فلان ، فیسار ، کابرا ، هین ، هەرامە ..

٧ـ راناوی هەیی : وەکو (هی من ، هی تۆ ..) .

٣ـ مەردۆخ لە لاپەڕە (٢٠)ی بەشی یەکەمی فەرهەنگەکەیدا بۆ (ضمیر) وشەی (کێشك)ی بەکار هێناوە .

٤ـ مامۆستا توفیق وەهبی لە دەستوری زمانی کوردی ـ جزمی یەکەم بەغدا ١٩٢٩ ، لاپەڕە ٢٨دا بەمجۆرە باسی راناو دەکات ، زاراوەی (بۆناو)یشی بەکار هێناوە :

(بۆ ناوی کەسی لە گەرداندا بۆ پێشان دانی باس لێکراو لە صیغە و دەم زیاد ئەکرێن ، وەکو لە فقرە ٢٤٩دا ووتبومان ئەمانە دوو چەشنن :

١ـ بۆ ناوی کەسی سەر بەخۆ وەك (من ، ئێمە) .

٢ـ بۆ ناوی کەسی پێوەنووساو وەك (ئەوانە هاتن ـ ن ـ).

بۆناو بەم جۆرە دابەش دەبێ :

١ـ بۆناوی کەسی (من ، تۆ).
٢ـ بۆناوی ئیشاری (ئەم ، ئەمە ، ئەو ، ئەوە . .)
٣ـ بۆناوی لێکدەر (کە ، ی کە . . ئەو کەسە کە رۆیشت ، ئەو کەسەی کە ...).
٤ـ بۆناوی مبهم (یەکێ ، کەسێ ، کام ، هیچ ، کابرا ، هین . .).
٥ـ بۆناوی پرسی (کێ ، چەند ، کام ، چی ، کوێ . .).
٦ـ بۆناوی خۆیی (خۆم ـ خۆمان ، خۆت ـ خۆتان).
٧ـ بۆناوی ملکی (هی من ، هی ئێمە . .).

٥ـ مامۆستا صادق بەهائەدین لە محاضرەی خۆیدا راناوی کردوە بە (٨) بەشەوە لەمەشدا رەچاوی ئەوکتێبە گرامێرەی کوردیی کردوە کە بە شێوەی کرمانجی نوسراون :

١ـ جێناڤێت کەسی { أز ، توو ، ئەو / ئەم ، هین ، ئەو } بۆ رستەی خاوەن کاری تێنەپەڕ.

{ من ، تە ، وێ ـ وی / مە ، وە ، وان } بۆ رستەی کاری تێپەڕ.

٢ـ جێناڤێت هەیی : یێ من ، یامن ، یێن من.

٣ـ جێناڤێت خۆیی : خۆ.

٤ـ جێناڤیت نیشانی : ڤی ، ڤێ ، ڤان ، وی ، وێ ، وان ، ئەف ـ ئەو ، ئەڤان ، ئەوان .

٥ـ جێناڤێت پێکەھ : یێ کۆ ، یا کۆ ، یێن کۆ .

٦ـ جێناڤێت پرسینێ : کی ، کێ ، چ ، کا .

٧ـ جێناڤێت بێھێل : ئێ ، یێ .

٨ـ جێناڤێت نەپەنی : واتە ( مبهم ) .

٦ـ دەستوری زمانی فارسی دەڵێت : ضمیر وشەیێکە دەبێتە جێنشینی ( ناو ) وەکو ( حەسەنم دیت و ئەوم تێگەیاند ) .

ضمیریش دابەش دەکات بەم بەشانەی خوارەوە :

١ـ ضمیر شخصی وەکو ( من ، ئێمە ) .

٢ـ ضمیری اشارە وەکو ( ئەمە ، ئەوە ) .

٣ـ ضمیری مبهم وەکو ( یەکێك ، هەر ، هەرکەس ، تێکڕا ، فلان ، هیچکەس ، هەمو ، هەموکەس ، هەموشت ) .

٤ـ ضمیری مشترك وەکو ( خۆم ـ خۆمان ، خۆت ـ خۆتان ، خۆی ـ خۆیان ) .

٥ـ ضمیری پرس وەکو ( کێ هات ؟ کەی هات ؟ چۆن هات ؟ لە کوێوە هات ؟ ) .

تێبینی : ئەم وشە و رستانە لە فارسیەوە وەرگێردراونەتە سەر کوردی .

٧ـ لە دەستووری زمانی ڕوسی ـ بەرگی یەکەم ، مۆسکۆ ١٩٦٠ لاپەڕە ٢٦ بەم جۆرە ڕاناوی دابەش کردوە :

١ـ ڕاناوی کەسی وەك (من ، ئێمە ..) .
٢ـ ڕاناوی هەیی وەك (هی ..) .
٣ـ ڕاناوی ئیشارتی وەك (ئەمە ، ئەوە .) .
٤ـ ڕاناوی نادیار وەك (کەسێك ، شتێك ، یەکێك) .
٥ـ ڕاناوی نەفی (هیچ کەس ، هیچ شت) .
٦ـ ڕاناوی تفصیل (تعیین) وەك (هەمو ، هەریەکە) .
٧ـ ڕاناوی پرسیار وەك (کێ ، کەی ، کوێ ..) .

تێبینی : ئەم بەشەی دەربارەی زمانی ڕوسی لە لایەن د. نەسرین فەخرییەوە وەرگەڕاوەتە سەر کوردی .

٨ـ لە دەستووری زمانی ئینگلیزیدا دەڵێت : ڕاناو ئەو وشەیەیە کە جێی ناو دەگرێتەوە و لە بری ئەو بەکار دێت بۆ ئەوەی لە ڕستەدا دوبارە نەکرێتەوە ، ڕاناویش دەکا بەم بەشانەوە :

١ـ ڕاناوی کەسی (ئێمە ، ئەوان ..) .
٢ـ ڕاناوی تملك (هی‌من ، هی‌ئەو ..) .
٣ـ ڕاناوی خۆیی (خۆم ، خۆمان ..) .
٤ـ ڕاناوی ئیشارتی (ئەمە ، ئەوە) .

٥ـ ڕاناوی پرسیاری (کەی ، چۆن ، چەند ..) .

٦ـ ڕاناوی لێکدەر ( That , Which , Who .. ) .

تێبینی : ئەم بەشەی کە باسی ڕاناو لە زمانی ئینگلیزی دەکات لە لایەن لیژنەوە لە کتێبی دەستوری زمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕدراوەتە سەر کوردی .

دوای ئەم نمایشـــە لیژنە کەوتە سەر لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی لە بارەی (ڕاناو)ەوە .لە سەرەتاوە ویستی تەعریفێك بۆ ڕاناو دابنێت کە وا بەتەواوتی بیگرێتەوە و نەهێڵێت شتی‌تری تێکەڵ بێت ، واتە لە سنوری دەسەڵاتدا تەعریفێك بێت کە پێی دەگوترێ (جامع و مانع) بۆ ڕاناو . لەم ڕووەوە ، دوای هەڵسەنگاندنی ئەو تەعریفانەی لە نمایشەکەدا بۆ ڕاناو دانرابوون ، لیژنە هەمویانی بەلاوە نا ، چونکە بە پێی بڕوای تێکڕای ئەندامانی لیژنە هیچ‌کامێکیان دەست نادات ببێت بە تەعریف بۆ (ڕاناو) لە ڕێزمانی کوردیدا .

بۆ دۆزینـــەوەی تەعریف لیژنە کەوتە ســـەر موناقەشـە ، موناقەشەکەشی بە درێژایی دوو کۆبونەوە بەردەوام بو . لە ئەنجامدا دەرکەوت ئەندامان لە یەك باوەڕدا نین بەرامبەر( ڕاناو ) و تەعریفەکەی . لەبەر ئەمە گیروگرفتەکەی خستەوە بەر دەم ئەنجومەنی کۆڕ تا کو بە پێی دەسەڵاتی خۆی گرفتەکە بڕەوێنێتەوە . بەڵام ئەنجومەن بڕیاری دا خۆی تێکەڵ بە کاری لیژنە نەکات هەتا ئەو کاتەی لێی دەبێتەوە .

لە پاش ئەم بڕیارەی ئەنجومەنی کۆڕ لیژنە دوو کۆبونەوەی تریشی بەسەر برد بۆ تا کە مەبەستی دۆزینەوەی تەعریفێك کە هەمو ئەندامان پێی رازی بن ، بەڵام هەر نەگەیشت بە ئەنجامێك . لەبەر ئەمە وای پەسند کرد جارێ دەست بکات بە لێکۆڵینەوە لە بەشی (راناوی کەسی) کە هەمو نوسەران لە هەمو زماناندا لە بارەیەوە یەك باوەڕن . جوداوازی باوەڕیش دەربارەی بەشەکانی تری (راناو) و دەمەتەقە لە سەر تەعریفی راناو خرایە دوای لێبونەوە لە باسی راناوی کەسی .

[ تێبینی و روون کردنەوە :

چۆنیەتی بەکارهێنانی بیروباوەڕ لە لێکۆڵینەوەدا کە لە کۆڕی زانیاری کورد بوە بە رچەی ئیش کردن ، دیاردەیێکی دیمۆکراسی رەفتارە لە سەرلەبەری ئەو چالاکیانە کە پەیوەندییان بە کۆڕەوە هەیە . هەر ئەم ئازادییەی بیروباوەڕە وای کرد لیژنە تا رادەی لەکاروەستان خۆی پێوە ببەستێتەوە هەرچەند لەمەشدا ئەرکی مادی کۆڕ بەرەو زیادی دەڕوات . ئەم گێڕانەوەی گرفتە بۆ بەردەمی ئەنجومەنی کۆڕ جارانی تریش روی داوە بەڵام هەمو جارێك ئەنجومەن گرفتەکەی داوەتەوە بە لیژنە . ئەوەی راستی بێ درێژ خایاندنی دەمەتەقە و لێکۆڵینەوەی لیژنە لە باسی (راناو) و نەگەیشتنی ئەندامانی لیژنە بە بیروباوەڕێکی یەکگرتو وای کرد من گوتارێکی ١٢٠ لاپەڕەیی لە سەر هەندێك باری (راناو) بنوسم و لە گۆڤاری

کۆڕ (بەرگی دوەم - بەشی یەکەم)دا بڵاوی بکەمەوە لە ژێر ناونیشانی (سوڕێکی خامە بە دەوری راناودا) . لەو گوتارەدا ، هەر چەند گەلێك باری راناو و بەشەکانی بەر لێکۆڵینەوە نەکەوتن ، دیسانەوە باپی ئەوەی بیروباوەڕی گشتیم لەم باسەدا روَن بێتەوە لەسەری دواوم .

[ دەمڕاستی لیژنە ]

راناوی کەسی (الضمیر الشخصي - Personal Pronoun .

لە سەرەتای باسەوە دەبێ بڵێین ئەم راناوە دە کرێ بە دوَ بەشەوە :

یەکەم - راناوی کەسی جودا

نوسەران ئەم زاراوانەی خوارەیان بۆ بە کار هێناوە :

١- سەعید صدقی - منفصل .
٢- توفیق وەهبی - سەربەخۆ .
٣- مەردۆخ - کێشك نەلکیاگ (لاپەڕە ٢٠ لە بەشی یەکەی فەرهەنگەکەی‌دا )
٤- نوری عەلی ئەمین - جوێ .
٥- کتێبەکانی ڕێزمانی قوتابخانەکان - جوێ .

لیژنە زاراوەی « جودا »ی پەسەند کرد هەم لەبەر رەسەنی

وشەکە کە بەوشەی « جوڵێ » بـگیرێ و هەم لەبەر زۆر بەکارهێنانی لە ئاخاوتندا .

[ تێبینی : کە بـگەڕێیتەوە بۆ ئەو گوتارەی ـ سوڕێـکی خامە بە دەوری راناودا ـ دەبینی بیروباوەڕی من لەوێدا دەربارەی دەوری راناو بە تێـکرایی و ئەوەی پێی دەڵێن « راناوی لـکاو » بە تایبەتی ، بەرەو زاراوەکەی توفیق وەهبی پتر دەڕوا هەرچەند من لەگوتارەکەمدا دوو زاراوەی ( راناوی مەند و راناوی چالاك )م بەکارهێنـــاوە . گونجانەکەی باوەڕی من لەگەڵ زاراوەکەی مامۆستا وەهبی لەوەوە دێت کە زاراوەی « لـکاو و نەلـکاو » وەیاخود « جودا و لـکاو » یەکجار لە سروشت و دەوری راناو دوور دەکەوێتەوە ، بەڵام وشەی « سەربەخۆ » چونـکە موقارەنەی رواڵەتی ( سەربەخۆیی و ناسەربەخۆیی ) دەکاتە شتێـکی ناوخۆیی نێوانی هەر دوو جۆرە راناوەکە و وەك ( جودا و لـکاو ) راناوە لـکاوەکە نا کا بە سێبەر و تارمایی ئەو شتەی پێیەوە دەلـکێ بۆیە دژایی پەیدا نا کات لە میـــانی سروشت و دەوری راناوەکە و زاراوەکەدا ، هـەر هێندە هەیە زاراوەکە لە ئاست ئەو سروشت و دەورەدا کورت دێنێ ، کورت هێنانیش بە قەدەر دژایی نابێتە عەیب . من کە پەیڕەوی لێژنەم کرد لەم زاراوەیەدا دژی بیروباوەڕی خۆم ، پشتئەستوور بووم بەو گوتارە دوور و درێژەی ( سوڕێـکی خامە . . ) بەوەدا کات و چالاکی لێژنەشم پاراست کە خەریـکی دەمەتەقەی بێ ڕوومم نەکرد لەو رووەوە کە من بیروباوەڕی خۆم تۆمار کردوە ئیتر

بۆ چی جارێ‌کی‌تریش لیژنەی پێوە خەریك کەم و بی‌وەستێنم !
دەمڕاستی لیژنە ]

ڕاناوی کەسی جودا ئەم وشانەی خوارەوە دەگرێتەوە :

١ـ بۆ کەسی یەکەم :

أ ـ تاك « من ، ئەمن ، ئەز ، م »
ب ـ کۆ « ئێمە ، ئەمە ، مە ، ئەم »

٢ـ بۆ کەسی دوەم :

أ ـ تاك « تۆ ، ئەتۆ ،تو ، ئەتو ، تە »
ب ـ کۆ « ئێو ، ئەوە ، ئەنگۆ ، هوین ، وە ، هەوە ، هنگۆ ، هنك »

٣ـ بۆکەسی سێیەم :

أ ـ تاك « ئەو ، ئەولێ ، ئەوی ، ولێ ، وی »
ب ـ کۆ « ئەوان ، وان ، وا ، ئەو ، ئانە »

بەکارهێنانی ئەم بەشە ڕاناوە لە شێوەی کرمانجی سەرودا پێویستی بەم ڕوَن کردنەوەیە هەیە :

ڕاناوەکە دەکرێ بە دوَ کۆمەڵەوە کە هەر کۆمەڵەی جۆرە بەکارهێنانێکی هەیە :

کۆمەڵی یەکەم : کەبریتییە لە « ئەز ، تو ، ئەو » بۆ کەسی تاك و

« ئەم ، هوین ـ هنگ ، ئەو » بۆ کەسی کۆ ، لەگەڵ ئەم کارانەدا بەکار دێن :

١ـ تێنەپەڕ :

أ ـ ڕابردوو : « ئەزچووم ، تۆچووی ، ئەوچوو » بۆ تاك .
« ئەم چوون ـ چووین ـ ، هوینچوون ، ئەوچوون » بۆ کۆ .

ب ـ حازر : « ئەز دچم ، تو دچی ، ئەو دچە ـ دچیت ـ » بۆ تاك .
ئەم دچن ـ دچین ـ ، هوین دچن ، ئەو دچن » بۆ کۆ.

ج ـ داهاتوو ( مستقبل ) : « ئەز دێچم ، تو دێچی ، ئەو دێچیت » بۆ تاك .
« ئەم دێچن ـ دێچین ـ ، هوین دێچن ، ئـــەو دێچن » بۆ کۆ .

٢ـ تێپــەڕ :

أ ـ حازر : « ئەز دخۆم ، تو دخۆی ، ئەو دخوە ـ دخوەت ـ » بۆ تاك .
« ئەم دخۆن ـ دخۆین ـ ، هوین دخـــۆن ، ئەو دخۆن » بۆ کـۆ .

ب ـ داهاتوو : « ئەز دێخۆم ، تو دێخۆی ، ئـــەو دلێ بخـوە ـ دلێ بخۆت ـ » بۆ تاك
« ئەم دێخۆن ـ دێخۆین ـ ، هوین دێخـۆن ، ئـەو

دێخۆن » بۆ کۆ .

کۆمەڵی دوەم : کە بریتییە لە ( من ، تە ، وی ـ وێ ) بۆ تاك و « مە ، وە ، وان » بۆ کـۆ ، لەگەڵ ئەم کارانەدا بەکار دێت :

١ـ تێپەڕی رابردوو : « من خار ، تە خار ، وی ـ وێ خار » بۆ تاك .

« مە خار ، وە خار ، وان خار » بۆ کۆ .

٢ـ کاری ( ویستن ) : ئەم کارە لە هەموو کات و بۆ هەموو کەسەکان یەك صیغەی هەیە :

أ ـ رابردوو « من ڤیا ، تە ڤیا ، وی ـ وێ ڤیا » بۆ تاك .

« مە ڤیا ، وە ڤیا ، وان ڤیا » بۆ کۆ .

ب ـ حازر : « من دڤێ ـ دڤێت ، تە دڤێ ـ دڤێت ، وی ـ وێ دڤێ ـ دڤێت » بۆ تاك .

« مە دڤێ ـ دڤێت ، وە دڤێ ـ دڤێت ، وان دڤێ ـ دڤێت » بۆ کۆ .

ج ـ داهاتوو « من دێڤێ ـ دێڤێت ، تە دێڤێ ـ دێڤێت ، وی ـ وێ دێڤێ ـ دێڤێت » بۆ تاك .

« مە دێڤێ ـ دێڤێت ، وە دێڤێ ـ دێڤێت ، وان دێڤێ ـ دێڤێت » بۆ کۆ .

٣ ـ کاری هەبوون ( تملك ) : ئەم کارەش لە هەموو کات و بۆ هەموو کەسەکان یەك صیغەی هەیە :

أ ـ ڕابردوو « من هەبوو ، تە هەبوو ، وی ـ وێ هەبوو » بۆ تاك .
« مە هەبوو ، وە هەبوو ، وان هەبوو » بۆ کۆ .

ب ـ حازر « من هەیە ، تە هەیە ، وی ـ وێ هەیە » بۆ تاك .
« مە هەیە ، وە هەیە ، وان هەیە » بۆ کۆ .

ج ـ داهاتوو « من دێ‌هەبت ـ دێ‌هەبە ، تە دێ‌هەبت ، وی ـ وێ دێ‌هەبت »
« مە دێ‌هەبت ، وە دێ‌هەبت ، وان دێ‌هەبت »

تێبینی : ئەم کارەی « هەبوون » ئەگەر بەواتای « بوون ـ فعل الکینونة » بەکار بێت ، دەبێتەوە کاری تێنەپەڕ و کۆمەڵەی یەکەمی ڕاناوەکانی بۆ بەکار دێت لە هەموو کات و بۆ هەموو کەسەکان وەك :
« ئەز هەمە ، ئەم هەنە »

دووەم : ڕاناوی کەسی لکاو :

نووسەران ئەم زاراوەیان بۆ بەکار هێناوە :

١ـ سعید صدقي : متصل .
٢ـ توفیق وەهبی : پێوەنووساو .
٣ـ مەردۆخ : کێشك لکیاگ .
٤ـ نوري علي امین : لکاو .
٥ـ کتێبی قوتابخانەکان : لکاو .

لە سەرەتای باسەوە گوتمان بەشی یەکەمی راناوی کەسی ئەو وشانەن کە پێیان گوترا « جودا » . راناوی کەسی جودا هەر خۆیەتی جۆرێکی تری هەیە پێی دەگوترێ « راناوی لکاو » . نوسەران زاراوەی « لکاو ، نوساو ، پێوەنوساو » یان بۆ بەکار هێناوە کە هەمویان راستەوخۆ لە « الضمیر المتصل » ی عەرەبییەوە وەرگیراون . لیژنە جارێ زاراوەی « لکاو » ی پەسند کرد لەمەشدا پەیڕەوی زۆرینەی نوسەرانی کوردی کرد .

بە ئیستیقرا لە شێوە ئاخاوتنەکانی کوردیی دەردەکەوێت ، راناوە جوداکان کە دەگۆڕێن بۆ شکڵی « لکاو » دەبن بەمانەی خوارەوە :

أ ـ کەسی یەکەم :

١ـ تاك : دەبێتە « م » وەك : ڕۆیشتم ، دەڕۆم ، خواردم ، برام ، لێم گەڕێ ...

٢ـ کۆ : دەبێتە « مان ، ین ، ن » وەك :
خواردمان (رابردوی تێپەڕ) ـ نەمان خوارد ، دەمانخوارد ، بمانخواردایە .
برامان ( مضاف الیه ) .
لێمان دیارە ( لەبەر حوکمی Preposition ) .
لە هەندێ جێی کوردستانی خوارودا ( وەك پشدەر ) لە جیاتی (مان) تەنها پیتی (ن) بەکار دێت وەك (ئێمە

گوتن ، بران نین ، لێن مەکرە) .
دەخۆین ، دەڕۆین ، هەڵدەستین ( کاری مضارع ) .
ئێمە کوردین ( رستەی بێکار ) .

ب- کەسی دوەم :

١- تاك : دەبێتە « ت ، ی - یت » .
تۆ کردت (رابردوی تێپەڕ ) - نەتکرد ، دەتکرد ، بتکردایە .
برات هات (مضاف الیه) .
پێتەوە دیارە ( لەبەر حوکمی Preposition ) .
دەکەی ، دەڕۆی یاخود دەکەیت ، دەڕۆیت ( مضارع بۆ تێپەڕ و تێنەپەڕ ) .

٢- کۆ : دەبێتە « تان ، ن ، و » .
خواردتان (رابردوی تێپەڕ ) نەتانخوارد ، دەتانخوارد ، بتانخواردایە .
براتان (مضاف الیه)
لێتانەوە دیارە ( لە بەر حوکمی Preposition)
دەکەن ، دەڕۆن (کاری مضارع)
ئێوە کوردن (رستەی بێ کار)
لە هەندێ شێوە ئاخاوتنی کوردستانی ژێروَدا راناوی

« تان » دەبێتە « و ـ وَ » وەك « ئەوە خواردوَ ، براو هات ، لێوەوە دیارە » .

ج ـ کەسی سێیەم :

لیژنە لەو درێژە پێدانەی بە لێکۆڵینەوە لە بارەی راناوەوە گرفتێکی ئەوتۆی نەهاتە بـــەر کە وا رای ئەندامانی تێدا رێـك نەکەوێ تا گەیشتە باس کردن لە راناوی لکاو بۆ کەسی دوەم و سێیەی تاك . لێرەدا بیروباوەڕ بوو بـە چەند جۆرێك . بۆ مەبەسی زاڵ بوون بە سەر گرفتەکەدا ئەندامان هەر یەکەیان بیروباوەڕی تایبەتی خۆی روَن کردوە .

١ـ دەمڕاستی لیژنە ـ مەسعود محەمەد : رای ئەو لە بارەی تێکڕای باســی راناوەوە لە ژمارەیێکی گۆڤاری کۆڕدا بڵاو کراوەتەوە ، پێویست نیە لێرەدا دوَبارە بکرێتەوە .

٢ـ نوری علی أمین : بـەلای ئەوەوە پیتی « ت » لە کۆتایی کاری « مضارع »ی تێپەڕ و تێنەپەڕ بۆ کەسی سێیەی تاك راناوی لکاوە وەك :

دەخوات

دەچێت

هەروەها پیتی بزوێنی « ە » لە کاری فەرمان « أمر » بۆ کەسی

دوەمی تاك ، ئەویش راناوی لـکاوە وەك : بـگرە ، بکژە .

بۆ شی کردنەوەی هەمتو گرفتەکە پێویستە ئەم راستیيانەش بخرێتە بـەر چاو :

راناری لـکاو کە لەگەڵ « کار » بێت دوَ شێوەی هەیـە وەك لەم وێنانەدا دەردەکەوێت :

وێنەی یەکەم :

| کەس | تاك | کـۆ |
| --- | --- | --- |
| یەکەم | م | مان |
| دوەم | ت | تان |
| سێیەم | ی | یان |

ئەم شێوەیە لە کاری تێپەڕی رابردوَدا بەبێ گیروگرفت بەکار دەهێنرێت وەك

کێڵام کێڵامان

کێڵات کێڵاتان

کێڵای کێڵایان

لە حاڵەتی « اضافه »شدا هەر بەم جۆرە دێنەوە لە رستەدا

پێڵاوم ـ پێڵاومان ، پێڵاوت ـ پێڵاوتان . . . هتد

لیژنەی زمان و زانستەکانی لە ماوەی ئەم ساڵەدا نزیکەی (٧٠) کۆبوونەوەی کردووە . لەم کۆبوونەوانەدا بە پێی ئەو ڕێبازەی کە لە لایەن کۆڕەوە بۆی دانراوە لە مانەی خوارەوە دواوە :

کار ؛ ڕیشەکانی کار ؛ دابەشکردنی کار لە ڕووی فۆرمەوە (کاری سادە و کاری نادە) ؛ پێشگر و پاشگری کار لە دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خوارووا ؛ داڕشتنی کار ( ناوی کارای سادە و لێکدراو و چۆنیەتی پێکهاتنیان ، ناوی بەرکاری سادە و لێکدراو و چۆنیەتی پێکهاتنیان ، ناوی چاوگ و دەستوری پێکهاتنی ، ناوی ئامراز و پێکهاتنی ، ناوی شت و پێکهاتنی ) ؛ چاوگ لە زمانی کوردیدا ( چاوگی سادە و چاوگی نادە ، چاوگ چۆن نەرێنی دەکرێت ) ؛ ئاوەڵکار لە ڕووی زاراوەوە ؛ ئاوەڵکار لە ڕووی فۆرمەوە ؛ ئامرازی پەیوەندی سادە و لێکدراو و بەکارهێنانیان .

لیژنە جگە لەمانە بەشێ لە کۆبوونەوەکانی ئەمساڵی بۆ پیاچوونەوەی بەرهەمی کۆبوونەوەکانی ساڵانی ڕابوردووی تەرخان کردبوو . لە ئەنجامدا بەشێکی پوختە کرد و لە لاپەڕە ٣٨٩ - ٤٩٦ ی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری کۆڕدا خستویەتیە بەر چاوی خوێنەران . هەروەها ئەم لیژنەیە گەلێك زاراوی زمانی داڕشتوە و داناوە .

لیژنەی لێکۆڵینەوەی زمان هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە پرۆگرامێکی دانا و بە ڕاپۆرتێکی نووسراو بە ئەنجومەنی کۆڕی پێشکەش کرد . ئەم پرۆگرامە لە سێ بەشی گرنگی زمانناسی پەیدا

دەبێ کە پێویستە لە زمانی کوردیدا بکۆڵرێتەوە . یەکەم دەنگناسی (فۆنەتیك) ، دووەم وشەسازی (مۆرفۆلۆژی) ، سێیەم رستەسازی (سینتاکس) .

لیژنە لە یەکەم کۆبونەوەیەوە تا ئێستە بە پێی ئەو پرۆگرامە دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد . لەم ساڵەی دواییدا ئەم بەشانەی دەنگناسی ساغ کردۆتەوە و دەستورەکانی رێزمانی زمانی کوردی لەم لایەنەوە بەم جۆرە رون کردۆتەوە :

١ـ لە پێش هەمو شتێکدا هەندێ زاراوی زۆر پێویستی بۆ هەڵسوڕاندنی کاری لیژنەکە هەڵبژارد و پەسەندکرد ؛
٢ـ وردبونەوەیەکی تەواو لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی و دابەش کردنیان ؛ ٣ـ لێکۆڵینەوە لە گۆڕینی دەنگ لە دیالێکتەکانی کوردیدا و بەراورد کردنیان لە روی فۆنەتیکەوە . . . هتد .

لیژنەی وێژە و کەلەپور بۆ بوژاندنەوەی فۆلکلۆری نەتەوایەتیمان هەوڵی زۆر داوە و لە پێناوی ئەم ئامانجەدا هەر چەندی توانیوێتی تێ کۆشاوە . لە ساڵەکانی رابردودا هێندێك بەیت و باوی کوردی لە سەر شریت تۆمار کردون . بەڵام هێشتا نەهاتونە سەر کاغەز و لە ئەرشیفی کۆڕدا پارێزراون . کۆڕ ئەم ساڵ بڕیاری دا [ تحفه مظفریه ](٤) کتێبە بە نرخەکەی ئۆسکارمان بخرێتە سەر رێنوسی کوردی .

(٤) Oskar Mann. Die Mundart der Mukri-Kurden, Teil I. Berlin, Druck und Verlag, 1906.

ئۆسکارمان زانای مەزنی ئاڵمانی لە ساڵی ۱۹۰۱ دا بۆ لێکۆڵینەوەی زمان و ئەدەبی کوردی هاتۆتە کوردستانی ئێران و دوَساڵ و نیو لە سابڵاخ و شار و دێیەکانی موکریاندا ماوەتەوە و زۆر شتی بە نرخی کوردی نوسیوەتەوە. بەشێکی لە نوسراوەکانی خۆی لە ساڵی ۱۹۰۵ دا بە خەتێکی لاتینی تایبەتی چاپ کردوە و بە پێشکەش ناردوَیە بۆ شای ئێران ( مظفر الدین شاه ) ی قاجار و بۆیە ناوی ناوە [ تحفه مظفریه ]، بەشی یەکەمی ئەم کتێبە دوَ سەرەتایە بە زمانی ئاڵمانی: یەکیان لە بارەی رێزمانی کوردیەوەیە کە جارێ پێویست نەبو بکرێتە کوردی، کورتەی بەشی دووەمی لە لایەن مامۆستا دوکتۆر ناجی عەبباسەوە کراوە بە کوردی.

بەشی کوردی ئەم کتێبە کە ۳۰۲ لاپەڕەی ۳۵ دێڕییە، بریتیە لە شەش چیرۆك و ئەم بەیتانەی خوارەوە و چەند گۆرانی:

۱ ـ دم دم.
۲ ـ مەم و زین.
۳ ـ لاسی و خەزاڵ.
٤ ـ ناسر و ماڵ ماڵ.
٥ ـ برایمۆك.
٦ ـ شێخ فەرخ و خاتون ئەستێ.
۷ ـ مەحەڵ و برایمی دەشتیان.
۸ ـ قۆچ عوسمان.

٩ ـ جولّندی .
١٠ـ خەزێم .
١١ـ کاکە میر و کاکە شێخ .
١٢ـ لەشکری .
١٣ـ قەر و کوڵەزەر .
١٤ـ بەیتی زەمبیل فرۆش .
١٥ـ بەیتی باپیر ئاغای بابی هەمزاغای مەنگوڕ .
١٦ـ بەیتی عەبدولڕحمان پاشای بەبە .
١٧ـ بەیتی عەلی عاشق .
١٨ـ مەم و زین . (ئەم مەم و زینە لەگەڵ مەم و زینی کۆن جیاوازە) .

ئەرکی هێنانەوە سەر ڕێنوسی کوردی و لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی ئەم تێکستانە خرایە ئەستۆی مامۆستا هێمن ـ ئەندامی یاریدەری کۆڕ کە خۆی موکریانییە و ئەم شێوە کوردییە باش دەزانێ و لە فۆلکلۆری ئەدەبی کوردیدا ئەزمونی و شارەزایی هەیە . ئەویش کەلێکی خۆ پێوە ماندو کردوە و بە پوختی هێناویتیە سەر ڕێنوسی کوردی و پێشەکییەکی بۆ نوسیوە ، بۆ ئەوەی کارەساتی قەڵای دم دم ڕوَن بکاتەوە ئەوی ئەسکەندەر بەگی تورکمان کە خۆی بەشداری گەمارۆدانی قەڵا کە بوە بە فارسی لە ( عالم آرای عباسی ) دا نوسیویەتی کردۆتە کوردی . ئێستا ئەم کتێبە بە نرخە کە لە باری زمان و ئەدەب و

فەرهەنگی کوردیەوە زۆر دەوڵەمەند و بایەخدارە لە ژێر چاپدایە و بەو زوانە دەکەوێتە دەست خوێنەرانی بەڕێز و هیوادارین کەڵکی لێ وەربگیرێ .

لیژنەی فەرهەنگ لە ماوەی ئەم ساڵەدا (١٤) کۆبونەوەی کردوە و لە گەلێك کێشەی گرنگی کۆڵیوەتەوە . فەرهەنگی کۆڕ ـ فەرهەنگی یەکگرتوی کوردی ـ ئیشی لەسەر دەکرێ و هەندێ کاری تەواو بووە ، ئومێد دەکەین بەم زووانە چەند پیتێکی سەرەتای بخەینە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

لیژنەی وەرگێڕان و دانان و بڵاوکردنەوە بڕیاری وەرگێڕانی ژمارەیەك کتێب و وتاری بە نرخی لە زمانانی فەرەنسزی و ئەڵمانی و ئنگلیزی و ڕوسی و تورکییەوە داوە ، هەندێ نوسراو کە بە ئەلف و بێی سلافی یاخود لاتینی چاپ کراون دەهێنێتە سەر ئەلف و بێی عەرەبی . چەند بەرهەمێکی زانایانی کورد کە ، هێشتا دەسنوسن ، بڵاو دەکاتەوە ...

لیژنەکانی دیکەش هەر یەکە بە پێی توانای خۆی کاری کردوە و هەر یەکەیان لە مەودا و توانای خۆیدا تێ کۆشاوە . ئەنجومەنی کۆڕیش هەمیشە خەریکی لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکانیانە .

چاپەمەنیەکانی کۆڕ :

ئەو چاپەمەنیانەی کۆڕ کە لە ماوەی ئەم ساڵدا بڵاوی کردونەتەوە

ئەمانەن[٥].

١ـ کتێبی « وردبوونەوە لە چەند باسێکی ڕێزمانی کوردی »[٦] ئەم بەرهەمە کۆکراوەی دوو وتاری ئەندامی کارای کۆڕ مامۆستا مەسعود محەمەدە ، کە لەگەڵ پێشەکییەکی (٣٢) لاپەرەییدایە: وتاری یەکەمیان « بەکار هێنانی (ی) لە ڕێزمانی کوردیدا » لە لاپەڕە ٣٩ ـ ١١٤ ی ژمارە یەکی بەرگی یەکی گۆڤاری کۆڕدا ، وە وتاری دووەمیان « سۆرێکی خامە بە دەوری (ڕاناو) دا » لە لاپەڕە ٩ ـ ١٤٧ ی ژمارە یەکی بەرگی دووی هەمان گۆڤاردا بڵاوکراونەتەوە. (ئەم کتێبە لە سەرەتای مانگی مایسی ١٩٧٤ دا لە چاپ دراوە).

٢ـ کتێبی « زاراوی کارگێڕی » ـ دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ ، پێشەکی و ڕێکخستنی د. کەمال مەزهەر. کۆکراوەی لیستەی یەکەم و دووەمی زاراوەکانی کۆڕن لەگەڵ وەڵامی ئەو ڕەخنە و نامانەن کە لە بارەی بەشی یەکەمی زاراوەکانی کۆڕەوە نوسراون. (لە سەرەتای مانگی مایسی ١٩٧٤ دا چاپی تەواو بووە).

٣ـ کتێبی « هەندێك بیر و باوەڕی هەڵە لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە ». ئەم نوسراوە کە بەرهەمی ئەندامی

(٥) بەشێك لەو چاپەمەنیانەی ئەمساڵ بڵاومان کردوونەتەوە ، کاری ساڵانی ڕابوردوون ، بەڵام ئیمساڵ تەواو بوون.

(٦) لێرەدا ڕیزکردنی چاپەمەنییەکانی کۆڕ بە گوێرەی درەنگ و زوویی دەرچوونیان تۆمار دەکەین.

کارای کۆڕ مامۆستا قەناتی کوردۆیە ، ئەوڕەحمانی حاجی مارف کردوّیە بە کوردی و پێشەکی بۆ نووسیوە و د. کەمال مەزهەریش پێیدا چۆتەوە و لە پێنج وتار پێکهاتوە و بریتییە لە رەخنەی زانستی لەو بیر و باوەڕە چەوت و ناڕاست و دوور لە زانیارییانەوە کە لەمەڕ زمان و مێژووی گەلی کوردەوە نووسراوە . (چاپی ئەم کتێبە لە سەرەتای حوزەیرانی ١٩٧٤ دا تەواو بووە ) .

٤ـ کتێبی « چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە » ، کە باسی تێکڕای ئەو نووسراوانە دەکات کە هەر لە زووەوە تا ئەمڕۆ لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراون . ئەم کتێبە بەرهەمی نووسەری ئەم راپۆرتەیە . (لەکۆتایی حوزەیرانی ١٩٧٤ بڵاوکراوەتەوە) .

٥ـ کتێبی « بەرکوتێکی خەرمانی کوردناسی » . کۆکراوەی ئەو سێ وتارەیە کە مامۆستایان : قەناتی کوردۆ ، جەمال نەبەز ، ئەوڕەحمانی حاجی مارف لە بەشی یەکەمی بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕدا بڵاویان کردۆتەوە . ئەم وتارانە بە پێشەکی‌یەکی ئەندامی کارای کۆڕ مامۆستا مەسعود محەمەدەوە بە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆ کۆکراوەتەوە و بڵاوکراوەتەوە . (لە کۆتایی مانگی ئابی ١٩٧٤دا دەرچووە) .

٦ـ بەشی دووەم لە بەرگی دووەمی گۆڤاری کۆڕ ، کە (٥٣٠) لاپەڕەیە و بریتییە لە دوو بەش ـ کوردی (٢١٨ ل) ، عەرەبی (٣١٢ ل) . لە بەشە کوردییەکەی ئەم ژمارەیەدا ، مامۆستایان :

ئیحسان شێرزاد ، مەسعوود محەمەد ، ئەوڕەحمانی حاجی مــارف ، محەمەد ئەمین هەورامانی وتاریان نووسیوە . لە بەشە عەرەبیەکەشیدا ، وتاری مامۆستایان : تۆفیق وەهبی ، تەها باقر ، شێخ محەمەدی خاڵ ، عەلی سیدۆ گۆرانی ، عەبباسـو لعەززاوی ، سـەعید ئەلدێوەچی ، محەمەد عەلی قەرەداغی ، حسامئەلدین عەلی غالـب نەقشــبەندی ، ئیحسان شێرزاد ، مەسعوود محەمەد ، د. کەمال مەزهەر بڵاوکراوەتەوە (لە سەرەتای ئەیلولی ١٩٧٤ دا دەرچوە) .

٧ـ « زاراوی هەمـە چەشنە » ـ دانان و لێدوانی ئەنجومەنی کۆڕ و لیژنەکانی ، پێشـەکی و رێـکخستنی د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف . لیسـتەی سێیەمی زاراوەکانی کۆڕە بە شێوەی نامیلـکەیەکی سەربەخۆ چاپکراوە . (لە سەرەتای ئەیلولی ١٩٧٤ دا چاپی تەواو بووە) .

٨ـ بەرگی دووەمی کتێبی « حاجی قادری کۆیی » ، کە ئەندامی کارای کۆڕ مامۆستا مەسعوود محــەمەد نووسیوێتی . ئەم بەرگە لەو کاتەوە دەست پێدەکا کە حاجی قادر بە هاوڕێتی باپیری نووسـەر ، حاجی مەلا عەبدوڵڵا ، لە کۆیەوە بەرەو باڵەکایەتی ڕۆییوە بۆ تەواو کردنی خوێندن .

ئێستاش کە ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکەمان بڵاودەکەینەوە ، هەندێ کاری زانستی ترمان لە ژێر چاپدان و چەند کارێك بۆ چاپ ئامادە دەکرێن . جگە لەوە مادە بۆ ژمارەی داهاتوی گۆڤارەکەمان

ئامادەکراوە و ئومێد دەکەین دوای چەند مانگێك بەشی دووەمی بەرگی سێیەمی گۆڤاری کۆڕ پێشکەش بە گەلی کوردمان بکەین .

## یارمەتی

کۆڕ لە ماوەی ئەم ساڵەدا یارمەتی چەند مامۆستایەکی داوە بۆ چاپکردنی بەرهەمەکانیان ، بە تایبەتی وەك :

١ـ فەرهەنگی عەرەبی ـ کوردی مامۆستا گیو موکریانی . ئەم فەرهەنگە تازەیەی مامۆستا گیو موکریانی فراوان کردنێکی ئەو فەرهەنگە عەرەبی ـ کوردییەیە کە ساڵی ١٩٥٠ لە ژێر ناوی فەرهەنگی « رابەر » دا بڵاوی کردۆتەوە . شایانی باسە کە ئەم فەرهەنگە نوێیەی گەلێك لە هی کۆنەکەی فراوانتر و گەورەتر و دەوڵەمەندترە و لە روی بارستەوە دوو هێندەی جارانی دەبێت .

٢ـ فەرهەنگی کوردی ـ کوردی ئەندامی کارای کۆڕ ، مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ . ئەمە بەرگی سێیەمی فەرهەنگی « خاڵ » ە کە لە پیتی ( ق )ەوە تا کۆتایی دەگرێتەوە . ئێستا نزیکەی ( ١٠ ) فۆرمەی لە چاپ دراوە . هیواداریـن بەم زوانە تەواو ببێ و ئاواتی گەلمان بێنێتە دی .

لێرەدا دەمانەوێ پەنجە بۆ ئەمەش رابکێشین ، کە لە کۆبوونەوەی رۆژی ٦ / ١١ / ١٩٧٤ ی ئەنجومەنی کۆڕدا لەبەر گران بوونی چاپ و کەرەستەی چاپ ، ئەنجومەن بڕیاری دا یارمەتی نووسەران کە ( ١٠ تا

١٥ ) دینار بو بۆ هەر فۆرمەیەك بکات بە ( ١٠ تا ٢٠ ) دینار . هەروەها رادەی هەرە بەرزی یارمەتی کە ( ٤٠٠ ) دینار بو ، کرا بە ( ٥٠٠ ) دینار .

## کتێبخانەی کۆڕ :

کتێبخانەی کۆڕ بەرەبەرە تادێ بە بارستتر و دەوڵەمەندتر و ئاوەدانتر دەبێ و رەنگینتر دەبێ و رەنگینتر بۆ بەڵگەش ئەوە بەس بێ کە لەم ماوە کەمەی خولی دووەمی دیوانی سەرۆکایەتی کۆڕدا نزیکەی دوو هەزار کتێبی زیاد کردووە . بەم جۆرە ئێستا کتێبخانەی رازاوەی کۆڕ یەکێکە لە کتێبخـــانە هەرە بڵند و بە نرخەکانی کوردی . بەڵام وەنەبێ هەر بەمەندەوە بوەستین ، بەڵکو هێندەی دیکە بایەخ بـە کتێبخانەکەمان دەدەین و چەندمان لە دەســت هاتبێ پـارەی زیاترمان بۆ کڕینی کتێب و چاپەمەنی و دەستنوسی کوردی تەرخان کردووە . بۆ نمونە وا لێرەدا ناوی هەندێك لەو چاپەمەنی و دەســنوسانەی کە لە ماوەی ئەم ســـاڵەدا دەستمان خستون ، دەخەینە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز .

١ـ دەنگی گێتی تازە . ( شەش ) بەرگ .

٢ـ هاوار . ژمارەی تەواوی ساڵانی ١٩٣٢ ـ ١٩٤٣

٣ـ هاواری کورد . ژمارەی یەکەم ، کە لە مەهاباد دەرچوە .

٤ـ نیشتمان ژمارەی یەکەم ، کە لە مەهاباد دەرچوە .

٥ـ هەندێ دەستنوسی بە نرخی شاعیری کورد مامۆستا عەبدوڵڵا زێوەری خوالێ خۆشبو ، کە لە نێوانیادا فەرهەنگێکی عەرەبی ـ کوردی[٧] و چەند دەفتەرێکی شیعر و نوسراوی تری تێدایە .

٦ـ ژمارەیەك کتێب کە لە لایەن ئەوروپاییەکانەوە دەربارەی کورد نوسراون[٨] .

جگە لەوە هەندێ کتێبی بایەخدار و کۆن با نەمانتوانی بێت پەیدا بکەین ، بەڵام لە رێگای وێنە گرتنەوە ئەو کەلێنەشمان پڕ

(٧) ئەم فەرهەنگە کە تەرجومەی فەرهەنگی « اختری » یە ، وەك دانەر نوسیویێتی لە بیست و پێنجی مانگی تەموزی ١٩٤١دا تەواو بووە . بەڵام بە داخەوە تاکو ئێستاکە چاپ نەدراوە و بە دەستنوسی ماوەتەوە . ئەم دەستنوسە کە دو دەفتەری گەورەیە لە کتێبخانەی « کۆڕی زانیاری کورد » پارێزراوە .

(٨) بۆ وێنە :

(أ) F. Justi. Les Noms D'Animaux en Kurde. Paris, 1878.

(ب) Roger Lescot. Enquête sur Les Yezidis de syrie et du Djebel Sindjár. Beyrouth, 1938.

(جـ) Britain. War office. Northern Mesopotamia and Central Kurdistan. 1917.

(د) F. R. Maunsell. Military Report on Eastern Turkey in Asia. 1904.

کردۆتەوە . بۆ نموونە ئەو دوو کتێبەی پیۆتر لێرخ ساڵی ١٨٥٧ ـ ١٨٥٨ بە ئەڵمانی بڵاوی کردۆتەوە[٩] بە فۆتۆستات بۆ کتێبخانەکەمان سازکردوە .

لە مانگی مارتی ١٩٧٤ەوە ژمارەیەکی زۆر لەو رۆژنامە و گۆڤار و کتێبانەی هەمانن بە شێوەیەکی رێك و پێك لە بەرگ گیراون. ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە لە ماوەی ئەم ساڵەدا خوێنەرانی کورد ، بە تایبەتی ، قوتابیانی بەشی کوردی زۆر روویان کردۆتە کتێبخانەی کۆڕ و بەڕێوەبەرانی کتێبخانە بە تایبەتی و کۆڕ بە گشتی بە شانازییەوە هەموو پێشوازی خوێنەران دەکەن .

## چاپخانەی کۆڕ :

هەرچەندە چاپخانەی کۆڕ بچووك و کۆنە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاری باش و گەورە و پوختمان پێ راپەڕاندوە . هەمیشە هەوڵ و کۆشش دەدەین کەم و کورتیەکانی چاپخانەکەمان نەهێڵین . بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی پارەیەکی زۆرمان لە بوودجەی ئەم چەند ساڵەدا بۆ تەرخان کردوە . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە ، کە لە سەرەتای مانگی دوانزەی ١٩٧٤ دا مەکینەیەکی چاپی « هایدلبرگ » مان پێگەیشت . هەرچەندە ئەم ژمارەیەی گۆڤارەکەمان بەم مەکینە

(٩) Peter Lerch. Forschungen über die Kurden und Die Iranischen Nordchaldaër. St. Petersburg, 1857 - 1858.

نوڵیە چاپ کرد ؛ کەچی هەندێ کەم و کورتی لە چاپیدا هەر ڕوویدا ، ئەویش بە هۆی کۆنی و سوانی پیتەکانمانەوە بو ، بەڵام لەو باوەڕەداین کە بەم زوانـــە ئـــەو ناتەواویانەش پڕ دەکەینەوە . چاوەڕوانی گەیشتنی هەندێ مەکینە و تفاقی تری پێویست دەکەین و دەبێ بەم زوانە پێمان بگەن ، بە تایبەتی ( ئینتەرتایپ ) یێکی نوێ بە پیتی کوردییەوە کە لە ڕێیە . بێگومان فراوان کردن و نەهێشتنی کەم و کورتی چاپخانەکەمان یارمەتییەکی زۆرمان دەدەن و کارمان ئاسان دەکەن .

## کۆڕ و دەزگا زانستی و ڕۆشنبیرییەکانی ناوخۆ و دەرەوە :

لە ژمارەی پێشوی گۆڤاری کۆڕدا باسی ئەوە کرابو ، کە لە ماوەی چەند ساڵی ڕابوردودا کۆڕ توانی لە نێو دەزگا زانستییەکانی ناوخۆ و دەرەوەدا جێگەیەکی دیار بۆ خۆی بکاتەوە[10] . بێگومان هەوڵ و تەقەلا و کۆششمان ئەوەیە ، کە وا ئەو پەیوەندییە توندتر و بە هێزتر و فراوانتر بکەین و ئەنجامیش ئەوەیە کە لەم ماوەیەی دواییدا لەگەڵ دەزگا کوردییەکانی ناوخۆدا هاوکاری و ئاریکاری پەرەی سەندوە و هەروەها لەگەڵ دەزگا زانستییەکانی دەرەوەدا پەیوەندیمان ڕۆژ بە ڕۆژ پێش تر دەکەوێ و نمونەش ئەوەیە کە ئێستا کۆڕ خەریکی هەوڵ دانە بۆ

(١٠) بڕوانە : « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی دوەم ، بەشی یەکەم ، ل ٩ ، ل ٨٤٤ – ٨٥١ .

وەرگرتنی چوار شوێنی خوێندن[11] لە ئەکادیمیەی زانستی سۆڤیێت و جگە لەوەش خەریکی بەستنی پەیوەندییە لەگەڵ ئەکادیمیەی زانستی بولگارستاندا .

## چەند بڕیارێکی لیژنەی کتێبخانە و گۆڤار :

١ـ چالاکییەکی باش بۆ گەڕان بە دوای کتێب و دەستنوسی کوردی و هی دیکەی سەر بە کورددا بنوێندرێ و لە ناو وڵات و دەرەوەدا بە گورجی مشوری بۆ بخورێ . بۆ ئەم مەبەستە کۆڕ یەك دوو کاربەدەستی خۆی بۆ پارێزگاکانی سلێمانی و هەولێر و کەرکوك و نەینوا نارد و لەگەڵ چەند ئەندامێکی کۆڕ و کەسانی دیکەدا لەم بارەوەیان کۆڵییەوە و هیوادارین بەرهەمێکی چاکمان وەگیر کەوێ .

٢ـ کارگێڕی کتێبخانەی کۆڕ لەمەودا گۆشەیەك لە بارەی ئاگا و رووداوی چاپەمەنی سەر بەکوردەوە بە شێوەیەکی هەتا سەر لە گۆڤارەکەدا ئامادە بکا .

٣ـ وتار بۆ گۆڤار لە (٥٠) لاپەڕە پتر نەبێ و ئەگەر پاشماوەشی هەبوو لە دوو جار زیاتر نەبێ .

٤ـ وتارەکان لە پێش بڕیاری بڵاوکردنەوەیاندا هەڵبسەنگێندرێن .

* * * * *

---

(١١) ئەو چوار شوێنی خوێندنی کوردییە بۆ مێژووی کۆن و ئەدەبی کلاسیکی و زمان (مۆنەتیك) و فۆلکلۆرە .

- ملخص المقال -

# خلاصة بمنجزات المجمع العلمى الكردى

د. عبد الرحمن معروف

بحلول شهر آذار من عام ١٩٧٤ استهل المجمع العلمي الكردي دورته الثلاثية الثانية بعد اختتام دورتـه الاولى حافلة بما انجزه من اعمال مثمرة .

وفى التقرير الآتى نستعرض بايجاز مجمل الاعمال التي انجزت منذ دورته الثانية حتى نهاية آذار من العام الجاري

<u>المجلس :</u>

استهل المجلس كالعادة دورته الثانية بمواصلة اجتماعاته كل اسبوع مرة ، أقر فيها كثيراً من الاعمال والامور العلمية والادارية للمجمع ، وبخاصة فيما يتعلق بوضع المصطلحات واشتقاقها ، واكتشافها ، وانتقائها ونقلها وفق منهج علمي ، علاوة على تخير واشتقاق طائفة كبيرة من المصطلحات الاخرى في دورته الاولى منشورة على صفحات مجلة المجمع تباعاً وفي كتاب مستقل ايضاً .

### ديوان رئاسة المجمع :

عقد ديوان رئاسة المجمع خلال هذه السنة ( ١٩ ) اجتماعاً وانجز المهمات الملقاة على عاتقه ، سيما اعداد الميزانية السنوية لعام ١٩٧٥ وعرضها على المجلس لمناقشتها .

### لجان المجمع :

بناء على ما أقره المجلس بتاريخ ٩ / ١٠ / ١٩٧٤ تشكلت لجان المجمع على النحو الاتي :

١ـ لجنة اللغة وعلومها .
٢ـ لجنة البحث اللغوي .
٣ـ لجنة الآداب والتراث .
٤ـ لجنة العلوم الاجتماعية .
٥ـ لجنة القاموس .
٦ـ لجنة الترجمة والتأليف والنشر .
٧ـ لجنة العلوم الاقتصادية والقانونية .
٨ـ لجنة الحضارة الاسلامية .
٩ـ لجنة المكتبة والمجلة .

### نشاطات اللجان :

لقد اسهمت لجان المجمع في اعمالها بنشاط وقدم كل منها من العطاء ما يستحق التقدير .

واصلت لجنة اللغة وعلومها تحقيقاتها بحسب المنهج المقرر لها

من قبل المجمع وقد نشر في هذا العدد من المجلة قسم من التحقيقات اللغوية التي انجزتها في السنين الماضية .

أما لجنة البحث اللغوي فقد وضعت منهجاً لدراسة اللغة الكردية من حيث ( الفونتيك ) و ( المورفولوجيا ) و ( السينتاكس ) ، انجزت من دراسة الفونتيك طرفاً مهماً تخص المصطلحات الضرورية والتحقيق في لهجات اللغة الكردية وتقسيماتها والتغيرات الصوتية فيها ، مع مقارنة بعضها ببعض من حيث ( الفونتيك ) .

وان لجنة الآداب والتراث استطاعت أن تقوم بتسجيل بعض المواد الفولكلورية الكردية على الاشرطة ، وهى محفوظة في ارشيف المجمع لدراستها .

كما اقر المجمع من نشاطات هذه اللجنة نقل كتاب ( التحفة المظفرية ) لاوسكارمان من الحروف اللاتينية الى الحروف الكردية والمباشرة بطبعه .

اما لجنة القاموس فقد قدمت خلال هذا العام المزيد من التحقيقات والدراسات بشأن وضع القاموس الكردي ـ الكردي الموحد ، وهى مازالت عاكفة على العمل ، ونأمل ان يقدم في القريب العاجل بعض مفرداته .

وأما لجنة الترجمة والتأليف والنشر فقد أقر المجمع من نشاطاتها ترجمة بعض الكتب والابحاث القيمة من اللغات الفرنسية والالمانية والانجليزية والروسية والتركية ، ونقل البعض الآخر من الحروف الكردية اللاتينية الى الحروف الكردية المتداولة ، ونشر بعض نتاجات العلماء الاكراد التي مازالت مخطوطة لم تنشر بعد .

## مطبوعات المجمع :

١ـ كتاب « التحقيق في عدد من أبحاث قواعد اللغة الكردية » .
٢ـ كتاب « المصطلحات الادارية » .
٣ـ كتاب « بعض الافكار الخاطئة حول اللغة الكردية وتاريخ الاكراد » .
٤ـ كتاب « ماذا كتب عن اللغة الكردية » .
٥ـ كتاب « باكورة من الدراسات الكردية » .
٦ـ العدد الثانى من المجلد الثاني « لمجلة المجمع » .
٧ـ كتاب « مصطلحات متنوعة » .
٨ـ المجلد الثاني من كتاب « حاجى قادر كويى » .

## الكتب المساعدة :

١ـ وافق المجلس على مساعدة الاستاذ گيو الموكريانى مالياً على طبع قاموسه العربي ـ الكردي .
٢ـ وافق المجلس على مساعدة الشيخ محمد الخال مالياً على طبع الجزء الثالث من قاموسه الكردي ـ الكردي .
٣ـ وافق المجلس على رفع المساعدات المالية لطبع المؤلفات من ( ١٠ ) دنانير الى ( ٢٠ ) ديناراً ، على أن لا يزيد الحد الأعلى من المساعدات على ( ٥٠٠ ) دينار .

## مكتبة المجمع :

ازدادت محتويات المكتبة من الكتب خلال الدورة الثانية لرئاسة

ديوان المجمع ما يقارب من (٢٠٠٠) كتاب . ولن ندخر وسعاً لاغنائها بالكتب والمخطوطات القيمة الأخرى ومن المطبوعات والمخطوطات التي وصلتنا عليها في الآونة الأخيرة :

١ـ مجلة دەنكى كێتى تازه (صوت العالم الحديث) (٦) أعداد .
٢ـ مجلة هاوار (الصرخة) . الأعداد الكاملة للاعوام ١٩٣٢ـ١٩٤٣
٣ـ مجلة هاوارى كورد (صرخة الكرد) . العدد الاول الصادر في مهاباد .
٤ـ مجلة نيشتمان (الوطن) . العدد الاول الصادر في مهاباد .
٥ـ بعض المخطوطات القيمة للشاعر الكردي الراحل الاستاذ عبدالله زيور ، بينها قاموس عربي ـ كردي ، ومخطوطات شعرية ونثرية أخرى .
٦ـ عدد من الكتب التي ألفها الاوربيون عن الاكراد .
٧ـ تصوير كتابين لبيوتر لرخ باللغة الالمانية عن الاكراد .
٨ـ تجليد عدد كبير من الصحف والمجلات والكتب .

## مطبعة المجمع

بالرغم من صغر مطبعة المجمع وقدمها فقد استطعنا ان ننجز بها اعمالاً كبيرة . ونسعى جاهدين لاستكمال نواقصها . فقد خصصنا لها في ميزانيتنا مبالغ لا بأس بها لتطويرها . وقد تسلمنا منذ كانون الاول من العام المنصرم ماكنة (هايدلبرك) الجديدة وطبعنا بها هذا العدد من مجلتنا . ومن المنتظر ان تصلنا قريباً ماكنه انترتايب وبعض المكائن والآلات الطباعية الاخرى .

### المجمع والجهات العلمية والثقافية في الداخل والخارج :

يسعى المجمع لمفاتحة اكاديمية العلوم السوفيتية للحصول على اربعة مقاعد للدراسات الكردية ، وعقد العلاقات مع اكاديمية العلوم البلغارية للغرض نفســـه !

### من قرارات لجنة المكتبة والمجلة :

١ـ بذل اقصى الجهود للبحث عن الكتب والمخطوطات الكردية ، وغيرها مما يخص الاكراد داخل الوطن وخارجه . وقد أوفد لهذا الغرض بعض موظفي المجمع الى المحافظات ، السليمانية اربيل ، كركوك ونينوى ومن المؤمل الحصول على نتائج جيدة .

٢ـ اعداد ركن خاص بما ينشر حول الدراســات الكردية من قبل ادارة المكتبة ونشره في المجلة بصورة دورية .

٣ـ ان لا يزيد عدد صفحات اي مقال ينشر في المجلة على ( ٥٠ ) صفحـــة .

٤ـ تقييم مقالات المجلة قبل نشرها .

* * * * *

# فۆنەتیك چیمان بۆ بكا؟

ئەندامی كارا : مەسعود محەمەد

هەرچەند بابەتی ( فۆنەتیك )م نەكردوە بە مەیدانی چالاكی خۆم، بەڵام بە بۆنەی ئەوەوە كە فۆنەتیك یەكێكە لە باسەكانی سەر بە ئاخاوتنەوە، بایی ئەوەندەم ماف پێیەوە هەیە لە گۆشەی نیگای زمانی كوردییەوە سەیرێكی بكەم وەیا دەستێكی رەخنە هەڵبڕم لەو بیروڕایانەی كە لەگەڵ راستە حیسابی زمانی كوردیی و سروشتی دەنگەكان و بزوێنەكان و بڕگەكانی ناكونجێن، رێی ئەوەشم لێ كوێر نابێتەوە داوا بكەم لە فۆنەتیك زانەكانی كورد كە وا خۆیان رزگار كەن لە تەسلیم بوون بۆ بیروڕای زاناكانی بێگانە كە (تصور)یان بەرامبەر دەستوور و رێبازەكانی فۆنەتیك و جۆری دەنگ و دەربڕینی بڕگە و وشە و رستە... لە زمانی ئەوتۆوە پەیدابوە كە سروشت و تایبەتیەكانی لە هی زمانی كوردیی دوورن، وەیا هەر نەبێ هەموو جاران لە گەڵیدا رێك نایەن. ناو ناوە دەبیەین و دەخوێنینەوە، یەكێك لەوانەی باسی فۆنەتیك دەكەن وەهامان لەگەڵدا

دەدوێ وەك ئەوەی بڕیار و بیروڕای زانـاكانی فڵانەتێـكی ئەوروپـا بتوبێته زانستی (تطبیقی ـ مختبری) و قسەكانیان لەم مەیدانەدا رەخنە و دەمەتەقە هەڵنەگرێت . ئەم گوتەیە هەرچەند پتر بێنی خۆهەڵدانەوەی خاوەنەكەی لێوەدێ لەو روەوە كە وا رادەگەیەنێت خـۆی بتوبێته میراتگری فڵانەتیك و زانستی زاناكانی فڵانەتێـك و چ مافی من و تۆی بە سەرەوە نەمابێت ، لەگەڵ ئەمەشـدا بۆ مەبەسـی كورت كردنەوەی دەمەتەقە گوتەكە بە راست دەگێڕین و هیچ رەخنەیێكی لێ ناگرین ، ئەوەش لە بیر خۆمان دەبەینەوە كە زاناكانی فڵانەتیك تا ئێستاش لە سەر شتێـكی یەكجارەكی رێك نەكەوتون ، ئا لەم حاڵەشدا رێم هەیـە بڵێم : ئەی فڵانەتیك زانی كوردیی تۆ لە خوێندنەوەی كتێبەكانی فڵانەتیك هەر دەستوورە كشتییەكانی (زانسـت)ی فڵانەتیك فێر بتویت ، جارێ یەك هەنگـاوت نەهاویشتوە بۆ ناو گیر و گرفت و كـێشە و بێنە و بەرەی سروشت و تایبەتیەكانی دەنـگ و بڕگـە و وشە و رستەو گوتە و گرتن و رەها كردن و دیاردان و ژێر لێـو خستنی ئاخاوتنی كوردییەوە . هەروەك خوێندنی كتێبەكانی رێزمانی بێـگانە لەوەندەت زاناتر ناكا كە پێت بڵێ فلانە شـت (Verb)ە و ئەوی تریش (noun)ە كە بەمەدا یەك میلیمەتر ناتباتە نـاو زمـانی كوردییەوە و لەوانە دەبیت بە (ظرف)ی كوردیی بڵێی (صفـە) و بە (ضمیر)ی كوردیی بڵێی (حرف ربط) ، هەر وەهـاش خوێندنی كتێبەكانی فڵانەتیك بە عەرەبی وەیا ئینگلیزیی وەیا .. ژاپۆنی لەخۆوە

نات‌کەن بە زانای فۆنەتیکی کوردێ و دیسانەوە لەوانە دەبێت دوای ئەزبەر کردنی ئەو کتێبانە چی هەڵە و غەڵەت و پەڵەتە ئەوە بکەیت بە دەستوری فۆنەتیك لە کوردێدا با صەد جارانیش هەزەشەمان لێ بکەیت بە قسەی وەك (زانایان وایان گوتوە). من بە گوێی خۆم بیستومە لە خاوەن شەهادەی دکتۆرا لە (زمان) گوتوەتی (ستوتا ، برژا ، رما ، پسا ، رژا) ئەمانە هەمویان فعلی (مبنی للمجهول)ن . شەهادەی بەستەزمان لەخۆوە نایێ هەڵەی خاوەنەکەی راستکاتەوە وەیا لێی ببێتە مامۆستا و سەرلەنوێ فەرقی نێوانی (مبنی للمعلوم و مبنی للمجهول)ی بۆ شەرح کات ...

گریمان زانای (قواعد اللغة ـ رێزمان) بە باشیش لە دەستورەکانی گەیشتبێ مەرج نیە ببێتە (زانای زمان) هەروەك زانای زانستی (عروض) مەرج نیە ببێتە شاعیر وەیا زانای (مقام) ببێتە گۆرانی بێژ . بەو پێیەش دەتوانین بڵێین ، راستیش دەکەین کە دەڵێین ، زانای زانستی فۆنەتیك مەرج نیە ببێتە شارەزا و پسپۆڕ لە سروشت و تایبەتیەکانی دەنگەکانی ئاخاوتنی مادەرزادی خۆی : فۆنەتیك‌زان ، سەرەڕای زانینی فۆنەتیك و لەویش زیاتر پێویستی بە وردبینی و قوڵ بونەوە هەیە ، لەگەڵ ئەم وردبینی و قوڵ بونەوەیەشدا دەبێ سەلیقەی راست و زیهنی تیژ و هەست و نەستی کارا پاڵپشتی لێ بکەن و چرای بۆ هەڵکەن تاکو تاریکی ناو تەرکیبی ریس و تەونی ئاخاوتنی بۆ رۆن کەنەوە . ئەم مەرجانە هەر بۆ فۆنەتیك پێویست نین ، لە راستیدا هەمو

زانستێك پێویستی پێیان هەیە . مرۆڤ کە نیگای لێڵ بۆ هەرچی زانستی جیهان هەیە نای کا بە پسپۆڕ لە هیچ مەیدانێکدا . بە نموونە دەڵێم ، کە تۆ سەلیقەی شیعرت نەبۆ هەمو دیوانی کائینات لەبەر کەیت نابی بە شاعیرێکی هەڵکەوتوی زیندو وەیا کە زیهنی (ریاضی)ت نەبۆ هەرچی دەستوری (ریاضیات) هەیە لە مێشکی خۆتدا کۆمەڵ بکەیت نابی بە بلیمەت لەم زانستەدا . لێهاتوبی و بلیمەتی و ئامادەییش نە بە قسەی من و غەیری من پێکدێن و نە دەشسڕێنەوە ، بەڵام هەند ئاشکران هیچ چاوێکیان لێ بە سەهو ناچێ . من دیتومە و تۆش دیتوتە نەخوێندەوارێکی دڵ هۆشیار مامڵەتی هەزاران دیناری کردوە بە کڕین و فروشتن و قەرز و سەلەم بێ ئەوە یەك هەڵەی تێدا کردبێ ، کەچی قوتابیێکی زەین کوێری ریازیات نەیزانیوە ئەو قەرزەی بۆ باوکی وەردەگرێتەوە لە کام خانەی دەفتەری دوکانەکەی تۆمار بکات و بیخاتە بەر کام یەکێك لە چوار (عملیة)ی حیسابەوە هەر لەبیرمە کاتێك لە پۆلی پینجەمی سەرەتایی دەستمان کرد بە خوێندنی (قواعدی عەرەبی) قوتابی وەهامان تێدا بو دەی گوت (کتب) ئیسمی موراضیعە ، هی وەهاشمان هەبو هەڵەی مامۆستای راست دەکردەوە لە خوێندنەوەدا . مەلاکانی کورد لە زوربەی عەرەبەکان پتر شارەزای (قواعد اللغة العربیة) وصرف و نحوی عەرەبین و تێیاندا هەیە کتێبی داناوە لەسەر ئەو (قواعد)ە بەڵام رەنگە یەکێکیان نەتوانێ هەنگاوێك باوێژێ بۆ ناو رێزمان وەیا فۆنەتیکی کوردی

هەرچەند زیرەكیش بێ چونكە جارێ خۆی نەداوەتە وردبونەوە لە تایبەتیەكانی زمانی كوردی .

هیـــچ دوور مەبینە یەكێك لەوانەی خۆ بە زانای فۆنەتیك دادەنێن و لە بارەوەیە دەتوسن ، ئەویش لەتەك سروشت و تایبەتیەكانی دەنگەكانی كوردی وەك ئەو مەلایە وابێ و بەقەدەر ئەو تێیدا كوێرەوار بێ بەڵام پشت ئەستورە بەوە كە زانســـتی فۆنەتیك جارێ لە نێو كورداندا زۆر باوی نەستاندوە و كتێبەكانی سەر بە فۆنەتیك بەنێویاندا بڵاو نەبۆتەوە ، جا ئەگەر قەڵەندەرێـكی دڵ سـۆز بۆ زمانی كوردی لێی بەدەنگ هات و گوتی فلانە فەرمودەت لەگەڵ زمانی كوردی رێك ناكەوێ لێی سور هەڵـگەڕێ و بڵـێ تۆ و فۆنەتیك كوجا مەرحەبا ! چوزانی فلانە پروفیسۆر و فیسار دكتۆر لە بارەی فۆنەتیكەوە چییان گوتوە ؟ خۆ ئەوەی راستی بێ رەنگە چ رەخنەیێك نەیەتە ســەر گوتەی ئەوان پسپۆڕ و پروفیسۆرانە ، بەڵام راسـت كردنی ئەوان لە خۆوە نابێتە شەفاعەتكار بۆ هەڵەی فۆنەتیك زانان لە باسی فۆنەتیكی كوردیدا . ئەوان زانایانە هەرچی دەبن بابن ، پایەی وان نابێتە لەمپەر لەبێش من وەیا قوتابییێكی تری كورد لەوەدا كە بزانین فلانە دەستوری فۆنەتیك بە هەڵە بەســەر فلانە دەنگ و برگەی ئاخاوتنی كوردیدا ( تطبیق ) كراوە . هەروەك هەڵقمان بە دەستورەكانی رێزمانی دەشكێ و دەزانین ئاخـــو بیروڕای زانایێكی رۆژاوا وەیا رۆژهەڵات لە بارەی بەشەكانی ئاخاوتنەوە بۆ زمانی كوردی دەست دەدا یا دەسـت نادا ،

هەروەهاش هۆشمان بە قسەی پسپۆڕەکانی فۆنەتیك دەشکێ و لێمان دەوەشێتەوە تێ‌بکەین ئایا قسەکانیان لەگەڵ ڕاستی‌دا دەگونجێن یاخود پێویستیان بە ڕاست کردنەوە هەیە، کە ڕاستیش بوون ئایا فۆنەتیك‌زانێکی کورد بە دروستی لە کاریان دێنێ وەیا نابەڵەدانە .

من لەوەش زیاتر دەتوانم لەسەر ڕەخنەگرتن و بەجواب هاتنی خۆم و هی‌وەك خۆم بکەمەوە :

یەك پرۆفیسۆر و پسپۆڕی بێگانە نیە بە قەدەر کوردێکی وەك من لە سروشتی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردی بگات و لە تەرکیبی ناوەکی زمانی کوردی شارەزا بێ . فۆنەتیك‌زانێکی زیرەکی کورد دەتوانێ گەورەترین زانای ڕۆژاوا بە سەهوو ببا لە حاست سروشت و تایبەتیەکانی فۆنەتیك وەیا چەند و چۆنی ڕێزمانی کوردی بەڵام ناتوانێ بە ئاسانی من وەیا قوتابییێکی کوردی وەك من هەڵفریوێنێ بە تحلیلی چەوت و چەوێڵ . کێ دەڵێ من وەیا یەکێکی‌تری وەك من ناتوانێ فۆنەتیك‌زانێکی کورد بە هەڵە ببا لە گەلێك چۆنەتی ئاخاوتنی لەهجەی ناوچەیی چەندین هۆزی کورد کە ئەو فۆنەتیك زانە نەدیتوونی نەبیستوونی ؟

هەموو خوێنەوارێك دەتوانێ لە ماوەیێکی مناسبدا بزانێ مەبەست چیە لە (مۆرفیم و فۆنیم و سینتاکس و فۆنەتیك و .. هتاد) بەڵام زانایێکی ئەورووپا یەکجار درەنگ دەزانێ هۆزی مەنگوڕ لای قەڵەو چەند جار هێندی هی سلێمانی قەڵەو دەر دەبڕێ کچی خەڵقی شەقڵاوە لامە قەڵەوەکەی (عبدالله ، والله) دەکەن بەلامە

لاوازە عادەتیەكەی ( لۆكە ، ملوانكە ) ، هۆزی ئەوتۆش هەیە لە نێوانی رانیە و ڕەواندزدا كە سوێندی ( نفی ) دەخوا لە جیاتی ( ناواللە ) دەڵێ ( ناوەی ) هـــەر هەتا خۆی لە ئەركی لامە قەڵەوەكەی ( اللە ) بدزێتەوە .

خوێنەر با لێم بە سەهۆ نەچێ لەوەی لـەم گوتارەدا دەیڵێم دەربارەی سوودی فۆنەتیك : من ناڵێم زانستی فۆنەتیك پێویست نیە بۆ زانای فۆنەتیك كە دەیەوێ توێژینەوە لەو مەیدانەدا بكات هەروەك ناڵێم زانینی ڕێزمان پێویست نیە بۆ زانای ڕێزمان و لێكۆڵینەوەكانی . من دەمەوێ بڵێم زانستی فۆنەتیك بەس نیە بۆ زانینی سـروشت و چۆنەتی و تایبەتی دەنگەكانی ئاخاوتن ، لە كوردیی بێ یا لە زمانێـكی تر . یەكێك كە زانستی فۆنەتیكی زانی ، جارێ ، هەر فۆنەتیك دەزانێ و بەس . كەس بە تەنها زانینی دەستوور و زاراوەكانی زانستی فۆنەتیك ناچێتە ناو رایەڵەكانی ئاخاوتن وەیا شارەزای پێـكداتێپەڕینی تار و پۆیەكانی بێت . خزمایەتی و دژایەتی نێوان دەنگەكانی ئاخاوتن كارێـكە تا بڵێیی جودایە لەو مەعلوماتە بێتەرەفە سـارد و سڕەی كە لە زانستی فۆنەتیكەوە پەیدا دەبێ .

فۆنەتیك زانێك كە دڵێ و پێمان دەڵێ دەنگـی ( د ) لە فلانە شـوێنی پۆكەوە بە هاوكاریی زمان پەیدا دەبێ ، بەمەدا قسەیێكی كردوە كـەلێك لەپێش ئەودا گوتراوە ، ئەگەر نەشی گوتبا لە خۆمانەوە دەمانتوانی بیزانین ، كە دەشـیزانین هیـچ سوودێـكمان لەوەدا

وەرنەگرتوە دەنگی (د)یش بە خۆی و هەمۆ جۆرەکانی هەر ئەوە دەبێ کە هەیە با فۆنەتیکزان بلێ لە مەلاشوەوە وەیا لە لوتەوە وەیا لە دوکولکێشی سەماوەرەوە دەردێت . بەلێ دەبێ بزانین دەنگەکان لە کوێوە دەردێن و چۆن دەردێن ، رەنگە لەمەشدا زانای (وظائف الاعضاء) لە فۆنەتیکزان باشتر سەرەدەری بکات و نیشان پێیکێ ، بەلام زانینەکە خۆی لە خۆیدا ئەمرازێکی بێتەرەفە (محايد)ە تا دەکەوێتە دەستی بەلەدێکی زیرەکی شارەزا بە پەناو پەسیوەکانی ئاخاوتنی سەرلەبەری میللەتێك ، وەیا بەشی زۆری لەهجەکانی . کە پێم گوترا دەنگی (د) لە فلانە شوێن و بە فلانە چۆنەتی دەردەبڕێ ، چاوەنۆڕ دەکەم پێشم بگوترێ دەنگی (د)ی کوردی وەك هی ئینگلیزی نیە و کورد ئەم دەنگە وەك عەرەب دەر دەبڕێ با عەرەب سامیش بن و ئینگلیزیش ئاری . بە دوا ئەم راستییە سەرەتاییەدا دەمەوێ هەمو ئەو تایبەتیانەشم پێ بگوترێ لە بارەی دەنگی (د)ی کوردییەوە کە لە جێگەی خۆیدا ئەم گوتارەم لێیەوە دەدوێ . فۆنەتیکزانێکی کورد کە هات و گوتی (د) لەفلانە شوێنەوە دەردەبڕێ لەسەریەتی بلێ ئەم راستییەم (ئەگەر راست بێ) لە فلانە سەرچاوە و فلانە کتێبەوە وەرگرتوە تاکو گومانی خۆدپەسندی و دەست بەسەر شتدا گرتنی لێ نەکرێ رەنگە دوای ئەمانە هەمویان ، ئەو ئیحتیماله هەر بمێنێتەوە کە وا هەندێك وەیا بەشێکی زۆر لەو بیروڕایانەش هەڵە بن سەیری ،

ئێمە لە باسی دەنگی (د) جارێ هەر بەلای شێوە (د)ەکەی سلێمانیدا نەچوین کە چەند لە ئەسڵە (د)ی ئاسایی کوردی لاداوە و چۆن بە پێی دراوسێیەتی لەگەڵ دەنگیتردا ئەویش دەنگەکەی دەگۆڕێت وەك ئەوەی کە بە دوا دەنگی (ن)دا بێت وەیاخود کە دەگۆڕێ بە دەنگی (گ) و هۆی ئەم گۆڕانە چیە و ئەنجامی چیە !! فۆنەتیك‌زان دەبێ پێم بڵێ دەنگی ئەوتۆ هەیە دەشێ لە دوو شوێنی جوداوە دەرببڕێت وەك دەنگی (خ) کە هەڵدەگرێ بەرەژوور ببرێت بۆ لای قوڕگ ، دەشتوانرێ لە لێوان نێزیك خرێتەوە بۆ لای مەڵاشوو ، واتە لە هەردوو لای شوێنی دەنگی (ق)ەوە دەربڕێت . کە ئەمەشی گوت پێویستە بەدوا ئەنجامی ئەم تایبەتیەی دەنگی (خ) بکەوێ بەڵکو لە ڕێی ئەمەوە بکاتە تعلیلی هەندێك لەو گۆڕانەی کە بەسەر بەشێك لە وشەکانی کوردیدا دێت لە لەهجەیێکەوە بۆ لەهجەیێکیتر ، وەیا هەر دیاردەیێکیتر بێ کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەدا پێی دەگات .

فۆنەتیك زانێکی کورد دوای ئەوەی بە هەموو دەستخاوێنیەکەوە شوێنی دەربڕینی دەنگەکانی ئاخاوتنی (بەتایبەتی هی کوردی) باس کرد و سەرچاوەکانی باسەکەی بەدەستەوە دا ، دەبێ بزانێ لەم کارەیدا ، بەرامبەر هەموو دەنگەکان نەك تەنها هی (د، خ) ، جارێ زانستێکی سەرەتایی بە خەڵق ڕاگەیاندوە وەك (أمر واقع)وایە کە ئەگەر لێشی بێدەنگ بووبا کارەکەی پەکی نەدەکەوت . کوردێك

وەیا عەرەبێك كە قسە دەكا وەیا دەنووسێ لەسەر ئەوە راناوەستێ فۆنەتیكزانێك پێی بڵێ هۆ كابرا ئەم دەنگەی (م) كە دركاندت وەیا نووسیت لە لووتەوەی دەربێنە نەك لە لێو ، چونكە كابرا لە خۆوە بێ مامۆستا دەنگی (م) دەردەبڕێت . زانستی فۆنەتیكیش چ سوودێكی گەورەی پێناگات بەوەدا كە بگوترێ دەنگی (ه) لە زۆرزۆی دەنگی (ح)ەوە دەردێت . رەنگە چ زەرەرێكیش روو نەدا ئەگەر بە هەڵە بگوترێ (ح) لە زۆرزۆی (ه)ەوە دەردێت ، خۆ دەزانین زمان هەیە دەنگی (ح)ی تێدا نیە هی واش هەیە (ه)ی تێدا نیە ، زمانیتریش هەیە هەردوو دەنگی (ح ، ه)ی تێدا نیە تاكوو جێگەی راست وەیا چەوت بۆ دەرهاتنی ئەو دەنگانەی تێدا دیار بخرێت . مەبەستم ئەوەیە بڵێم هەرچەند دەستنیشان كردنی جێگەی راستەقینەی دەنگەكان یەكێكە لە فەرمانەكانی فۆنەتیك ، بەڵام ئەم دۆزینەوە و دەستنیشانكردنە خۆی لە خۆیدا سوودی نابێ ئەگەر زانینیتری لێنەكەوێتەوە ، وەك ئەوەی وێنەی پیتەكانی (ابجدیة) بنووسرێ بەڵام وشە و رستەی پێ رێك نەخرێ .. رەنگە فۆنەتیكزان هەبێ بڵێ زانستی فۆنەتیك بەندە بە دیارخستنی جێگەی ئەو دەنگانە ، بەڵام ئەوەی لێمان مەعلوومە ئەوەیە كە ئێمە دەتوانین لە گوتەی فۆنەتیكزان و باسەكانی فۆنەتیك بكەین بۆ ئەوەی پێمان بگوترێ دەنگی (ق) لە عەرەبیدا بە حەرفێكی (قلقلة) دەژمێررێ ، وەیا دەنگی (ح) لە هەندێ زماندا دەكرێ بە (ه) وەیا رووسەكان

دەنگی ( ث ) دەکەن بە ( ف ) . سەرەڕای ئەم کەم بایەخیەی دیارکردنی جێگەی دەربڕینی دەنگەکان دەبێ ئەوەش بزانین فۆنەتیکزانی ئەوتۆ هەیە ئەوەندە بە سەهۆ دەچێ لە باوەڕەکانی دەربارەی شوێنی دەربڕینی دەنگەکان ، باشتر ئەوەیە هەر لێیان بە دەنگ نەیێ چونکە رەنگە بە قەدەر کۆڵەوارێك تێیاندا بەهەڵە بچێ ، دوای بەهەڵە چوونیشی ئەوەندە لە خۆی بێخەبەر بێ بەقەدەر پێغەمبەرێك شانازی بە خۆی و هەڵەکانی بکات . من نوسەری ئەوتۆم دیوە گوتوەتی فلانە دەنگی ئاوێستا هەر خۆیەتی کە ئێستا لە کوردیدا بەکار دێت نەك لە فارسی . لەمەدا وا دەردەکەوێ ئەو نوسەرە بە ریکۆردەر دەنگەکەی لە ئاوێستاوە بۆ بەجێ ماوە ئەگینا چۆن دەشێ لەسەر بەردی رەقی بێ بەڵگە و ئیسپاتەوە ئەم داوایە پڕ جورئەتە وا بە ئاسانی دەر ببڕدرێت ؟ کە داوای بێ بەڵگە بۆ کوردێك لوا بۆچی بۆ فارسێك نەلوێ ؟ کێ دەتوانێ مەنعی فارسێك بکا لەوەدا کە بڵێ هەمان دەنگی ئاوێستا خۆیەتی بۆتە فلانە دەنگی فارسی نەك کوردی ؟ ئەم وشکە مەلەیە لە ناو حەوزی پڕ دەعوای بێ بەڵگەدا بۆ هەمو کەسێك وەك یەکە : وشکە مەلەیە و بەس ، نە هیچی تێدەچێ و نە هیچی لێ پێك دێت .

لەم تێبینیەوەڕا دەکەم بەم بڕیارە : هەریەکێك لە ئێمە خەریکی تۆژینەوە بێ لە بارەی کوردەوە چ لە رۆی فۆنەتیکی کوردییەوە بێت چ لە رۆی فەرهەنگەوە چ لە رۆی رێزمانەوە چ لە رۆی مێژوو و

ئەدەب و فۆلکلۆر . ەوە بێ، پێویستێکی ئەخلاقی بەسەر شانەوەیە لەو خەریك بوونەیدا کە دەبێ مل کەچ کا بۆ راستی . ناشێ بە هیچ کلۆجێك ئارەزۆی خۆی بەخەبەر بێنێ و تێکەڵ بە توێژینەوەکەی بکا . دەبێ نمایشت و خۆ هەڵدانەوە بەلاوە بنێ . بەو پێیە دەبێ چاومان بۆ هەموو راستییێك بکەینەوە، هەر کاتێکیش هەڵەییەکی خۆمان دۆزیەوە وەیاخود یەکێك بە خێری خۆی بۆمانی دۆزیەوە دەرحاڵ لێی بسەلمێنین نەك کوردەغیرەتی بمانگرێ ، چونکە ئەگەر وا نەکەین و سوور بین لەســــەر هەڵە ئەنجامی زۆر ناقۆلای لێ دەکەویتەوە وەك ئەوەی کە نیگامان لێڵ دەکا نەك هەر لەو بابەتە هەڵەیەی کە لەسەری ســــوور بوین بەڵکو لە هەموو ئەو باسانەی کە بەوەوە بەستراونەوە . دوور مەبینە پێداگرتن و کوردەغیرەتی بمانبا بۆ نەخۆشی نەفسی ئەوتۆ چ پێوەندی بە رۆشنبیری و خوێندەواری و فۆنەتیك و زانستەوە نەبێ . خۆگرتن بە سوور بوون لەســــەر هەڵە لە ئەنجامدا وامان بەو خوە رادێنێ کە هەســــتی بەخۆنازینی تێدا بکەین و وردە وردە دەماری مانیای ( خۆ بەگەورە زانین Megalomania ) مان لێ ئەستوور بکا .

من لە موناقەشەدا کەســــی وەهام دیوە پێ بە پێی بەردەوام بوونی لەسەر هەڵە رووی گەشتر و چاوی پرشنگدارتر بوە تاکوو وای لێ هاتوە گەیشتۆتە رادەی خۆلەبیرکردن ، ئیتر بێ پەروا لە نکاوێك دەستی بەسەر رایە راستەکە داگرتوە و گوتوشیەتی بزانن بیروباوەڕەکەی من چەند راستە !! لە خوێندنەوەی رۆژنامەشمدا دیتومە چ جــۆرە

دڵ گەرمی بـەكار هاتوە لە لایەن ئـەوەی رەخنەی لێ گیراوە . دەبێ ئێمە لەو حالانەدا بەخۆمان بوێرین .

بە نیسبەت تۆژینەوە لە بابەتەكانی كوردییەوە ، خەتەری سۆر بۆن لەسەر هەڵە لەوەوە دێت كەوا كوردی هـەزار تا ئێستا چی وای بۆ ساغ نەكراوەتەوە قەوارەیێـكی ئەوتۆی هەبێ بە ئاسانی ببێتە مانیعی پەرەسەندنی هەڵە لە بیروڕایاندا : ئێمە لەســەرەتای هـەمۆ بابەتێـكی رۆشـــنبیری كوردین ، وەك میللەتانی‌تر نـــین خەرمانی رۆشنبیری راست و پوختمان دەستوراتی ئەوەندە پتەو و هێزای بۆ پەیدا كردبین كە هەڵەی من و تۆ نەتوانێ بەرامبەریان بوەستێ وەیا دەستورێـكی هەڵەیان تێ‌بترنجێنێ .

مامۆستایێـكی عەرەب وەیا ئینگلیز كە لە نوسـیندا هەڵەیێكی رێزمانی وەیا مێژوویی كرد چەندین كتـێب و نوسراوی كۆن و نوێی لێـی بەدەنگ دێن و راستی دەكەنەوە . دەتوانم بڵێم لە نێو میللەتێكی پێشكەوتودا نوسەر ناوێرێ هەڵە بكا لە ترســـی ریسوا بۆن . باری رۆشنبیری كورد وەها نیە : لە زوربەی مەیـدانەكانی رۆشـــنبیری كوردیدا ، ئەگـەر نوسەر لغاوێك نەخاتە زاری خامەی كە لە ساتمە و هەڵانی بپارێزێ ، دەتوانێ بە كەیفی خۆی شتی غەڵەت بنوسـێ و كەسیش لێـی بەدەنگ نەیێ . بە نمونە دەڵێم چەنـد مانگێك لێرە بەپێشەوە كورتە باسێـكی قوت و قوندیلەم لە بارەی ( ئەمـین ئاغا ـ ئەختەر ) خوێندەوە وژێنەی وەها سـەیری تێـدا بو هەر دەنگوت

نوسەرەکەی هۆش و گۆشی خەلقی پێ تاقی دەکاتەوە : نوسرابو لە مەجلیسی ئەمین ئاغادا شاعیری وەك حاجی قادر و کەیفی و شـێخ رەزا و نالی ئامادە دەبون . کەس نەهات بلێ کاتێك نالی کوردستانی عیراقی بەرەو حەج و شام و ئەستەمبۆڵ جێ هێشـت جارێ ئەمـین ئاغا منداڵێـکی چەند ساڵی بوە ، هەر ناشێ ئەمین ئاغا چاوی بـە نالی کەوتبێ . من کە نوسینەکەم خوێندەوە بەدەست خۆم نەبو گوتم دەبو نوسەر (أبو نواس)یش بۆ مەجلیسەکە بخوازێتەوە دوَ سێ قسەی خۆشی تێدا بکات . ئەم تەرزە گوتەیەی بێ سەر و پێ لە نێو میللەتی پێشکەوتودا جێـی نـابێتەوە . نەك هـەر جێـی نابێتەوە و بەس ، ئەوەی راستی بێ نوسەری وەها پیادە و هەرزەکار یەك گۆشـــەی رۆژنامە و گۆڤاری دەست ناکەوێ هەلەق مەلەقی تێدا بنوســێ . چ خاوەن رۆژنامە و گۆڤارێك ئامادە نیە بە بەرتیلیش ناوی خۆی و رۆژنامەکەی بزرێنێ بە بڵاو کردنەوەی بابەتی وەها بێ نرخ و قرپۆك . لەنێو ئێمەدا کە ئیمکان هەیە شـــتی وەها سادە و بەسەزمان بـڵاو بکرێتەوە لەوەوە دێ کە هیچ ســـەرچاوەی لێ ســـەلمێنراو نیـە بەیەکترنەگەیشـــتن و یەکترنەدیتنی ئەحمەد و نالی ســـەپاندبێ . تۆژینەوە لە تایبەتی ژیانی ئەحمەد و نالی ، یا هی تێکڕای رۆژگاریان ، زەرف و زەمانی راستەقینەی هیچ کامێـکیانی ساغ نەکردۆتەوە تاکو نوســـەران لە خۆیانەوە حاپۆلی کۆکردنەوەیان بەیەکەوە لە جێـگە و زەمانێـکدا ناوێژن . بڕوا دەکەم خوێنەری عادەتی کەیفیشـــی بەو

تەرزە مەجلیسە گەرم و گوڕەی حاجی و نالی و شێخ رەزا و کەیفی بۆ ، چ مانیعێکیشی نەبێ لەوەدا شاعیری دیکەش تەشریف بێننە ناو مەجلیسەکە و کۆڕی ئەدەب و نوکتە و لەتیفە گەرمتر بکەن .

دیسانەوە بە نموونەی ڕوون کردنەوەی مەبەست دەڵێم ، من کە لە نێو چار دیوارەی ژووری خۆمدا گوتم مەنگوڕایەتی بۆ کاتی ئایندە (مضارع) ڕێژەی وەها و وەها بەکار دێنن هیچ سەرچاوەیێکی نووسراو نیە گوتەکەم ڕەت کاتەوە و هەڵەکەم ئاشکرا کات ، کەسیش ئەو ئەرکە ناداتە بەر خۆی بچێتە نێو مەنگوڕان و ڕاستی و هەڵەیی گوتەکەی من پێ‌بکەوێ . گریمان شارەزایێکی لەهجەی مەنگوڕان غەڵەتەکەی منی ئاشکرا کرد ، ئەوساش دەتوانم پێ داگرم لەسەر هەڵوەستی خۆم و بڵێم من ڕاستم و ئەو هەڵە ، هەرچی پێشم باوەڕ ناکا با بڕوا و بی‌بێولێ - وەك گوتەکەی مەلای مەشوور - . بە دوور مەزانە هەڵەیێکی کە من و تۆ ئەمڕۆ بی‌خەینە ناو نووسینەوە سبەی زۆژ ببێتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوە چونکە ڕەنگە ئەو نووسینە بە نیسبەت دوارۆژێکی نزیکەوە تاکە سەرچاوە بێ لەو مەیدانەدا . چ شەرمی ناوێ ، وشەی ( بەروار ) کە لە لایەن زۆر کەسەوە لە جیاتی ( تأریخ )ی کاغەز و نووسراو بەکار دێت لە هەڵەیێکی یەکجار سەیرەوە پەیدا بوە ، کە ئەمە ڕوداوەکەیەتی : پیاوێك لە دێی ( بەرواری )یەوە کاغەزێك بۆ یەکێکی‌تر دەنووسێ ، لە کۆتایی قسەکانی‌دا ناوی شوێنەکەی خۆی ( بەرواری ) و ڕۆژی کاغەز

تۆسینەکەی بەسەر یەکەوە دەنوسێ بەم جۆرەی وا لێرەدا بۆتی دوَبارە دەکەمەوە :

ئیمزا

فلان                    بەرواری ٦ / ٩ / ‐ ١٩

ئیتر ئەم (بەرواری) یە بۆ بە (بەروار) چونکە وا زانرا پیتی (ی) کۆتایی وشەی (بەرواری) ئەمرازی (اضافه) یە و تا کە وشەی (بەروار) بە واتای (تأریخ) ە. دوَر نابینم هەر بەم شێوەیەش چۆبێتە ناو هەندێك لە فەرهەنگەکانی کوردێ .

ئەمە نمونەی ئاسانی و تەزدەستی سەپاندنی هەڵەیە بەسەر خوێندەواری کوردیدا ، لەوانەیشە قسەکەی کە من لێرەدا بۆتم کرد خۆی نەگرێ لە بەر تین و تاوی ئەو هەڵەیەی کە بوە بە مێژوَ وەیا بەچکەی مێژوَ . دەوجا کە هەڵە بۆ بە سەرچاوە بۆ خۆت لێك دەوە چەند ئەرك و عەزابی دەوێ تا هەڵەبونی ساغ دەکرێتەوە و ئەو بایەخەی پێی دراوە لە نوسین و توێژینەوەدا دەسرێتەوە .

زانایانی ئەم سەردەمە دەتوانن خۆ بپارێزن لە هەڵە کردن لە خوێندنەوەی نوسراوێکی ئارکایالۆجی کۆن چونکە نوسینە کۆنەکە هەر ئەوەیە کە زانراوە و وێنەکەی ئاشنابوە لە بەر چاوی مێژوَناسان و ج بەرگێکی تر لەبەر ناکا ، بەڵام ئەو زانایانە ناتوانن خۆیان بپارێزن لە هەڵەیێك کە نوسەرێکی ئەمڕۆی کورد پێیان دەکات . ئەو زانایانە

ڕێیان نیە هەمۆ هەڵەیێك لە نۆسینەکانماندا بدۆزنەوە چونکە زوربەی ئەو شتانە کە هەڵەیان تێدا دەکرێ دەستوراتی قەراردادەی بڵاو کرایەوەیان نیە تا کو هەڵە و ڕاستی پێ بناسرێتەوە . خۆت دەزانی و دەبینی زانای ئەورو پایی لە خۆت و کەسانی وەك خۆت پرسیاران دەکا و وەرامان وەردەگرێتەوە ، چش دەبیەت ئەو چشتە دەنۆسێتەوە ، دواتریش کە نۆسینەکەی دەخوێنیتەوە هەمان گوتەی غەڵەت و ڕاستی کە بیستوەتی دێنەوە بەر چاوت .

من مەبەسم ئەوە نیە بەم گوتەیەم داوا بکەم لە نۆسەران واز بێنن لە نۆسین ، لێرەش بە پێشەوە لە نۆسینی دیکەمدا گوتومە نابێ ترسی هەڵە کردن و بەسەهۆچۆن لە نۆسینمان بوەستێنێ ، ئەوەی لێرەدا مەبەسمە شتێکی ترە و هەق تەواویشم تێیدا هەیە : نابێ بێ باك بین لە هەڵە کردن ، وەیا کە هەڵەمان کرد سۆك بە سەریدا تێپەڕین و چاوی لێ بنۆقێنین . پێویستە لە تەك ڕاستیدا خۆمان لە بیر کەین بە تایبەتی کە ئەو ڕاستییە پێوەندی بە ڕۆشنبیری سەر بە کوردییەوە هەبێ ، با خصوص ئەو جۆرە ڕۆشنبیریەی هێشتا ئاشنا و پەرەسەندو نەبوە لە نێو خوێنەراندا چونکە لەوێدا هەڵەکردن یەکجار درەنگ چاوی سرنج بۆ خۆی رادەکێشێ و پەنجە و خامەی ڕاستکردنەوە بۆ لای خۆی دەبا .

دەبینی ، خوێنەری بەرێز ، نولی‌یی و تازەیی خەریك بونمان بە باسی ڕۆشنبیرییەوە چۆن لە ئەسلی باسەکەم لادەدا بۆ ناو ڕەخنە و ناڕەزایی ،

لە حاڵێکدا من دەمەوێ چرایێک هەڵگرم لە بەر هەنگاوی ئەو کەسانەی خۆیان بە فۆنەتیکی کوردییەوە خەریک دەکەن . لەگەڵ ئەم عوزرەش ، دەبێ ئەوە بڵێم رەخنە و نارەزایی دڵسۆزانەش کزە شەوقێک هەر داوێژن بۆ دەور و پشتی خۆیان هەرچەند دووریش نەڕوا ئەو شەوقە . ئەوەی راستی بێ مەبەسم لەم نوسینەدا ، سەرەڕای چەند تێبینی گشتی و رەخنەی کە لێرە بە پێشەوە دەوریان هەڵاتم یا لێرە بەدواوە بێنە بەر خشکەی قەڵەم ، دوو تێبینیتری یەکجار بنجییە کە ناشێ لە توێژینەوەی فۆنەتیکی کوردیدا لەبیر بکرێن وەیا پشتگوێ بخرێن . تێبینی یەکەمیان ئامۆژگارییە هی دوەمیان لە جەرگەی فۆنەتیکی کوردییەوە هەڵ دەستێ .

ئامۆژگاریەکەم بۆ فۆنەتیکزانی کورد ئەوەیە کە ناشێ لە ناو چار دیوارەی ژوورێکی بەغدادا بڕیار بدرێ فلانە عەشرەتی دەوروبەری سنە وەیا دانیشتوانی فلانە شاری کوردستانی تورکیا وەها و وەها دەئاخێون و دەنگەکان بەم شێوەیە دەردەبڕن . کاری فۆنەتیکزانی کورد لە دیاردانی جۆری دەنگ و بڕگەی ئاخاوتنی کوردی وەک هی (شامپلیۆن) نیە کە لە فرەنسەوە بەسەر نوسینەکەی (بەردی رەشید)ەوە کورک بوو بۆ ماوەی ٢٠ ساڵ و بێ ئەوەی (مصر) وەیا (رشید) ببینێ نوسینی هیرۆگلیفی لێکدایەوە و هەڵیهێنا . شامپلیۆن لە فرەنسە با وەیا لە (طنطا وقاهره و دمياط) با فەرقێکی نەدەکرد چونکە ئەو بەدیار نوسینێکەوە چەقیبوو کە بەسەر

بەردەوەیە نەك وتوویژێك کە لە دەمی خەلقی ئەمڕۆی مصـــرەوە دەردێت . فۆنەتیكزانی کورد کە بە تێکڕایی قســـە لە دەنگ و بڕگە بکا وەك ئەوە نیە باسی شێوە ئاخاوتنی هۆزی زەنگەنە بـکا . تێبردنی تایبەتی لەهجەیێك لە نـاو تێـکڕای باســـەکانی فۆنەتیکدا فێلێـکە لە زانستەکە دەکرێ و بەسەهۆبردنێـکی ئەو کەسانەیشـە کە دەیانەوێ بەوردی لە زمانی کوردی و لەهجە جۆرجۆرەکانی بگەن ، با ئەوە هەر نەڵێم کە لە دوورەوە باس کردنی شتێك وەك ئەوەی کە لە نزیکەوە پشکنینەوەی تێدا کرابێ ، رانواندنێـکی هەند هەرزانە لە هیچ مرۆڤێـکی بەریز ناوەشێتەوە چ جایی لە زانایان . بە چـــاوی خۆمان دەبینین زاناکانی زمان ، هەندێ جاریش قوتابی فێرگەکانی زمان ، لە ئەوروپاوە بە ئەرك و خەرجـی خۆیان سەفەر دەکەن بۆ نـــاو جەرگەی دەشت و کـێوی کەم ئاوەدانی بێ ئۆتێل و مۆتێلی کوردستان تا بتوانن بە گوێـی خۆیان ببیەن و بە چاوی خۆیان ببینن . ئێمەی کورد کە لە ماڵی خۆمانین و خەریکی زمان و رۆشنبیری کوردین ، دەبێ چەند هەندی ئەوروپایی ماندوو بین لە هـــاتوچۆ کردن و بە دواگـەڕاندا ! چ رەوا نابینم فۆنەتیكزان داوا بکا نموونەی ئاخاوتنی هەموو لەهجەیێـکی کوردی بە پێـی خۆی بێتە بەر دەمیەوە لە ژوورە کـۆندیشن‌دارەکەی تاکو لەپشت مێزە پان و مەخمەلیەکەیەوە مەهارەت و پسپۆڕی خۆی لێ بەکار بێنێ ، ئەگەر چ مەهارەت و پسپۆڕییێـکی هەبێ . کە ئەم گەشت و گـەڕانە نەکرێ و تێخزانی ناو چاردیوارەی

ژوری بەغدا بنکەی کار کردن بێ ، دەبێ زانای فۆلکلۆرتیك هەر بە جارێ هەمو مەیلێکی خۆهەڵدانەوە دانێ و زۆر بە ( تواضع )ەوە خواهشتی چاو پۆشین بکا لە خوێنەری کورد بەرامبەر ئەم هەمو کەم و کەسرییەی کەوا ، بێ گومان ، لە کاری دوورەپەرێزدا پەیدا دەبێ . بەڵێ دەزانم بۆ هەمو کەس نالوێ کەشکۆڵی دەروێشانە لە مل کات و دڵیبەدڵی بە شوێن کۆکردنەوەی نمونەی ئاخاوتندا بگەڕێ ، بەڵام نەلوانی ئەم حاڵە جێی عوزر هێنانەوە و بەخۆداشکانەوەیە نەك خۆهەڵدانەوە ، بە تایبەتی کە هانا ببرێتە بەر گەشت و گەڕانی بێگانە .

من ناڵێم سود وەرنەگیرێ لەو کتێبانەی کە بێگانە بۆمانی بەرهەم دێنن لە مەیدانی ( کوردولۆجی )دا چونکە ئەمە زەرەرلەخۆدانێکە چی لە جێگە شین نابێتەوە ، هەندێ جارانیش هەر جێی پڕ نابێتەوە چونکە هەر ئەو بەرهەمانە هەن کە لەو کتێبانەدا چەنگ دەکەون ، بەڵام سود و زەرەر ئەم راستییە ناگۆڕن کە وا عەیبە بۆ کورد ئەرکی بەدوادا گەڕان لە بابەتی کوردەواری بەجێ بهێڵێ بۆ ئەوروپایی ، خۆشی هەڵگرێ بۆ ئەو دەمەی بەرهەمی ئەرك و عەزابی ئەوروپاییەکە بە حازری بێتە بەر دەستانی . ئەگەر سنوری ئەدەبم نەبەزاندبێ ، دەڵێم جێی شەرمە بۆ کوردێك لە بەغداوە باسی شێوە ئاخاوتنی هۆزەکانی کورد بکا ، سەرچاوەی باسەکەشی کتێبی بێگانە بێ .

پێی ناوێ چیتر من بە دوای ئەم تێبینییە بکەوم ، هەمو

خوێنەرێکی کورد دەتوانێ لە خۆوە بەدوای بکەوێ و راگەیاندنەکانی لێ وەرگرێ .

تێبینیەکەی دیکەم کە پێوەندێ (موضوعی) بە فۆلکلۆریکی کوردییەوە هەیە ئەمەیە :

وەك من لە ئەنجامی لێکدانەوەی تایبەتی خۆم بۆی دەچم ، گرنگترین لایەنی تۆژینەوە لەتایبەتیەکانی فۆلکلۆریکی کوردێ دۆزینەوەی حەز لەیەکتر کردن و لەیەکتر دۆ بوونی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردییە بەو شێوەیەی کە لە زار و زمانی قسەکەری کوردەوە دەردێن . دەمەوێ لێرە بەدواوە ئەم راستییە بۆ خوێنەری کورد روون کەمەوە و بیکەمە تکا و پاڕانەوەش لە فۆلکلۆریکزانی کورد کە لە تۆژینەوەکانی خۆیاندا چاوەدێری بکەن چونکە ئەگەر نەیکەن هەرگیزاو هەرگیز ناتوانن بچنە ناو تەرکیبی زمانی کوردییەوە و وەك ئەو کەسە دەبن کە لە دەرەوەی پەرژینی باغێکەوە باسی دار و درەخت و مێوە و گوڵ و گیای باغەکە بکات وەیا لە زاری خەلقەوە دەنگ و باسی باغەکە بگێڕێتەوە . بەلام بەر لەوە بچمە ناو باسەکەوە دەبێ ئەوەت پێ بڵێم تا ئێستا هیچ کەس بۆ ئەم باسە نەچوە ، رەنگە وەك رۆی (مانك) وابێ کە وا بەر لە چەند ساڵێك هێشتا شوێن پێی هیچ ئادەمی زادێك و گیانلەبەرێکی تێدا نەبوو . ئەم تازەییەی باسەکە لەوانەیە ببێتە هۆی بەهەندهەڵنەگرتنی لە لایەن خوێنەری عادەتییەوە چونکە ئەغلەب وا دەبێ چاو لەشتی نەدیتراو و نەبیستراو

هەڵدەبەزێتەوە ، زۆر جارانیش شتی یەکجار بێ سـابقە یەکەندەردوَ رەفز دەکرێ وەك لە ئایینداا ئەوەی پێـی دەگوترێ ( بدعة ) یاسـاغ دەکرێ . بەڵام من قســـەم لێرەدا لەگـەڵ فۆنەتیکزانە ، لە پـلەی یەکەمدا ، ئەوجا لەگـەڵ خوێنەری عادەتی . ئەو قسەیەی دەشیکەم لە غەیبەوە نایهێنم و بەرهەمی خـەیاڵات و لێکدانەوەی رووت نیـە ، بەلکو لێزەوی[1] ئاخاوتنی کوردییە . فزکەی دەمارەکانیەتی . بەوپەڕی باوەڕبەخۆکردنەوە ، بێ خۆهەڵدانەوە و بایی‌بوون ، بە فۆنەتیکزانی کورد دەڵێم ئەم دیاردەیەی لێرەدا باسی دەکەم ، هەرچەند بـەر چاویشی نەکەوتبێ وەیا سرنجی لێ نەگرتبێ ، بەردی بناغەی فۆنەتیکی کوردییە . من لێرە بەپێشەوە چەند جارێك ئیشارەم بۆی کردوە ، لە کۆڕەکەی شەقلاوەش کە لە هاوینی ۱۹۷۳دا گیرا بە شێوەیێـکی سەرەتایی و لە گـۆشەی نیـگای رێنوسـی کوردییـەوە هەندێـکی لێدوام بەڵام نە لێدوانی لێـرە بەپێشـــەوە و نە ئەوەی لێـرەدا دەیخوێنیتەوە ، تێـکڕایان ، لە پێشـەکیەکی کورت تێپەڕ ناکەن لەچاو گرنـگی باسەکە و پایەی لە فۆنەتیکی کوردیدا . ئەم دیاردەیە بە نیسبەت زمانی کوردییەوە وەك ئەو رشتە ( عضوی ) یانە وایە کە بە هەموو لەشدا بڵاو دەبنەوە ، با بڵێـین وەك جهـــازی ( خوێـن ) و دەمارەکانیەتی کە هیچ شوێنێکی لەشی زیندوو نیە تێیدا نەبـێ وەیا پێوەندی پێوە نەبێ . من لێرەدا چەند هەنگاوێـکت بۆ ناو باسەکە

---

(۱) لێزە و : نیار ، Current

دەبەم و یەك دوَ لایەنیت بۆ روَن دەکەمەوە ، لەوە بەولاوە کە هاتی و کەوتیتە سەر باری بایەخ پێدانی ، تۆش وەك من و غەیری من کنە لە باسەکە بکە و وردە وردە نهێنیەکانی ئاشکرا بکە و دۆزینەوەکانت بخە سەر خوانی زانیاری کوردی ، بەگشتی ، و هی فۆنەتیکی کوردی ، بە تایبەتی .

لەگەڵ مندا سرنج بدە سروشتی یەکێك لە دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردی لە روّی گونجان و نەگونجانیەوە لەگەڵ دەنگەکانی تردا . بە نموونە ، دەنگی ( ر )ی لاواز بکەین بە دوَخی لێکوڵینەوە. سەیرێکی جۆری دەربڕینی دەنگی ( ر ) بکە لەم وشانەی خوارەوەرا :

کەرت ، کورت ، مارت ، زمانم گرت .

گەرد ، کورد ، مێرد ، سارد ، هەڵگۆرد .

گەرم ، کرم ، شەرم .

کەموکەسر ، قەسر ( قصر ) .

بەوردی وشەکان لەگەڵ خۆتدا بڵێوە دەبینی کە دەنگی ( ر ) بە وەستاوی ، واتە بە ( سکون ) ، دەکەوێتە پێش دەنگی ( ت )ی وەستاوەوە هیچ جۆرە قورس کردن و ( Stress )ێك قبوڵ ناکا و بەتەواوی ساکن دەبێ . وشەکانی ( کورت ، شەرت ، مارت ، خەرت ، کەرت و پەرت ، نورت و نوکێ .. هتاد ) هەموویان یەك برگەن چونکە دەنگەکەی ( ر ) بە سکونی تەواوەوە دێتە سەر ( ت )ی کۆتایی وشەکانەوە کە ئەویش هەر وەستاوە « پێی ناوێ من بڵێم ، لەخۆوە

دیارە هەمــو دەنـگـێـکی ( Consonant ) لە کۆتایی وشەدا بە ناچاری دەوەستێندرێ واتە ئەو حاڵەی دەبێ کە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ ـ سکون ـ » .

ئەم دەنـگەی ( ر ) کە بە سکون دەکەوێتە پێش دەنگی ( د )یشەوە هــەر بەتەواوی دەوەســـتێندرێ و هیچ قورس کردن و ددانلێ گیرکردنێك قبول نا کا . وشەکانی ( مەرد ، مێرد ، گورد ، ســارد ، بەرد ، کورد ، ورد ، گەرد ، وەرد .. هتاد ) ئەوانیش هەمویان هەر لەبەر ئەم هۆیەیە یەك بڕگەن ، وشەی ( هەڵـگورد ) کە بۆتە دوو بڕگە واتە ( هەڵ ـ گۆرد ) ئەگەر لەبەر ئەم تایبەتیەی دەنگی ( ر ) نەبا دەبو بە ســێ بڕگە واتە ( هەڵ ـ گۆ ـ رد ) . بۆ رون کردنەوە وشەی ( هەڵـگۆرد ) هەر دوو جۆری بە پیتی لاتینی دەنوسم ، لە جێـگەی قورس کردنیش نیشانەی ( i ) دادەنێم . ( هەڵـگۆرد )ی دوو بڕگـەیی بە لاتینی وەها دەنوسرێ ( Hel - gord ) هی سێ بڕگەییش وەهای لـێ دێ ( Hel - go - rid ) . تۆ لە خۆتەوە هەست بەوە دەکەیت بە ئانقەست نەبێ ناشێ وشەکە بکرێ بەسێ بڕگە چونکی لە نێوان دوو دەنگەکەی ( ر ، د )دا جـێی هیـچ قورس کردنـێك و ددانلـێ گـیر کردنێك پەیدا نابـێ . ســەلیقەی کورد پێی تحمل نا کرێ دەنگی ( ر ) قورس بـکا کە لە پێش دەنـگی ( د )ەوە دێت . هەروەها ئەم سەلیقەیە ناتوانێ ( ر )ەکە لە پێش ( ت )شدا قورس کات .

لـێرەدا داخوازیێکی یەکجار گرنـگی ئەم سـروشتەی دەنـگی

(ر)ی لاوازت بۆ روَن دەكەمەوە كە ئەگەر روَن نەكرێتەوە زۆر بەزەحمەت دێتە بەر سرنجی خوێنەرەوە ، ئەوەی راستی بێ لەوانەیە ببزای ببزای بە بیراندا نەیەت هەرچەند دیاردەیێكە لە چاوان دەچەقێ .

داخوازیەكە بریتییە لەمە ، بەلاَم بۆ تێگەیشتنی دەبێ سەرەتایێكی مەعلوماتی رێزمانی یارمەتیت بدات .

تۆ دەزانی ، وەیا بەئاسانی دەتوانی بزانیت ، لە نێوان هەمۆ دەنگە (Consonant)ەكانی كوردیدا تەنها دوَ دەنگی (ت ، د) لە پێش نونی چاوگەوە دێن وەك (كردن ، گرتن ، بەستن ، مردن ، پەستاوتن بردن ، چاندن ، داشتن ، گەستن ...هتاد) . كە ورد بیتەوە دەبینی ئەو پیتەی كەوا پێش یەكێك لەو دوَ دەنگەی (ت ، د)دا دێت خۆی لەوانەیە بە سكونی تەواوەوە دەكەوێتە پێش (ت ، د) . لەم نمۆنانەی سەرەوە ئەوەی كە لە پێش (ت ، د)دا هاتوە دەنگەكانی (ر ، و ، س ، ن ، ش)ن سەیر كە دەنگی (س ، ش) هەر لە پێش دەنگی (ت)ەوە دێن و ناكەونە پێش دەنگی (د)ەوە وەك بەستن ، گەستن ، رستن ، خواستن ـ مشتن ، رشتن ، كوشتن ، ماشتن ، هاویشتن . هتاد) چونكە هەردوَكیان كەبێنە پێش (د)ەوە دەبێ قورس بكرێن . بەنیسبەت (ش)ەوە هۆیێكی تریش هەیە بۆ مەنعی هاتنی لە پێش (د)ەوە : هۆیەكەش ئەوەیە دەنگی (ش) كە كەوتە پێش (د)ەوە دەبێ بە (ژ) ، هەر بۆیەیە ناوی (پشتدەر) كە پیتەكەی (ت)ی دەقرتێ دەكرێتە (پژدەر ـ نەك پشدەر) هەرچەند لە نۆسینیشدا

بە شـكڵی (پشدەر) بنوسرێ .

بە نیسبەت دەنگی (ر)ەوە ، هاتنی لە پێش هەردوو دەنگی (ت ، د)دا شتێكی ئاشكرا و چاوەڕوان كراوە ، چونكە نەختێك پێشتر باسمان كرد و گوتمان دەنگی (ر) بە سكونی تەواوەوە لە پێش دوو دەنگی (ت ، د)ەوە دێت . تەنها لێرەدا دیاردەیێكی نوێ لەم تایبەتیەی (ر) دێتە بەر چاو ئەویش كەم بوونی هاتنی (ت)ە و زۆر بوونی (د) . لە هەندێ ناوچەی دەوروبەری كۆیە و شوێنی لەوان نزیكەوە كەلێك لەو (د)انە دەكەن بە (ت)و دەڵێن (كرتم) لە جیاتی (كردم) كە من ئەمە بە لادان دەزانم لە راستە شەقامی زمانەكە ، لەگەڵ ئەمەشدا ئێرە جێی لەسەر رۆیشتنی نابێتەوە . لێرەدا هەر ئەوە دەڵێم وا پێدەچێ دەنگی (ر) پترحەز لە (د) دەكات ، بە هۆی ئەوەیشەوە كە دەنگی (ت) زۆر نزیكە لە (د) ، بۆیەیە وا بە ئاسانی لەو شوێنەدا دەنگی (د) دێت و دەنگەكەی (ر) بۆ خۆی دەدزێتەوە . ئەمە لە كوردیدا وایە كەچی لە ئینگلیزیدا فەرقێك بەدی ناكرێ لە نێوانیاندا . دەبێ ئەوەندەش بخەمە سەر قسەكانم كە وا حەزپێكردنی دەنگی (ر) و ئەم دەنگانە ، تایبەتی (ر)ی لاوازە و بەس (ر)ی قەڵەو كە لە رێنوسی كۆن بە شكڵی (ڕ) دەنوسرێ ، لێرەش بەپێشەوە وادەبوو چوكڵەكە دەخوایە ژێریەوە وەیا بە دوو (رر) دەنوسرا ، ئا ئەم دەنگە تێكەڵی حیسابەكە نابێ .

لە میسالەکاندا هاتنی (ن) بۆ پێش (د)ەکـە دەدیترێ . ئەم دەنگەش لەوانەیە زۆر حەز بە (د) دەکات . ئەویـش لەبەر هەمان سەبەب بەزۆری دەکەوێتە پێش (د)ەوە نەك (ت) . بەڵام راستییێکی‌تر هەیە لە دەنگی (ن)دا کە دەبێتە هـــۆی یەکێك لە دیاردە زۆر بەرچاوەکانی فۆنەتیکی ناوچەیی لە جێگەییێـکی وەك سلێمانی‌دا : دەنگی (ن) پتر حەز بە دەنگی (گ) دەکات ، بۆیەیە خەلقی سلێمانی لە وتووێژدا (د)ی دوای (ن) دەکەن بە (گ) نەك (گ)ەکـە بکەن بە (د) و بە (دەربەند) دەڵێن (دەربەنگ) و بە (ئەفەندی) دەڵێن (ئەفەنگی) بەڵام بە (بەنگ) ناڵێن (بەند) . هۆی ئەم زێدە حەز کردنەی (ن) لە دەنگی (گ) درێژەی هەیە و لێرەدا جێی نابێتەوە ، رەنگە باسیش بکرێ بە ئاسانی خوێنەر ئیقناع نەکات چونکە بەندە بە لێـکدانەوەییێکی زیهنی پتر لەوەی راســـتەوخۆ لە ســـروشتی دەنگەکانەوە زەنە بکات و ببێتە دیاردەییێـکی مادی بێ‌دەمەتەقە .

لە میسالەکاندا چاوگی (کوتن) هەیە کـە وا کورتە بزوێـنی (و) هاتۆتە پێـــش (ت)ەکە . قســـەمان لێرەدا لەگەڵ دەنگی (Consonant)ە نەك بزوێن ، میسالەکـەش هەر بۆیە بۆ سرنج بۆ هاتنی دەنگی (و) رابکێشێ . دەنگی (و) هەروەك بە بزوێنی دێت بە شکڵی (Consonant)یش هەر دێت وەك چاوگەکانی (کەوتن ، باڵاوتن ، پەستاوتن ، بزاوتن ..) . لێرەدا شتێك سرنج بـۆ خـۆی رادەکێشێ ئەویش گۆڕانی هەندێ لەو (و)انەیە بە (ف) وەك کە

دەگوترێ (پالاْفتن ، کەفتن .) . مــــن وا دەزانم گۆڕانەکە لە (ف)ەوە بوە بۆ (و) نەك لە (و)ەوە بۆ (ف) . ئەم ڕایە لـە دوّ سەرچاوەوە هەڵ دەستێ : یەکەمیان ئەوەیە کونجـانی (ت) لەگەل (و)دا ئاشکراترە تا هی (ف) ، بۆیە دەبێ سەلیقە لە ڕێـی ئاسان کردنەوە (ف)ەکەی گۆڕی بێ بە (و) تاکو لەگەڵ (ت)دا باشـتر بکونجێن . دوەمیان ئەمەیە کـە زوربەی ئەو چاوگـانە لە شـێوەی بادینیدا تائێستاش هەر دەنگی (ف)ی تێدا بەکار دێت ، لەمەوە دیار دەکـەوێ بە ئەصل دەنـگەکە (ف)ە و لە شێوە ئاخاوتنی سۆرانیدا کـراوەبە (و) .

تعلیلی ئەم گۆڕانەش لە (ف)ەوە بۆ (و) لێرەدا جێی نابێتەوە ، سەرەڕای ئەمە کە ئەویش لەوانەیە بە درەنگەوە بسەلمێنرێ وەیاخود هەر نەسەلمێنرێ .

دیتمان دەنگی (ر)ی لاواز چۆن لەگـەڵ دەنـگی (د ، ت)دا دەکونجێ و حەزیان لێدەکا . بە پێچەوانەی ئەم کونجـانەی لەگـەڵ (ت ، د)دا ، دەنگی (ر) ی لاواز کـە بـە وەســـتاوێ کـەوتە پێش دەنگەکانی (م ، س ، ش)ەوە بە ناچاری دەبێ قورس بکرێت ئەگینا بە زەحمەت وشەکـە تلفظی پێ دەکرێ ، بۆیەیە وشـــەکانی (کـەرم ، کرم ، عومر ، کەسر ، قەسر ، حەشـر) هەموّیان لە زاری کورددا دوّ بڕگـەن . کـە بە پیتی لاتینی بیان نوّسین و بڕگـەکان جودا کەینەوە وەها دەنوّسرین ( ge-rim , ki-rim , ü-mir , ke-sir , qe-sir) .

دەم و شـەویلەی كورد وا لە قاڵب دراوە ئەم رەفتارە لەگەڵ دەنـگی (ر)دا بكات ، لەوانەیە هەمان دەنگ لە زار و زمانی میللەتێـكیتردا مامڵەتێـكیتری لەگەڵدا بكرێ . بە نموونە دەڵێـم ، ئەوەی بە وردیی گوێی بداتە قـورئان وەیا بیخوێنێتەوە دەزانێ لە ئایەتی (واللیل اذا یسری)دا دەنـگی (ی)كەی كوتایی (یسـری) قرتێنراوە ، واتـــە نە دەنوســـرێ و نە دەشـــخوێنرێتەوە ، ئایەتەكەش دەبێتە (واللیل اذا یَسْرْ) بۆ ئەوە بە پێی دەسـتووری (تجوید) دوو دەنـگەكەی (س ، ر) بە سكوونی تەواوە بە دوا یەكتردا بێن ، كەچی دیتمـان لە كوردیدا هەرگیز (س)ی وەسـتاو نایەتە پێش (ر)ی وەستاوەوە ، واتە دەبێ (س)ەكە قورس بكرێت .

دەنـگی (ر) هەرگیزاو هەرگیز بە سكوونی تەواو وەیا ناتەواو ناكەوێتە پێش دەنـگی (ل ، ڵ)ەوە لە یەك وشەدا ، ئەگەر وشەی وا هەبێ من نەمدیوە . خۆ هیـچ گومان لەوەدا نیە كە دوو دەنـگی (ل ، ڵ) بە هیچ كلۆجێك هەڵناكرێن بخرێنە پێش دەنـگی (ر)ی لاواز وەیا قەڵەوەوە . تەنانەت لە كەپی مەتـەڵ و قسـەی ئەستەمدا ئەم مەتەڵە دادەهێنرا (مەڕی مل ڕووت) ، زوربەی خەلقەكەش لێیان غەڵەت دەبوو و دەكرایە (مەڕی مڕ لووت) هەرچەند وشـەی (مل) جودا و سەربەخۆیشە ، واتە لەگەڵ (ڕووت)دا یەك وشەی پێك نەهێناوە ئەگینا گوتنی مەتەڵەكە زەحمەتتریـش دەبوو .

دەنـگی (ل ، ڵ) حەز بە (ت) دەكا ، وەهاشی لەگەڵدا تێكەڵ

دەبێ (ل)ەکە و (ت)ەکە هەردوویان قەڵەو دەکرێن وەك کە دەڵێین (خڵت، شەپڵتە، سەڵتە، گاڵتە). دەنگەکەی (ت) لەم وشانەدا وەك (ط)ی عەرەبی تلفظ دەکرێ، من هەر بە شکڵی (ت)م نووسـی. ئەمە لەگەڵ (ت)دا کەچی لەگەڵ (م)دا زۆر خزم نین: لەوشەی وەك (شـێلم، گۆلم، کوڵم، بەڵم)دا بـە ناچـاری دەنگەکەی (ل، ڵ) دەبێ قورس بکرێ، کەچی ئینگلیزەکان کە دەڵێن (film) دەنگەکەی (ل) بەتەواوی دەوەستێنن و هیچ قورسایی ناخەنە سەری، بەڵام کورد کەدێ ئەم وشەیەی (film) لە ئاخاوتنی کوردیدا بەکار دێنێ جێ گۆڕکێ بە بزوێنەکەی (i) دەکات بۆ ئەوە خۆی رزگار کا لە زەحمەتی هێنانی (م) بە دوای (ل)دا و وشەکە دەبێتە (فلیم) کە بە ئینگلیزی بی‌نوسین ئەمە دەردەچـێ (flim) بەڵام دەنگەکەی (i) درێژترە لەوەی کە هەر قورسایی عادەتی بێ وەك هی وشـەی (کرم، kirim) بەواتای (دود)ی عەرەبی. هەر لەم جێگەیەدا تایبەتییـەکی فۆنەتیـکی کوردیمان دێتە پێش دەبێ بایەخـی خـۆی پێ بدەین. لەم وشەیەی (film)ی ئینگلیزیدا ئەگەر (i) لە پێـش (ل)ەکەوە نەهاتبا، کورد مەجبوور نەدەبوو بزوێنێـکی تەواو بخاتـە نێوانی (ل، م)ەکەوە و بڵـێ (فلیم). دیاردەیێـکی سـەیر لێرەدا هەیە: لەو وشانەدا کە دەنـگی وەستاو لە پێش دەنـگێکی وەستاودا دێت، زمانی کورد وای پێ خۆشـە هەردوو دەنگە وەسـتاوەکە بەدوای (consonant)دا بێـن نەك بەدوای (vowel)دا، کە هـەر

( Vowel )یش هات حەز لە كورتە ( Vowel ) دەكا نەك هی درێژ .
بە نموونە دەڵێم تۆ كە گوتت ( دنـك ) دەتوانی دەنـگەكەی ( ن ) بە تەواوی بوەستێنی هەر وەك دەتوانی قورساییشی بخەیتە سەری ، بەڵام كە دەڵێی ( رانك ) چارت نـامێنێ دەبـێ ( ن )ەكە قورس كەیت و وشەكـە بكەیتە دوو بڕگە ( را ـ نـك ) . وشـــەی ( Film ) ئەگەر بزوێنەكەی تێدا نەبا ، كە دەزانین بزوێنــە و قورس كردن نیــە ، كورد نەیدەكرد بە ( فلیم ) چونكە لە وشەیێكی كوردیی وەك ئەودا مەجبوور نەبوە بزوێن بخاتە نێـوانی دوو دەنـگەكەی ( ڵ ، م )ەوە : كورد دەڵێ ( چڵم ) و مەجبوور نیە بڵێ ( چڵیم ) وەك مەجبـوورە بڵێ ( فلیم ) . ئەم دیاردەیە لێـكۆڵینەوە و بەدواكەوتنی گەلێك پـــتر دەوێ بەڵام من لێرەدا رێم نیە چیتر بە دوای بكەوم چونكە من خەریك نیم فۆنەتیكی كوردیی ساغ كەمەوە .

دیاردەیێـكیتری زۆر گرنـگی ئەم گونجانی ناوخۆیی دەنـگەكان ئەوەیە كە وشەی چەند بڕگەیی لە كوردیدا بە حوكمی گونجان و نەگونجانەكە شوێنی بڕگەكانی دیار دەكەوێ . سەیرێـكی ئەم نموونانە بكە :
بڵند ، گرنك ، برنج ، قەڵشت .

دەنگی ( ن ) حەز بە دەنگی ( د ، گ ، ج ) دەكا بۆیەیە دەكەوێتە ناو ئەو بڕگەیەوە كە ئەوانی تێدا بن و ناشێ لێیان دابڕێ ، لەبەر ئەمە بڕگەكان وەهایان لێدێ ( ب ـ ڵند ، گ ـ رنك ، ب ـ رنج ، قە ـ ڵشت ) ، كە بەلاتینی و بە بڕگەی جودا كرایەوە بنووسرێن وەها

دەنوســرین : ( qe-lisht , bi-ring , gi-ring , bi-lind ) .
هـەرگیز ناشێ بکـوترێ ( بل ـ ند bil-nid ، گر ـ نـگ gir-nig ،
بر ـ نج bir - nij ، قەڵ ـ شت qel-shit ) .

بەڵام کە ویستت وشـەی ( فرچك ) بڵێیت بە ناچاری بڕگەکان
وەها لـێ دەکەیـت :

فر ـ چك fir-chik .
هەر وەهاش وشەی ( گرتك ) دەکرێ بە دوو بڕگە :
گر ـ تك gir-tik .
وشەی ( تلۆپك ) دەبێ بکرێتە سـێ بڕگە :
ت ـ لۆ ـ پك ti - lo - pik .

لەم گوتارەدا مەودا نیە تاك تاکی دەنگەکان لەگەڵ هەمـــوو
دەنگەکانی‌تردا تاق بکرێتەوە تاکو بزانین خزمایەتی و دژایەتی نێوان
دەنگەکان چەندە و چۆنە ، ئەو دەرفەتەش نیە بەدوا ئەنجامەکانی ئەم
دیاردەیە بکەوین لە زمانەکەماندا چ لە رووی جۆری ترکیبی وشەوە بێ
چ لە لایەن حوکمی دیاردەکەوە بێ بەســەر شێوەی رێنووسدا چ لە
هەرلایەنێـکی‌ترەوە بێ لە لایەنەکانی بێ ئەژماری ئاخاوتندا . تێکڕای
ئەم کارانە دەبـێ بە جێ بهێڵرێ[2] بۆ لـێـکدانەوە و لێکـۆڵینەوەی

(٢) لە وشــەی ( بهێلرێ ) دەنگی ( ڵ ) هاتۆتە پێش ( ر )ەوە . ئەم هاتنە
دەستوورەکەی لێرە بە پێشەوە باس لێ کراومان هەڵ ناوەشێنێ . بە پێی
ئەو دەستوورە دەنگی ( ڵ ، ر ) لە ترکیبی بنچینەیی یەك وشەدا بە یەکەوە=

پشوو درێژ و لەســەرەخۆ كە هەموو زمانەكە و دەنگەكانی ئاخاوتن بگرێتەوە بۆ مەبەسی رووپێو كردنێكی فۆنەتیكی گشتی . بە نموونەی روون كردنەوەی حوكمی دیاردەكە لە سەر دەستووری رێنوس ( املاء )ی كوردیی ئەم میسالەت بۆ دێنمەوە .

وشەی (كاوڕ) بە شێوەی هاتنە دەری لە زاری كوردەوە دوو بڕگەی ئاشكرایە ( كا - وڕ ) كە بە لاتینی بنووسرێ وا دەبێ ( ka . wur ) . ئەم وشەیە لە كێشی شیعریشدا جیگەی دوو بڕگە دەگرێتەوە :

« كاوڕم ناوی لەگەڵ دایكی نەچێتە ناو پەرێز »
kawurim nawé . . .

هەر ئەم وشەیە كە بزوێنی بە دوادا هات قورســایی لەسەر دەنگەكەی (و) هەڵ دەستێ و خوێندنەوەی دەگۆڕێ ، لەشیعریشدا مەودایێكی نوێی پێك دێنێ :

« كاوڕەكەم بۆ بێنە نەختێ سەیری كاوێژی بكەم »
kawrekem bo béne . . .

دەبینی لە نووسینی لاتینیدا بزوێنەكەی ( u ) كە لە دوا (w)ەوە دەهات ڕۆی نەما ، ئەگەر بزوێنەكە نووسرابا كێشی شیعرەكە نەدەما .

---

= نایەن ، لێرەدا دەنگی ( ر ) بۆ صیغەی ( بناء للمجهول ) هاتوە . لەگەڵ ئەمەشدا زۆر كەس دەڵێن ( بهێڵدرێ ) تاكو لە قورسایی هاتنی ( ر ) لە دوا ( ڵ )ەوە رزگار بن .

بەمەدا ، بە هەزاران نموونەی تریشدا ، بۆت دەردەکەوێ گەلێك لەو قورس کردنانە کە لە ئاخاوتنی کوردیدا هەن و زۆر لە نووسەران هەمیشە نیشانەی بۆ دادەنێن وەك ئەوەی گەنجینەیێکی شرایەوەی ئەوتۆیان دۆزیبێتەوە هەر بەوان دۆزرابێتەوە ، ئا ئەو قورس کردنانە و نیشان و پیتی کە بۆیان دادەنرێ بەشێکی ئەصلی و پێکهێنەری وشەکە نین بەڵکو ناچاری هێناونی بۆئەوە بتوانرێ وشـەکە تلفظی پێ بکرێ لە وشەی (کاوڕ ka - wur )دا قورس کردنەکەی سەر ( و ) کە لە لاتینیدا پیتی ( u )ی بۆ بەکارهات وەك دەنگەکانی تری وشەکە (ك ، ا ، و ، ڕ) نیە کە لە داڕشتنی ئەصلیدا بەشدار بووبێ و هیچ کامێکیان لەوانە نین تێبچن . ئەم قورس کردنە کە وەك کورتە بزوێن خۆ دەنوێنێ و پیتی ( u )ی بۆ بەکار هات بەرهەمی کوت ومتی هاتنی ( و )ی وەستاوە لە پێش ( ڕ )ی وەستاودا ، چ دەخلێکیشی نیە بەسەر ترکیبی ئەصلی وشەکەوە واتە کە هاتی ئەو دەنگانە بژمێریت کە وشەی ( کاوڕ )یان پێك هێناوە نابێ ئەم قورس کردنە بژمێریت چونکە دەنگێکی رەسەن و پێکهێنەری وشـەکە نیە ، وەك ئەوەی یەکێك دەستی دەشکێ و دەیخەنە ناو شەپکەوە نابێ شەپکەکە بە ئەندامێکی کەسەکە وەیا بەشێکی دەستەکە بژمێرێت چونکە هەرکاتێك دەستەکە چاك بـۆوە شـەپکەکە لادەچێ . بزوێن کە پێکهێنەری وشە بوو ئەویش وەك دەنگەکانی تر هەمیشەیی دەبێ . لە وشەی ( پەنجەرە )دا هەرسێ

بزوێنی كورتی (ە) بــــە درێژایی عومری وشەكە بەردەوام دەبن .

قورس كردنەكەی (و) لە وشەی (كاوژ)دا وەك شەپكە وایە پێویستیێكی كاتی هێنــــاوەتی ، كە دەنگەكەی (ژ) بزوێنی درایێ قورس كردنەكەی (و)ەكە وەك شەپكەی دەستی شكاو فڕێی دەدرێت .

حوكمی ئەم دیاردەیە بەسەر رێنوسەوە لەوەوە دێت ــكە وا دەبێ رێنوسێك بێتە كایەوە فەرقی دەنگی رەسەن بكات لەگەڵ دەنگی ناچاری و وەقتی . ناشێ رێنوسی كوردی ئەو وشانەی كە قورس كردنی ناچارییان تێدایە بە دوو شێوە نوســـین بخاتە ناو فەرهەنگەوە چونــكە مومكین نیە لە بنەڕەتدا وشــە بە دوو شێوە هاتبێ كە دەزانین یەكێــكیان شێوەی ناچاری و وەقتییە ، وەك بەفری بەهــار كە لە بەر تیشكی بەتینی رۆژ زوو دەچێتەوە ، ئەویش لەگەڵ نەمانی ناچاریەكە لە خۆوە دەڕەوێتەوە .

حوكمی ئەم دیاردەیە لێرە بەدواوە روونتریش دەبێتەوە چونــكە وەك بۆت باس دەكەم گەلێك وشــە هەڵ دەگرێ دەنگێــكی تێدا قورس بكرێ وەیا قورس نەكرێ بێ ئەوە بزوێن لە كۆتایی وشەدا چاوەنۆڕ بكرێ . وشەی (كلك) یەكێــكە لەو وشانەی دەتوانرێ بكــرێتە یەك بڕگەی بێ قورس كردن ( klk ) و دەشتوانرێ (ل)ەكەی تێـــدا قورس بكــرێ و بكرێتە دوو بڕگە (ك ـ لك ki-lik ) جا ئێمە كە دێین رێنوس بۆ كوردی قەراردادە دەكـەین دەبێ ئەم راستییە یەكجار ئاشكرا و بنجییەمان لە بەر چاو بێ و بەمەدا

خۆمان لە هەڵەی تێنەخوێندنەوەی سروشتی دەنگەکانی کوردی رزگار کەین. پێویستە زۆ خۆمان تەسلیم نەکەین بۆ رواڵەتی (شت) ئەو شتە هەرچی دەبێ با ببێ. لەم تایبەتیەی دەنگەکانی کوردیدا، نابێ هاتنی قورسایی بۆ سەر یەکێك لە دەنگەکانی وشە خێرا فێڵمان لێ بکا و شانازیش بەوە بکەین قورساییمان دۆزیتەوە لە وشەدا کەچی دەبێ لە جیاتی دۆزینەوەی (قورسایی) هۆی قورساییەکە بدۆزینەوە و لە بایەخی خۆی پتری پێ نەدەین. هەست کردن بەوە کە لە وشەی (کاوژ) و وشەی وەك ئەودا قورسایی لە سەر دەنگێکدا هەیە هەستێکی بدیهی و ئاشکرا و سەرەتایی و ساوایانە و بێ ئەرك و زەحمەتە، کوردی گوتەنی، کوێریش لێی بە سەهۆ ناچێ. گرنگ لێرەدا ئەوەیە هۆی پترچ کردنەوەی قورساییەکە بدۆزرێتەوە، وەك دۆزیمانەوە، لە رێی ناسینەوەی سروشتی دەنگەکان و پلەی گونجان و نەگونجانیان لەگەڵ یەکتردا.

فلۆنەتیك زانی کورد دەتوانێ گەورەترین فێڵ لە فەیلەسوفێکی فلۆنەتیكزانی ئەوروپایی بکا لەم باسەی قورس کردن و رەها کردنی دەنگ لە وشەی کوردیدا لەو فێڵەشدا دەتوانێ قسە سارد و سڕەکانی (زمانی هیند و ئەوروپایی ـ کوردی زمانێکی «إلصاقی»یە نەك «اشتقاقی» وەیا بە پیچەوانە...) و چەندین قسەی تری بێ دەخلی وەك ئەمە بداتە پاڵ فێڵەکەیەوە تاکو کابرای ئەوروپایی بە جارێ سەرشێواو دەکات لە ئاست زمانی کوردی و تایبەتیە رەسەن و

بنجییەکانی ، کەچی ئەگەر راستی حاڵ بخاتە بەر چاوی زاناکەی ئەوروپایی لەوانەیە ئەو راستییە بۆ ئەو ببێتە کلیلی دەرگەی گەلێك لەو نهێنیانەی کە تا ئێستا بۆی نەکراوەتەوە لە تۆژینەوە دەربارەی زمانەکانی ( هیندی - ئەوروپایی ) .

ئەوەی بۆ من روون بووبێتەوە لە خزمایەتی و دژایەتی ناوخۆیی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردیدا چوار پلەی تەواوە کە زۆر بە ئاشکرایی هەستی پێ دەکرێ . بەڵام دەبێ ئەوە بڵێم نیسبەتی هەندێك دەنگ لەگەڵ هەندێکی تردا وەك ئەوەیە کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ « منزلة بين المنزلتين » . دوای باس کردنی هەر چوار پلە دەگەڕێمەوە بۆ ئەمیان .

پلەی یەکەم : گونجانی تەواو .

ئەم گونجانە لە نێوان هەندێك لە دەنگەکاندا ئەوەندە رێك دێت ناشێ هیچ قورساییەك بخرێتە سەر دەنگە وەستاوەکەی پێشەوە وەك لەم نموونانەدا دیار دەکەوێت :

رد : کورد kurd ، بەرد berd ، کێرد kérd .

رت : کورت kurt ، مارت mart ، کەرت kert .

س ت : بەست best ، بیست bist ، ماست mast .

[ تێبینی : لە شیعردا بۆ راست کردنەوەی ( کێش ) قورسایی

خراوەتە سـەر (س)ەكەی پێش (ت)ەوە وەك لەم بەیتەی نالیدا دەدیترێ :

راسـتی صەیقەلییـە تیغـی زمانی نـالی
نەرم و توند ئاوی كەلوكیرە قسـەی پێدەبڕێ

وشەی (راستی) دەنگەكـەی (س)ی تێدا قورس كراوە ، ئەگەر بـە لاتینی بنوسـرێ وای لێ دێ « rasitee » كـەچی وشـەی (راست ، راستی) هەردوێان لە دەرەوەی شـیعر « rastee , rast » دەگوترێ . دیارە پێویستی شـیعر لە هەمو شـوێنێكدا و لەگەڵ هەمو دەنـگێكدا كاری خۆی دەكا نەك هەر لەگەڵ دەنگی (س)دا ] .

ش ت : گەشت gesht ، گۆشـت gosht ، بڕشـت birisht قەڵشت qeîlsht .

ن گ : دەنـگ deng ، جانـگ jang ، پۆنـگ poong .

ن د : بەند bend ، چاند chand ، سوێند swénd ، پنـد pind ، رەوەند rewend .

ن ج : بەنج ، رەنج renj ، سـرنج sirimj ، ماڵنج كوڵـنج kolinj .

بێگومان دەنگی تریش هەن ، بێ لەمانەی سـەرەوە ، حـەز بەیەكتر دەكەن لێرەدا پێویست نابینم بە دوایان كەوم .

## پلەی دوەم : گونجان

ئەم پلەیە خزمایەتی بێهێزتری تێدایە لە هی پێشتر . لەم پلەیەدا دەشێ دەنگێك بە سکونی تەواوە لەپێش یەکێکی تردا بێت ، دەشی قورسیش بکرێ :

ن ك : دەنك denk ، دە ـ نك denik
کەپەنك kepenk ، کەپە ـ نك kepenik

ر گ : بەرگ berg ، بە ـ رگ berig
ورگ wurg ، و ـ رگ wurig

ڕ گ : قوڕگ qurg ، قو ـ ڕگ qurig

ر ك : دەرك derk ، دە ـ رك derik
کورك kurk ، کو ـ رك kurik

## پلەی سێیەم : نەگونجان

لەم پلەیەدا دەنگێك بەوەستاوێ ناکەوێتە پێش دەنگێکی تری وەستاوەوە ، واتە دەبێ دەنگەکەی پێشەوە قورس کرێ :

ن م : گە ـ نم genim ، خا ـ نم khanim ، دۆ ـ نم donim

پ ر : کە ـ پر kepir

پ ڵ : تە ـ پڵ tepil ، س ـ پڵ sipil

دەنگی (ك) لەگەڵ زوربەی دەنگەکاندا ناگونجێ وەك : شەـکر shekir ، مەـکس mekis ، مەـکر mekir ... هتاد هەروەهاش دەنگی (ب) .

پلەی چوارەم : دژایەتی .

لەم پلەیەدا هاتنی دەنگێك بە وەستاوی لە پێش دەنگێکیترەوە مومکین نیە . لێرە بە پێشەوە دوو دەنگی (ل ، ر) مان باس کرد ، لێرەدا ، دەڵێم دەنگی (ق ، ك) ئەوانیش وان . دەنگی (ب)ش ناچێتە پێش (م)ەوە . لەم بابەتە دەنگیتر زۆرن .

من (نظریە)یێکی تایبەتی خۆم هەیە لە بارەی تەفسیری (بێگانەبوون) لە ڕوی دروست کردنی هۆی تێك نەگەیشتن و بەیەکتر ڕازی نەبوون و عەیب لەیەکترگرتن و شتی ئەوتۆییەوە لە نێوانی مرۆڤدا ، رایەکەم بە شێوەیێکی کورت لە پێشەکی کتێبەکەی (بەرکوتێك لە خەرمانی کوردناسی) کە لە بڵاو کراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردە ، بڵاو کرایەوە . لێرەدا نمونەیێکی تازە لە فۆنەتیکیش دێتە بەر دەست کە وا چۆن لەیەکتر دوور کەوتنەوەی مرۆڤ نەك هەر زمان دەگۆڕێ و بەس ، بەڵکو جۆری دەربڕینی دەنگیش دەگۆڕێ . دیتت کورد دەنگی (ر) لە پێش (ل)ەوە ناهێنێ ، کەچی ئەڵمانەکان ناوێکی زۆر باویان وشەی (کارل)ە کە لە جێیتر دەبێتە (شارل ـ شارلمان) . جگەرەیێکی بەناوبانگی رۆژئاوا (مارلبۆرە)یە . ممۆرە

( سکویرۆل )ه . ناوم دیوه ( میلزوز ) ... هتــاد .

دەگەڕێمەوە بۆ ئەو پلەیەی کە گوتم لە نێوان دوو پلاندایە .

سرنج بگرە لە دوو دەنــگی ( ر ، ج ) وەك لە وشەی ( مەرج ، گورج ، بەرج )دا تلفظیان پێ دەکرێ . ئەم خزمایەتیەی نێوانیان کەمترە لە هی ( رد ، رت ) بــەڵام پــترە لە هی ( رك ، رگ ) . وا دەزانم هۆی ئەم جودایییە بریتییە لەمە :

دەنگەکانی ( د ، ت ) هەردوویان لە بەر دەمی شوێنی ( ر )ەوە بەلای پێوکەوە دەر دێن ، واتە لەو شوێنەوە دەردێن کە بە نیسبەت دەنگی ( ر )ەوە دەرگەی ئاسایی هاتنە دەرەوەی ئاخاوتنە چونــکە دەزانین ئاخاوتنی مرۆڤ لە ئەندامەکانی ( نطق )ەوە بۆ دەرەوەی دەم دەجوڵێ و دەبزوێ . بەڵام دەنگی ( ج ) دەکەوێتە پاش جێـگەی دەنگی ( ر )ەوە هـــەر چەنــد جێگەی دەربڕینیشان بەیەکەوە نوساون ، لەبەر ئەمە تۆ کە لە دەنگی ( ر )ەوە بەرەو دەنگی ( ج ) بڕۆیت بەرەو دواوە دەگەڕێیتــەوە کە ئەمە نەختێك دژی داخوازی ئاخاوتنە کە حەز دەکا دەر بێ ، بۆیێ خزمایەتی ( ج ) لەگەڵ ( ر )دا کەمترە لە خزمایەتی ( د ، ت ) ، بەڵام پترە لە خزمایەتی ( ك ) چونکە جێگەی دەنگی ( ك ) دوورتر دەکەوێتەوە لە جێگەی دەنگی ( ر ) ، واتە بەولای جێگەی ( ج )ەوە بەرەو قورگ لەجێگەی ( ر ) دوور دەکەوێتەوە .

لەم بابەتە هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوەیە هەتا بەدوای گەوێن و بۆی تێ هەڵکشێین لێی نابینەوە چونکی فۆنەتیکی کوردی تا ئێستا هیچی ئەوتۆی تێدا نەگوتراوە و نە دۆزراوەتەوە کە بە تایبەتی هی دەنگەکانی کوردی بێ، هەرچی گراوە یا سەرەتا و بەدیهیەی ئەوتۆیە بۆ هەمو چاوێکی نەختێك وردبین ئاشکرایە، یاخود شتی گشتی ئەوتۆیە، وەك هەوا و تیشکی رۆژ، تێکڕای جیهان تێیاندا بەشدارە. من بە تەواوی و لە هەمو رویێکەوە دژی گوتانەوەی گوتەی لێرە بەپێشەوە گوتراو و شتی وەك بدیهیەم، هەر نەبێ لەبەر ریزنان لە خوێنەر، چونکە خوێنەرێك بدیهیە و شتی گوتراوی بۆ دوبارە دەکرێتەوە کە لە پلەی سەرەتایی خوێندن و زانیندا بێ. کاتێك هێنانەوەی بابەتی گوترایەوە و ئاسان رەوا دەبێ کە بۆ مەبەسی دۆزینەوەیێکی نوێ وەیا بەدەستەوە دانی سودێکی گرنگ وەیا بنیاد نانی فکرەی تازە ... بێ. من باسی ئەم دیاردەیەی گونجان و نەگونجانی دەنگەکانی ئاخاوتنی کوردیم نەدەکرد ئەگەر لێرە بەپێشەوە کەس لە سەری دوابا، باسیشم کردبا بۆ مەبەسی خستنەسەر وەیا راست کردنەوە وەیا رەخنە دەبو.

ئەوەی راستی بێ ئەم تایبەتیەی فۆنەتیکی کوردی هێندە بنجی و گرنگە لە زمانەکماندا و بە جۆرێك تێکەڵی رایەڵ و تان و پۆی داڕشتنی وشە و بەیەکەوە بەستنەوەیان بوە و خۆی زاڵ کردوە بەسەر بەشێکی بەرچاوی رێنوس و رێزمانی کوردی، لێیان داوا

دەکا زۆر بە پسپۆڕێ نەخشەیێکی سەرلەبەری هەمو دەنگەکان رێك بخەین لە رۆی دیار خستنی پلەی گونجان و نەگونجانیان لە گەڵ یەکتردا . هەروەك نەخشەی ولاتێك شکڵی گشتی ولاتەکە و بەرز و نزمی و تەڕ و وشکی و پان و درێژی و رێگە و بان و دارستان و رۆتەن و پاوان و بیابان و هەموار و هەڵدێر و هەمو سەروبەرێکی ولاتەکەت نیشان دەدات و فکرەیێکی رۆنت لە باریەوە بۆ پێك دێنێت ، هەروەها ئەم نەخشەیەی گونجان و نەگونجانی دەنگەکان لەگەڵ یەکتردا لێی دەوەشێتەوە بکرێ بە ئاوێنە و ( وشە )ی کوردێ تێدا عەکس بکرێتەوە لە حاڵی سادەیی و لێکدراوێ و بەستنەوەی بە ئەمراز و پیتی پەیوەندێ و سوان و لێقرتان و هاتنە سەر و ئاڵ و گۆڕی دەنگ بەیەکتر و یەکتر دەرکردن و یەکتر داخوازێ کردن و هەمو حالێکی تریدا ، ئەگەر وشەکەش ( کار ) بێ بە چاوك و شێوەی داڕشتنی لە رابردو و ئاینـدە و فەرمان و قبوڵ کردنی پێشگر و پاشگر و سوان و نەسوانیان و هاتنی شتی‌تر بۆ کارەکە و ... هتادەوە بۆ ئەوە بزانرێ ئەم دیاردەیەی ( گونجان و نەگونجان ) چ تەئسیرێکی بوە لەم رەفتارەی کە قسەکەری کورد لەگەڵ ئاخاوتنی کوردێدا کردوەتی . ئەم نەخشەیەی باس لێ‌کراو وەك جۆکەلەی نرخی پیتەکانی ( أبجد هوز ) وایە کە لە ( حساب الجمل )دا بەکار دێت و لە لێکدانەوەی هەمو ( مێژو )یەك پێویستمان پێی دەبێ . لێرەدا بۆ مەبەسی رۆن کردنەوە چەند نمونەیێك دێنمەوە :

١ـ مەکینەی (کستارە) کە بۆ هەموار کردنی ڕێگەو بانان بەکار دێت لە نێو هۆزەکانی کورددا بوە بە (کەستاژە) . دەزانین کورد حەز لە (شدّه) ناکات بۆیێ گرتنەکەی دەنگی (س)ی لە وشەکەدا نەهێشتوە ، لە جیاتی ئەو ، دەنگی (ت)ی هێناوە . ئەم دەنگەی (ت) بە ڕێکەوت نەهاتوە بەڵکو بە حوکمی ئەو کونجانە تەواوەی دەنگی (س)ی ساکن هاتوە کە دەکەوێتە پێش (ت)ەوە ، وەك کوتمان هەرگیز دەنگی (س)ی ساکن قورس کردن قبوڵ ناکات لە پێش دەنگی (ت)دا . لێرەدا دیاردەی (کونجان و نەکونجان) دەنگی (ت)ی بەسەر (کستارە)دا سەپاند . سەیر لەوەدایە ئەم حەز کردنەی دەنگی (س) لە دەنگی (ت) وای کردوە نەخوێندەواری کورد بڵێ (قەستەم بە خوا) .

٢ـ وشەی (هەڵوەستان) کە لە دوو کەرتی (هەڵ) و (وەستان) پەیدا بوە دەکرێتە (هەڵستان ، هەڵسان ، هەستان) . دەبینی لە هەمو حاڵاندا دەنگی (س) بەردەوامە کەچی دوو دەنگی (ڵ ، ت) قرتانیان بەسەردا دێت . وادەزانم ئەم قرتان و بەردەوام بونەش هەر دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی کونجان و نەکونجانەکە ، بەڵام ئەمجارەیان نەختێك بە فرەوانتری ، لەو ڕووەوە کە لێرەدا کونجان و نەکونجانی تێکڕای دەنگەکان ، نەك تەنها دوو دەنگ ، بەشدار بوە لە داهێنانی شێوە تازەکانی (هەڵوەستان) کە بریتین لە (هەڵستان ، هەڵسان ، هەستان) . جگە لەمە عامیلی تریش دەوری دیتوە ،

وەك قابلیەتی سوانی (ت) ، بەڵام ناتوانم لەسەری بڕۆم .

کە بمانەوێ بەدوا نموونەی‌تر بکەوین رێگەمان زۆر درێژ دەبێتەوە : کورتە و پوختەی رایەکەم ئەوەیە دەبێ ئەم نەخشەیە بە وردی و بە راستی رێك بخرێ و وەك (جدول الضرب) لە بەر دەستی فۆنەتیك‌زان ـ راستییەکەی زمانزانی کورد ـ بێ و سوودی لێ وەرگرێ ، لە دروست کردنی وشەی تازەشدا دەبێ ئەم گونجان و نەگونجانە تێ بخوێندرێتەوە .

بێ گومان بوونی ئەم نەخشەیە شتێکی پێویستە و سەربەخۆیشە ، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە پێوەندی بە شتی‌تریشەوە هەیە ، بەڵکو پەکی لەسەر شتی‌تریش کەوتوە بۆ ئەمەی سوود لێ‌وەرگرتنی بە تەواوی بێت وەك ئەوەی کە دەبێ بزانین هەر دەنگە لە چ جێگەیێکی قوڕگ و زار و لێوەوە (ئەندامەکانی ئاخاوتن بە گشتی) دەر دێت و کامی لە مەخرەجی کامیەوە نێزیکە و کامیان بە نیسبەت ئەوی‌ترەوە لە دەمەوە نێزیکترە ... هتاد . دیار خستنی جێگەی دەربڕینی دەنگەکان لە حاڵی وەهادا سوودی دەبێت نەك وەك مۆمیا لە مۆزەخانەی فۆنەتیکدا دانرێ و تۆژینەوەی شتی‌تری لەسەر نەکرێ .

نەك هەر ئەمە و بەس ، بەلای منەوە دەبێ تین و تاوی دراوسێیەتی کورد لەگەڵ میللەتانی‌تر بۆ سەر زمانەکەی و داهێنانی دەنگی تازە لە کوردیدا و هەموو سەروبەرێکی ئەم لایەنەش بە چاکی لێی بکۆڵرێتەوە و دۆزینەوەکانی ئەم مەیدانەش ببنە یارمەتی‌دەری پلەی

گونجان و نەگونجانی ناوخۆیی دەنگەکانی کوردیی . بە کورتی پێویستە ئەم دیاردەیە کە خۆی لە خۆیدا شتێکی سەربەخۆیە لە ناو پەراوێزی تێکڕای (ئاخاوتن)دا بە گەڕ بێ و ئەنجامەکانی دیار بخرێ ، لەم کارەشـدا نابێ پەکمان بەوە بـکەوێ فۆنەتیك تێکەڵ دەبێ لەگەڵ فۆنۆلۆجی وەیا سینتاکس وەیا ئەدەب وەیا ڕێزمان وەیا مێژوو وەیا هەر زانستێکی تر بێ . ئێمە دەمانەوێ نهێنی زمانی کوردیی بدۆزینەوە نەك خەریکی وەرزشی (یوگا) بین بۆ مەبەسی خـۆ ڕەنجدان لە ناو بەندیخانەی تاکە یەك لایەنی تۆژینەوەی زمان هەناســـە لە خۆمان ببڕین . ئەوەی ڕاستی بێ بۆ زمانزانی کورد کە خەریك بێ لە بارەی زمانی کوردییەوە بتۆژێتـەوە جارێ یەکجـار زوە بۆ داهاتـنی پلەی (تخصص) . زمانی کوردیی نە لە لایەن دیراسەی مێژوویییەوە نە لە لایەن (linquistic)ەوە بە تێکڕایی ، هیـــچ بارێکی بە تەواوی ، بکرە نیوەچڵیش ، ساغ نەبۆتەوە تا کتوژوم نەبێ فۆنەتیك بە فۆنۆلۆجییەوە ببەسترێتەوە و هەریەك لەم مەیدانانە چاپوك سواری خۆی هەبێ و هێندە تێیدا مەعلان بێ سنووران نەبەزێنێ . تۆبڵێ دەبێ میللەتی کورد چەند ساڵی تر چاوەڕوانی پەیدا بوونی (متخصص)ی خۆتەرخان کردو بۆ تاك تاکی ئەو مەیدانانە بـکا ، بە دوا پەیدا بوونیشـیان چەندی تر بە دیار بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانیانەوە دەست لە ئەژنۆ وەرێنێ ، ئەوساش چاو چڕ کاتەوە بەچـکە پێغەمبەرێك بێ و سـوودی هەمو جۆرگەلەکانی فۆنەتیك و فۆنۆلۆجی و سینتاکس و تۆژینەوەی مێژوویی بکاتە یەك

ڕوباری شەپۆلاوی کوردناسی و کێلگە وشك بوەکانی ڕۆشنبیری کوردی پێ ئاو بدات ؟ ڕەنگە ئەو ڕۆژە یەکجار دور بێ ، گریمان نزیکیش بێ نابێ دەستی خۆمان ببەستینەوە و مێشکی خۆمان داخەین بە دیار ئەو (نەورۆزە) تازەیەی سەدەی بیستەم وەیا بیست و یەکەمی کورد . ئەگەر زاناکانی زمانی عەرەبی ١٢٠٠ ساڵ پێش ئەمڕۆ بیروڕایەکی وەهایان بە دڵدا چوبا یەك هەنگاویان بۆ نەدەهاوێژرا چونکە یەکەم هەنگاو بەند دەبو بە (تخصص)ەوە کە دەزانین لە سەرەتاوە وەك (مستحیل) وابو .

ئێمە خەریك نین ئەم باسانە بە (مجرد) ی و لە مەیدانی (مطلق)ی زمان و ئاخاوتن باس بکەین : ئێمە خەریکی زمانێکی تایبەتین کە لێکۆڵینەوەی تێدا نەکراوە . زۆر سەیرە بگوترێ ، وەك دەگوترێ ، زانین و ناسینەوەی زمانی کوردی پێویستی بە زانینی زمانە بنجییەکانی بەرەی (هیندی ئەوروپایی) هەیە بەڵام باسی فۆنەتیکی کوردی دەخلی بەسەر فۆنۆلۆجی کوردییەوە نیە .

لە کۆتایی گوتاردا زۆر بە کورتی باسێکی دەنگە (بزوێن)ەکان دەکەم تایبێتە سەرەتای لێکدانەوە لەو بارەوە کە من بۆی چوم .

هاتا بردنە بەر ڕێنوسی لاتینی وەك لە ئینگلیزی و فەرەنسیدا بەکار هاتوە ئەرکێکی بێ سودە چونکە لەو ڕێنوسانەدا پیتی تایبەتی بۆ تاکە دەنگی بزوێن (vowel) پەیدا نابێ . فەرمو سەیری پیتی (a) بکە کە لەوانەیە هەندێك بڵێن بۆ دەنگی (ا) دانراوە :

and : لێرەدا بوە بە (ئـە) کە دوَ دەنگی (ئـ ـ همزەی عەرەبی) و کورتە بزوێنی (ە ـ فتحەی عەرەبی)یە .

oar : لێرەدا یا نرخی نیە یا بوە بە دەنگی (ۆ) .

wraught : ئەم وشەیە یەك برِگە و حەوت پیتە ، بۆ خۆت نرخی پیتەکەی (a) تێدا بدۆزەوە ، بە من نادۆزرێتەوە .

care : لێرە دا جێی (ێ) گرتۆتەوە .

هەندێ جار پیتی ( i ) لەوەش سەیرترە :

I : بە واتای (من ، أنا) دەخوێندرێتەوە (ئـای) کە بریتییە لە (٣) دەنگی تەواو . هەر ئەم (ئای)ە بە واتای (چاو) دەکرێتە (eye) .

لە وشـەی (ear)دا پیتی (e) بوە بە دەنگی (ئـ ـ همزەی عەرەبی) . لە وشەی (beer)دا بوە بە (ی) درێـژ ، لە (bear)دا بوە بە (ێ)ە پەل ، لە وشەی (here)دا جارێکیان بوە بە (یـە) جارێکیان هەر تێچوە و نرخی نیە وەك دەنگ .

ئەمە دەڵێم تاکو خوێنەری کورد لە توێژینەوەی دەنگەکان خۆی لە ئینگلیزی و فرەنسەیی نەگەیەنێ چونکە لە رێنوسی ئەو زمانانەدا دەنگە بزوێنەکان شکڵی (هیرۆگلیفی)یان هەیە نەك پیتی تایبەتی .

بزوێنەکان لە کوردیدا ، وەك دەنگ ، دەبنە دوَ بەشی جودا :
یەکەم ـ کورتە بزوێن کە شکڵی (ە ، و ، ی)یان بۆ دانراوە ، لـە

عەرەبیدا پێیان دەگوترێ (حركة) و ناوی (فتحة ، ضمة ، كسرة)یان هەیــــە .

کورتە بزوێن بوونی سەربەخۆی نیە ، واتــە بە تەنهـا تلفظی پێ ناکرێ ، بە دوا دەنــگی‌تردا دەر دەکەوێت . ئەم راستییە کەم ناکا بەوەدا کە لە لاتینی بۆ هەر بزوێنێــکی کورت پیتێـکی سەرلەبەر و تەواوی وەك پیتەکانی‌تری بۆ دانراوە . ئێمە قسەمان لەگەڵ دەنـگە نەك وێنەی دەنـگ کە (پیت)ە . تۆ حەز دەکەی لە جیاتی (ە ـ فتحة) مله حوشتر دانێ ، ئەو بۆ خـۆی هەر بە دوا دەنگی‌تردا دێت لە ئاخاوتن . عەرەب لە کـۆنەوە کە بۆ کورتە بزوێن زاراوەی (حركة)یان داناوە و لە نووسینیشدا (فتحة ، ضمة ، كسرة)یان کردۆتە نیشان ، لە خۆڕایی وایان نەکردوە ، دیارە ئەم لایەنە گرنـگەی نەبوونی وجودی سەربەخۆیان لە کورتە بزوێندا تێ‌خوێندۆتەوە .

کورتە بزوێن یەك جۆریان هەیە ، واتە یەك جۆر (ە ، ی ، و) بە واتای (فتحة ، كسرة ، ضمة) لە زارەوە دێتە دەرێ .

دوەم ـ بزوێنی درێژ (ا ، وَ ، ۆ ، ێ ، ێ)ە

وەك دەبینی دەنگی (ا) یەك جــۆری هەیــــە ، بەڵام دوَ دەنـگەکەی‌تر هەریەکەیان دوَ جۆریان هەیە ، کە ئەمــە یەکێـکە لەو دیاردانەی دەنــگی (ا) لەوانی‌تر جودا دەکاتەوە ، دیاردە و تایبەتی‌تریش هەیــــە لێیانی جودا کاتەوە لێرە بەدواوە باسیان دەکەین .

سێیەم ـ وا باوە لە ناو فۆنەتیکزان و تێکڕای زمانزانـان کە وا دەنـگە بزوێنەکانی درێژ هەر یەکەیان بە قەدەر دوو کورتـە بزوێنە ، هەر بۆیەش بۆ واوی درێژیان بە دوو واو دەنوسی و یێی درێژیشیان بە دوو یێ دەنوسی .

من وا دەزانم ( واو و یێ )ی درێژی تیژ راســتە کە هـەر یەکەیان بایی دوو کورتە بزوێن درێژن ، بەڵام دەنـگی ( ا ) دوو ( فتحة ) نیە . بەلای باوەڕی منەوە دەنـگی ( ا ) لە تـایبەتییێـکی یەکجار بنجیدا خۆی لە دەنـگی کورتە بزوێنی ( فتحه ـ ە ) جودا دەکاتەوە : هەڵستانەوەی دەنـگی ( ا ) هەڵستانەوەییێـکی ستونی یەکسەرەیە ، بەڵام هەڵستانەوەی دەنـگی ( فتحه ) لە چاو هی ( ا )دا وەك هەڵستانەوەی ( وتر القائم ) وایە واتە لە نێوانی ستونی و ئاسۆییدایە . تۆ کە بێی دەنـگی ( ا ) لە وشەی ( دار )دا کورت کەیتەوە وشەکە نابێتە ( دەر ) ، دەنـگەکەی ( ە )ش لە وشەی ( دەر )دا درێژ کەیتەوە نایکاتە ( دار ).

چوارەم ـ دەنگی ( و ) و ( ی ) چ بزوێن بێ وەك ( دوور ، دۆڵ ) ( ژێ ، ژێ ) چ ( consonant ) بێ وەك ( یار ، دایـك ، هـای ) ، ( وار ، باوك ، راو ) هەر خۆیەتی ئەم قابلیتەی هەیە . لەمەشــدا گۆڕانی شکڵی دەنـگەکان لە رێنوسی لاتینیدا چ بایەخێـکی نیـە . بەڵـگەی یەك بونی ئــەم دەنـگانە زۆرە ، جگە لە بدیهیـە کـە دەزانێ هەموویان یەکێکن ، لێرەدا یەك دووەکان دێنمەوە :

أ ـ بۆ دەنگی ( و ) .

١ـ کە گوتت ( بەرد و دار ) لێرەدا ( و )ەکەی عطف بزوێنە ، بەڵام کە گوتت ( چرا و نەفت ) واوەکەی عطف بوە consonant .

٢ـ لە فیعلی ( نوســـت ) واوەکە بزوێنە . کە فیملەکەت گۆڕی بۆ ئاینـدە دەبێتە ( دەنوێ ) لێرەدا واوەکە بـۆوە consonant .

٣ـ لە گەڵ خۆتدا دەنگی واوی وشەی ( باو ) درێـژ کەوە دەبینی دەبێتە واوێـکی بزوێنی تیژی درێژ .

ب ـ بۆ دەنگی ( ی ) .

١ـ کە دەڵێی ( بەردی بەست ) یێیەکەی ( اضـافة ) بزوێنـە بەڵام کە گوتت ( برای من ) هەمان یێی ( اضافة ) بوۆە بە consonant .

٢ـ کە دەڵێی ( گرتی ) ئەم یێیەی ( راناوی کەسی سێیەمی تاك ) بزوێنە بەڵام کە گوتت ( کێڵای ) یێیەکە دەبێتـە consonant .

٣ـ لەگەڵ خۆتدا دەنـگی یێی وشەی ( چـای ) درێژ کەوە دەبینـی دەبێتە یێیەکی بزوێنـی تیژی درێژ .

جگە لەمانە بەڵـگە هەن من نایانهێنمە ناو نوسینەوە .

پێنجەم دەنگی (ا) لەم چەند روەوە خۆی لە دوَ دەنگی (و ، ی) جودا دەکاتەوە :

١ـ لەوەدا کە یەك جۆر (ا) هەیە .

٢ـ لەوەدا کە بریتی نییە لە دوَ کورتە بزوێنی (ە ـ فتحة) .

٣ـ لەوەدا کە ئەویش وەك کورتە بزوێنەکان بە تەنها تلفظی پێناکرێ واتە هەر بەدوا دەنگیتردا خۆ دەنوێنێ . هەر بۆیەیە نە لە پێشەوەی وشەوە دێت نە لە ناوەراست و کۆتایی وشـەدا دەکرێ بە consonant . من لەمەدا هەرگیز باوەڕ بەو گوتەیە زۆر مەشوَرەی کۆلینە ناکەم کە دەڵێ (همزة) بریتییە لە دەنگی (ا) کە تلفظی پێ کرابێ بە سەربەخۆیی . عەرەبەکان لە کۆنەوە (همزة) و (الف) یان بە یەك پیت (دەنـگ) داناوە هەر بۆیەیشـە ژمارەی (حروف الهجاء) لە عەرەبیدا (٢٨) ە . بەڵێ راستە وا دەبێ دەنگی (همزة) خۆی لە ناو دەبا بۆ دەنگی ئەلف وەك ئەوەی کە لە جیاتی (دەئاخێوێ) دەگوترێ (داخێوێ) بەڵام ئەم تایبەتیەی (همزة) لە گەڵ (ی) شدا هەر وایە . تۆ دەڵێی (دەئێشێ) دەشـتوانی بڵێی (دێشێ) بەمەدا دیار دەبێ هەمزە قابلیەتی تیَچوَنی هەیە نەك لە ئەلفەوە هاتوە .

ئەم بیروڕایانەی لێرەدا خوێنەر و فۆنەتیكزانی کورد دەیانخوێننەوە سەرەتاییێکی نوێی باسێکی درێژەدار و بنجین لە زمانەکەماندا . بە هەڵە چوَنی من لە هەندێ لایەنەکانی باسەکە لە بایەخ و گرنگی باسەکە خۆی کەم ناکاتەوە . هەروەها خەریك نەبوَنی زمانزانـ و فۆنەتیكزانی

کورد و غەیری کوردیش پێیەوە ، سوچێکی من و باسەکەی تێدا نیە . وا دەزانم سۆز بۆ راستی بە گشتی ، بۆ زمانی کوردی بە تایبەتی ، داوا لە هەمو کوردێك دەکا بەگیانێکی ( موضوعی ) سەیری باسەکە بکرێ نەك لە گۆشەی ( من من و تۆ تۆ ) وە کە پیشەیێکە زۆر رێبازان کوێر دەکاتەوە .

یەك دو تێبینی کورتیلەم ماوە بیانکەم بە کۆتایی گوتار :

دەبو بڵێم هاتنی هەمو دەنگێك لە پێشەوەی وشەوە ، کە بزوێنی ئاشکرای بە دوادا نەیێت بە ناچاری دەنگەکە قورس دەکات . هەر لەبەر ئەم ناچاریەیە دەنگی (س) کە لە وشەی وەك ( ستاندن ، ستران )دا لە پێش دەنگی ( ت )ەوە دێت دەبێ قورس بکرێت ئەگینا تلفظی پێ ناکرێ . لەم شوێنانەشدا وا دەبێ حوکمی خزمایەتی و گونجانی دودەنگی ( س ، ت ) خۆ بەدیار دەخا بەوەدا کە وشـــەی ( سـتاندن ) دە کرێتە ( ئەستاندن ) بۆ ئەوە ئیمکان هەبێ سینەکە بە تەواوی بوەستێندرێ ، وشەی ( ئەستەم )یش هەر لەم رێگەیەوە لە ( ستەم)ەوە وەرگیراوە .

نوسینی هەندێ وشەی ناو باسەکە کە بۆ مەبەسی رون کردنەوە بە لاتینی نوسراوە چ رێنوسێکی قەراردادەی تێدا رەچاو نەکراوە ، تەنها ویستومە بیروۆایەکە بخەمە قاڵبێکی مەفهومەوە .

داوای چاوپۆشیش دەکەم لە هەر شتێکی ئەوتۆ کە جێگەی چاو لێ پۆشین بێت .

* * * * *

## ـ ملخص المقال ـ

# ماذا ينبغي للفونتيك ان ينجزه ؟

العضو العامل : مسعود محمد

يحتوي المقال على ملحوظات أولية من حيث ان الألمام بقواعد الفونتيك ومصطلحاته لايجعل من الملمّ بها عالماً بخواص الأصوات في لغة من اللغات ، مثله في ذلك مثل المحيط بقواعد اللغة أو بعلم المقام : فأن إتقان القواعد واصول المقام شيء والتمكن من اللغة واداء المقام شيء آخر . صحيح ان الضوابط النظرية المصطلح عليها في الفونتيك امر لاغنى عنه للمعتنى به ولكن حتى التبحر في ذلك ، وليس مجرد الالمام ، لايفيد وحده في فتح الطريق امام الدارس الى خبايا لغة من اللغات وتركيبها الداخلي في بناء كلماتها وتحديد مقاطعها وما الى هذا وذاك من الأمور المتعلقة بالاصوات اللغوية . وليس لدارس الفونتيك الكردي ان يستسلم الى أراء علماء الفونتيك في اللغات الاخرى فلربما جاءت تصوراتهم نابعة من خصائص لغات قد لاتأتلف مع خصائص الصوت في اللغة الكردية . والوقوف فى الفونتيك عند حد تعيين مخارج الحروف دون التعمق فى خاصية كل صوت في اللغة الكردية أمر مبتور لاغناء فيه ولا لزوم له فليس يُعين الدارسَ علمه

ان صوت الدال ، مثلا ، يخرج من الحلق او اللثـــة او الانف مالم يتعزز ذلك بمعرفة كيفية تصرف الناطق الـكردي في هذا الصوت وكيفية تصرف الصوت نفسه في تعايشه مع الاصوات الاخرى . ويركز المقال بشكل خاص على وجوب درس ظاهرة صوتية لم تبحث حتى الآن رغم كونها اس الاساس في كل بحث يتصل بالفونتيك سيما في اللغة الـكردية.
ملخص الظاهرة ان الأصوات في الـكلام الـكردي تتفاوت في التجاذب والتنافر فيما بينها فمنها مايكون التوافق بينها تاماً من كل وجه فيأتي صوت منها ساكـناً تمام السكون قبل صوت آخر ســاكن في الـكلمة الواحدة كوقوع السين الساكنة قبل التاء الساكنة او وقوع الراء قبـل الدال والتاء او النون قبل الـكاف الفارسية . وهناك اصـوات اخرى تحتمل التسكين التام كما تحتمل اشباعها بالنبرة واصوات اخرى لابد من اعطائها نبرة والا تعذر النطق بها ساكنة قبل ساكن آخر . وهناك اصوات يمتنع مجيئها سواء كانت ساكنة تمام السكون او مشبعة بالنبرة قبل اصوات اخرى ساكنة .. هذه الميـّزة في الأصوات الـكردية ذات اثار بعيدة في صيـــاغة الـكلمة الواحـدة وفي مجيئها في الجملة وفي استدعاء صوت دون صوت او حذف هذا دون ذاك . وللمقال تفصيل لايفيد غير المتفرغ له كما ان للبحث نفسه ابعادا وأعماقاً لم يتســع لها للمقال الا ماكان من الاشارة السريعة او الايماءة العـابرة ، وهـو في مجموعه بداية مستحدثة لأمر لم يطرق بعد .

* * * * * *

# جولات تاريخية

# بين مواطن الآثار في شمالي العراق

بقلم
طه باقر
استاذ الآثار فى كلية الاداب
وعضو المجمع العلمي العراقي

**مقدمة في اهمية المواقع الاثرية الشمالية من الناحيتين الحضارية والسياحية :**

كنت أوجزت في العددين السابقين من هذه المجلة عصور ما قبل التأريخ في حضارة وادي الرافدين على ضوء التحريات الاثرية في شمالي العراق ، ونوهت بالاهمية الكبرى التي يوليها الباحثون في تأريخ الحضارات القديمة لهذه العصور لانها الاصول الاولى التي انبثقت عنها حضارة وادي الرافدين . على ان أهميــة تتبع عصور ما قبل التأريخ في شمالي العراق لا تقتصر على كونها الاصول الاولى لتلك الحضارة بل انها أوضحت كذلك جوانب مهمة من تطور الانسان وتدرجه في مسيرته الشاقة عبر عصور ما قبل التأريخ ( التي قلنا انها استغرقت زهاء تسعة وتسعين بالمائة من عمر البشرية ) الى طور الحضارة الناضجة التي استكملت اولى مقوماتها في السهول الرسوبية من وادي الرافدين في مطلع الالف الثالث ق.م. فقد تحقق في شمالي العراق جملة منجزات حضارية وتبدلات بيولوجية في حياة الانسان كانت مراحل حاسمة في سير التطور البشري من بينها ظهور النوع الانساني الحديث الذي أطلق على اقدم نماذج منه اسم « الانسان

العاقل » (Homo Sapiens) الذي ظهر في النصف الثاني من العصر الحجري القديم قبل نحو ٣٥٫٠٠٠ أو ٤٠٫٠٠٠ عام ، فاطلق الباحثون على هذا الدور من العصر الحجري القديم « عصر الانسان الحديث » (Neoanthropic) في حين ان النصف الاول من ذلك العصر يسمى « عصر الانسان القديم » (Palaeoanthropic) حيث عاشت فيه انواع واجناس بشرية بائدة يرجع تاريخ البعض منها الى نحو مليون ونصف مليون عام ، وكان آخرها النوع الانساني المسمى « انسان النياندرتال » (Neanderthal) ( نسبة الى وادي نياندرتال في المانية ) قبل نحو ٧٠٫٠٠٠ أو ٦٠٫٠٠٠ عام ، واعقبه النوع الانساني الحديث السالف الذكر، ويرى الباحثون المختصون ان هذا النوع الحديث نشأ بطريق التطور عن نوع انسان النياندرتال البائد ، حيث ظهرت في النماذج المكتشفة من هياكله العظمية في الشرق الادنى ملامح من ذلك التطور • وقد سبق ان ذكرنا في العدد الاول من هذه المجلة الاكتشاف الخطير الذي اسفرت عنه التحريات الاثرية في كهف « شانيدر » ( في أعالي الزاب الاعلى ) حيث وجدت عدة هياكل عظمية من انسان النياندرتال وفيها امارات تشريحية مهمة على أن هذه النماذج كانت من بين حلقات الوصل او الانتقال الى نوع الانسان الحديث •

وبعد عدة آلاف من السنين على ذلك التطور البيولوجي الخطير شهدت مسيرة الانسان تطورا مهما آخر يضعه مؤرخو الحضارة في مقدمة المنجزات الكبرى التي مهدت السبيل لظهور الحضارة ونعني بذلك اهتداء الانسان الى انتاج قوته بالزراعة وتدجين الحيوان بعد ان كان في العصور الحجرية السابقة جامعا للقوت (Food gatherer) • وقد قضى زهاء

٩٨٪ من حياته في ذلك الطور من الحياة الهمجية • وقد تتبعنا المراحل الاولى لظهور هذا الانقلاب العظيم في جملة قرى فلاحية قديمة في كردستان العراق كما أظهرت ذلك التحريات الاثرية مثل الموقع الاثري المسمى « زاوي چميى » ( القريب من كهف شانيدر وعلى ضفة الزاب الاعلى ) وقرية « جرمو » ( في منطقة جمجمال على بعد نحو ٣٥ كم شرقي كركوك ) ، وكان مما ذكرناه عن المناطق التي وجدت فيها بقايا انقلاب العصر الحجري الحديث ( اي الزراعة وتدجين الحيوان ) انطباق الشروط الاساسية ، التي يضعها الباحثون لوقوع ذلك الانقلاب فيها ، على شمالي العراق وفي مقدمتها وجود اصول النباتات والحيوانات البرية التي دجنها انسان العصر الحجري الحديث وعثور المنقبين على القرى الفلاحية القديمة التي وجدت فيها بقايا العصر الحجري الحديث مثل عظام الحيوانات التي دجنت وفي مقدمتها الماعز والضأن والحبوب المدجنة واولها الشعير والحنطة•

وتتبعنا كذلك في بحثينا السابقين أدوار العصر الذي اعقب العصر الحجري الحديث السالف الذكر ، وهو العصر الذي اصطلح عليه في تأريخ الحضارات القديمة اسم العصر « الحجري ــ المعدني » (Chalcolithic) حيث ظهرت أطواره الاولى في شمالي العراق ثم بدأ استيطان السهول الرسوبية الوسطى والجنوبية منذ منتصفه ( فيحدود ٥٠٠٠ــ٤٠٠٠ق٠م) ، وبينا اهمية هذه الحقبة الحضارية في تطور الانسان وانها كانت بمثابة فجر الحضارة أو المقدمات الاولى التي مهدت لظهور الحضارة الناضجة في السهل الرسوبي في مطلع الالف الثالث ق٠م ، كما بينا خصائص كل دور من أدوار ذلك العصر، وعددنا الاسماء التي أطلقت عليها وهي مأخوذة من أسماء المواقع المحلية التي وجدت فيها آثارها المميزة لاول مرة وهي ابتداء من الاقدم : (١) حسونة (٢) سامراء (٣) حلف (٤) العبيد (٥) الوركاء

(٦) جملة نصر ، وتقصينا سلسلة التطور الحضاري فيها وفي مقـدمة ذلك ازدياد القرى الفلاحية التي ظهرت أوائلها في العصر « الحجري الحديث» السابق وتوسعها في المراحل الاخيرة منـه الى اوائل المـدن في السهل الرسوبي ، واتساع زراعة العصر الحجري الحديث ، وبداية ظهور معـالم التخصص وطلائع الصناعات البدائية مثل النجارة وصناعـة الفخار وصنع الادوات والآلات المعدنيـة والحياكـة ، وظهور اجهزة الارواء الاصطناعي عندما استوطن الانسان في السهول الرسوبية بالقرب من ضفاف الانهار ، وبداية انظمة الحكم والتدوين بالكتابة الى غير ذلك من مقومات الحضارة.

واذ كنا قد بلغنا في تتبعنا لادوار ما قبل التأريخ بداية العصر التأريخي وطور الحضارة الناضجة في مطلع الالف الثالث ق.م فسنتابع عرض الادوار التأريخية في شمالي العراق على هيئة رحلات أو جولات تأريخية أثريـة ، مقسمة بحسب المراكز الادارية او المدن الكبيرة التي سنوجز تأريخهـا وآثارها بحسب العصور التأريخية المختلفة ، ثم الانطلاق منهـا الى وصف الاماكن التأريخية القريبة منها والتي يمكن الوصول اليها من تلك المراكز .

وقبل أن نبدأ بأولى هذه الجولات الآثارية يحسن ان نمهـد لذلك بايجاز ما تتميز به المواطن الاثرية في شمالي العراق من أهمية خـاصة من الناحيتين الحضارية والسياحية . فمن الناحية الحضاريـة اوجزنا ذلك في مقدمة هذا البحث التي هي خلاصة للبحثين المنشورين في العددين السابقين من هذه المجلة . اما من الناحية السياحية فان المواقع الاثريـة في شمالي العراق تتميز ، بالاضافة الى اهميتها الحضارية التي نوهنا بها، بكونها تقع في مناطق طبيعية جميلة ذات جاذبية كبيرة للسياح من الخارج والداخل ، فانها بالمقارنة مع معظم الاماكن الاثرية في الاجزاء الوسطى والجنوبية التي تقع

في مناطق جرداء يصعب الوصول اليها تقع كما قلنا في اراض جبلية وشبه جبلية ذات مناظر طبيعية خلابة بحيث يستطيع الزائر لها ان يجمع بين المتعة السياحية وبين الفائدة التأريخية والاثرية ، اضف الى ذلك الجاذبيةالانسانية التي يجدها الزائر للمناطق الشمالية من ناحية تنوع الازياء والصناعات الشعبية • ثم ان الكثير منها اما ان يكون قائما بحالة جيدة من الحفظ نوعا ما وبالمقارنة مع المواقع الاثرية الجنوبية التي يقتصر الامر في الكثير منها على كونها مجرد مجموعات من التلول الترابية المبعثرة وفوقها كسر الحجارة مما تصعب معرفته على السائح الاعتيادي وحتى الاثري المختص ان لم يكن على علم مسبق بمخططاتها وتأريخها • وهناك المنحوتاتالجبلية المنتشرة في شمالي العراق والواضحة في معالمها واشكالها بالنسبة الى السائح غير المختص ، وسيمر بنا وصف اشهر هذه المنحوتات في اثناء جولاتنا الاثرية المقبلة • ان هذه الميزات وغيرها تجعل من المواقع الاثرية في شمالي العراق ذات اهمية بالغة من الناحيتين التأريخية والسياحية ولا سيما بعد اعدادها وتهيئتها للسياحة الاثرية ، وهذا ما شرعت به السلطات المسؤولة في الآونة الاخيرة •

### جولة اثرية في محافظة اربيل :

ونبدأ في جولاتنا التأريخية الاثرية في مدينة اربيل والمناطق المحيطة بها وهي غنية بمواقعها التأريخية التي سنختار المشهور منها مما يمكن تعيينه بأحد المستوطنات القديمة او المدن التأريخية المعروفة على ضوء الاشارات التأريخية في النصوص القديمة وفي مقدمتها النصوص المسمارية• ونفرد لمدينة اربيل وصفا خاصا •

**أ ـ بعض المعالم الاثرية في الطريق من كركوك الى اربيل :**

بما اننا سنخصص جولة مستقلة لمنطقة كركوك فلا نتكلم الان عن مدينة كركوك ومعالمها الاثرية بل نجتازها في الطريق الى اربيل ٠ ولعل ابرز ما يلفت النظر ان هذا الطريق بعد ان يجتاز التلال والمرتفعات الواطئة الواقعة في ضواحي المدينة يمر في سهل واسع بين كركوك واربيل اشتهر في جميع عصور التأريخ بخصبه ووفرة مياه الامطار فيه فازدهر في محاصيله الزراعية ، الامر الذي جعل المئات من الاطلال الاثرية تنتشر فيه وهي تدل دلالة واضحة على كثافة سكانه واتساع المستوطنات فيه ، ومع انه لم تجر لحال التأريخ تحريات اثرية كثيرة في هذه المستوطنات بيد ان الفحوص السطحية ودرس الملتقطات السطحية على هذه التلول (Surface finds) تشير الى امتداد الاستيطان البشري في هذا السهل الى عصور ما قبل التأريخ والعصور التأريخية المختلفة ٠ وحديثا بدأت التنقيبات الاثرية في احد هذه التلول واسمه « يارمجه » ( ويعني في التركية التل النصف او نصف التل )[١] ، وقد نقبت فيه بعثة اثرية سوفيتية منذ عام ١٩٦٨ تحت اشراف الاستاذ « منجايف » (Rauf Munchaev) وعثر فيه على بقايا ادوار العصر الحجري المعدني من حسونة وسامراء وحلف ( انظر مجلة سومر المجلدان ٢٥و٢٦ ) ، ويبدو ان هذا المستوطن ازدهر في دور «حلف» ( في حدود ٥٠٠٠ ق٠م ) وهو الدور الذي اشتهر بأوانيه الفخارية الجميلة ذات الالوان المتعددة ووجدت في مواقع اثرية كثيرة في الشرق الادنى وشمالي العراق ، مثل بلاد الشام ومنطقة الخابور وشمالي ما بين النهرين ، وفي جملة مواقع اثرية في منطقة الموصل اشهرها

---

(١) يقع هذا التل جنوب غربي تلعفر بنحو ٥ كم ٠

تل الاربجية وتبه‌گورا [٢] • ويشاهد في الطريق ايضا التل الـذي يطلق عليه اسم « كوك تبه » ، وهو موقع واسع ومرتفع ، وتظهر فيه للعيـان بقايا مدينة اثرية مسورة لا يعرف اسمها القديم لانــه لم تجر في الموضع تحريات اثرية •

**آلتون كوبري :**

وعلى مسافة نحو ٤٦ كم من كركوك يمر الطريق على جسـر فوق الزاب الاسفل [٣] حيث البلدة المسماة « آلتـون كوبري » او « آلطون كوبري » وهي عبارة عن شبه جزيرة تقريبا بين ذراعي الزاب حيث اقيـم عليهما جسران حديثان • ومع ان اسم البلدة يعني بالتركية «قنطرة الذهب» او « جسر الذهب » بيد ان المرجح كثيرا ان هذا تحريف لاسمها الصحيح « قنطرة الزاب » ، للتشابه اللفظي الظاهري بين «الزاب» و «الذهب» في اللفظ التركي • ولا يعلم متى اسست هذه المدينة الحديثة ولا من اسسها• ويروى عن أخبار حملة السلطان التركي مراد الرابع على بغداد وفتحه لهـا في عام ١٦٣٨م انه اقام جسرا على الزاب الاسفل في هذا الموضع ، وعلى هذا فيرجح ان البليدة نشأت في حدود هذا التأريخ او قبيله بقليل • وكان

---

(٢) عن هذا الدور والادوار الاخرى من عصور مـا قبل التاريخ في العراق راجع العددين السابقين من هذه المجلة وكتاب المؤلف الموسوم : «مقدمة في تأريخ الحضارات القديمة » ، الجزء الاول ( الطبعة الثالثة ١٩٧٣ ) •

(٣) الزاب الاسفل على ما هو معروف من روافد دجلة الكبرى مما يلي الزاب الاعلى وقد حافظ الزابان على اسميهما القديمين الواردين في النصوص اي ( عيلو ) ، وهو الزاب الاعلى ( راجع كتاب المؤلف المذكور في الهامش رقم (٢) •

على النهر عند موضع المدينة جسران كانا قائمين الى زمن حديث حيث زار الموضع الآثاري الالماني « هرتسفلد » (Herzfeld) في عام ١٩١٦ ووصفهما وسجل للجسر الكبير منهما مخططا ، وارجع زمنه الى القرن الثالث الهجري ، التاسع الميلادي (٤) • والجدير بالذكر بهذه المناسبة ان كتب البلدان العربية ومنها معجم البلدان لياقوت ذكرت موضعا باسم القنطرة عند « آلتون كوبري » •

وتقع « آلتون كوبري » في طريق تأريخي مشهور وفي موضع يسهل منه عبور الزاب ، وكانت مرحلة تأريخية الى اربيل والى مدن السهل الرسوبي في الجنوب ( بلاد سومر واكد التأريخية ) • ورأى بعض الباحثين ان في هذا الموضع كانت تقوم المدينة المعروفة باسم « شاه قرد » او « شهرقرد » التي ازدهرت في القرون الاولى من العهد الميلادي (٥) ، كما ارتأى باحثون آخرون انها موقع المدينة القديمة التي ذكرتها النصوص الآشورية بهيئة « شميورو » (Shiomurru) والواقعة في اقليم عرف بالاسم نفسه ، وان المدينة نفسها جاء ذكرها في العهود الاقدم مثل العصر البابلي القديم وعهد سلالة اور الثالثة ( في مطلع الالف الثاني ق•م ) ،وعين باحثون آخرون في هذه المنطقة المدينة القديمة التي ذكرت بهيئة «زبان» في أخبار حملة الملك الآشوري سرجون الثاني ( ٧٢١-٧٠٥ ق•م ) على آذربيجان وارمينية ، وهي الحملة العسكرية التي عرفت بين الباحثين باسم

(٤) Sarr und Herzfeld, Archaeolgische Rise im Euphrat und Tigris Gebiete, (1920).

(٥) Sarre und Herzfeld, Op. Cit.

« حملة سرجون الثامنة »[٦] .

كمـــا ارتؤي ان آلطون كوبري واقليمها كانت ضمن اقليم او مملكـــة حدياب ( اديابينه ) التي سنذكرها ، وان عند الطون كوبري كان موضـــع المدينة او المملكة الوارد اسمها بهيئة « تتون ـ اشري » في الكتابـــــة المنقوشة على قدمة تمثال الملك «أثلو» المكتشف في الحضر .

والجدير بالذكر بمناسبة كلامنـــا على الطريق المؤدي الى اربيل ان الطريق التأريخي في العصور البابلية ـ الآشورية كان يمر في المراحـــل الرئيسية ابتـــداء من نينوى ثم الى «اربائيلو» (اربيـــل) ثم « اررابخـــا » ( المحتمل تعيين موقعها في كركوك ) ثم الى بلاد بابل ، وكان يطابق تقريبا الطريق الملكي في العصر الفارسي الاخميني ( ٥٣٩ـ٣٣١ ق٠م) الذي كان يربط ما بين مدن الاناضول وبين العاصمة الملكية « برسيبوليس » ( قرب اصطخر في ايران ) .

**اربيـــل :**

وتترك « آلتون كوبري » لنصل من بعد نحو ٥٠ كم الى مدينـــة اربيل الشهيرة التي تقع في السهل الواســـع الخصب بين الزابين الاعلى والاسفل شمالا وجنوبا ودجلة غربا ، وهـــذا هو الاقليم الذي كان يؤلف القسم الاكبر من بلاد آشور التاريخية ، وعرف ايضا منـــذ منتصف القرن الثاني ق٠م باسم «حدياب» ( اديابينه في المصادر الكلاسيكية ) الـــذي سنخصص له موضعا آخر من بحثنا ، في اثناء العرض التأريخي الموجـــز لمدينة اربيل .

---

(٦) Luckenbill, Ancient Records of Babylonia and Assyria, II.

تقع الاحياء القديمة من مدينة اربيل الحديثة فوق تل اثري واسع يطلق عليه اسم قلعة اربيل حيث القلعة التاريخية الاسلامية تقوم فوق تراكم طبقات اثرية كثيرة تمثل مستوطنات تاريخية متعاقبة منذ ان قام اول مستوطن فوق ما يسمى بالارض البكر في زمن لا يعلم امتداده وتحديده لانه لم تجر في الموضع تحريات أثرية لحد الآن . وان المرتفع الذي تقوم فوقه الاحياء القديمة من اربيل احسن ما يمثل لنا الكيفية التي تتكون فيها التلول الاثرية المنتشرة في جميع انحاء القطر ، والمثال الثاني التل المرتفع الذي تقوم فوقه الآن الاحياء القديمة من مدينة كركوك ، وكثيرا ما فكرت مديرية الآثار والسلطات المحلية في اربيل في مشروع يرمي الى اخلاء قلعة اربيل من دور السكنى القديمة ونقلها الى مكان آخر لاجراء التنقيبات المنتظمة التي لا شك عندي في انها ستسفر عن نتائج مهمة في تاريخ المدينة وتاريخ المنطقة وتلقي الضوء على فصول مهمة من تاريخ حضارة وادي الرافدين . والى ان تتحقق هذه التحريات لا يمكن الآن معرفة اشياء مؤكدة عن ادوار المدينة القديمة سوى ما ورد عنها من اشارات في النصوص المسمارية ، واقدم ما وصل الينا منها الاشارات الواردة في سجلات ملوك سلالة أور الثالثة السومرية ( ٢١١٢ــ٢٠٠٤ ق٠م ) حيث ذكرت المدينة بهيئة « أوربيلمْ » (Urbilum) [٧] كما جاء ذلك في الحوادث

(٧) ورد الاسم بهيئات اخرى مختلفة من المقاطع المسمارية مثل :
Ar-bi-lum ki , (Ur-bi-i-lum ki) , (Ur-bi-lum ki)

انظر النصوص المنشورة في :

Yale Oriental Series, IV, No. 25, 1. 11; No. 29, 1. 40

وراجع مادة Arbela في المعلمة الاشورية الالمانية المعنونة :
Ebelling, Realexikon der Assyriologie, I, p. 141

« المؤرخ بها » (Data formulae) الخاصة بالسنة الثالثة والاربعين من حكم ثاني ملوك تلك السلالة المسمى «شولگی» (Shulgi) (٢٠٩٤ — ٢٠٤٧ ق٠م ) والسنة الثانية من حكم خلفـــه الملك « امار — سين » او « بور — سين » ( ٢٠٤٦ــ٢٠٣٨ ق٠م ) حيث دخلت اربيل والمنطقةالخصبة التي تقع فيها ضمن امبراطورية سلالة اور السالفة الذكر ٠

اما الشكل المألوف الوارد فيه اسم اربيل في النصوص الآشوريــة فهو « اربايلو » او « اربـائيلو » (Arba—ilu) [٨] ، وبهيئـــة ar-ba-ilu و ar-ba-il ٠ وفسر هذا الاسم على انه يعني « اربعــة آلهــة » او « الاربعــة آلهة » ، ولعل الكتبــة الآشــوريين فسروا الاسم السومري القديم أوربيلم (Urbilum) تفســيريا جمـــــاهيريا (Popular) على انه « اربعة آلهة » فحولوا الاسم القديم بهيئـــة « اربائيلو » ٠

وما دمنا فياستعراض اسماء المدينة التاريخية فيجـــدر ان نذكر ان اسم المدينة حور في العصر الفارسي الاخميني ( ٥٣٩ــ٣٣١ ق٠م ) الـــى صيغة «اربيرا» (Arbira) كما ورد ذلك في النصوص الفارسية القديمة المدونة بالخط المسماري ٠ وذكرت في حوادث فتح الاسكندر الكبيرللعراق ( ٣٣١ ق٠م ) بهيئة « اربيلا » او «اربلا» (Arbelā) وهي الصيغة التي احتفظت بها في المصادر الكلاسيكية ( اليونانية والرومانية ) وظلت اربيل محافظة على اسمها القديم في العهد الاسلامي — العربي بهيئـــة «اربل»،

(٨) الملحمة الاشورية الالمانية المذكورة ٠

وحرف الاسم قليلا بالكردية الى «اروبل» و «اوليرا» و « هولير » و « هوليرا » .

**لمح من تاريخ اربيل في العهد الآشوري :**

المحنا فيما سبق كيف ان موقع اربيل في وسط السهل الخصب بين الزابين قد جعلها من المدن الرئيسية في العصور القديمة ، واكتسبت اهمية خاصة في العصر الآشوري بحيث انها غدت من بين الحواضر الآشورية الرئيسية وهي آشور ونينوى وكالح ( نمرود الآن ) منذ ما يسمى بالعصر الآشوري القديم ( في حدود ٢٠٠٠ — ١٤٠٠ ق.م ) ، وذكرت في كتابات احد ملوك هذا العصر المسمى « شمسي — أدَد » الخامس ( ٨٢٣ — ٨١١ ق.م ) على انها كانت مدينة مزدهرة [٩] . وكانت الى جانب ازدهارها الحضاري والعمراني احدى القواعد العسكرية الآشورية لتسيير الحملات العسكرية منها الى المناطق الشرقية ، حيث المجاز الجبلي الذي ورد اسمه في النصوص الآشورية بهيئة ( كرّوري ) (Kirruri) ، وكانت كذلك مركزا دينيا مهما لعبادة الآلهة الشهيرة « عشتار » التي سميت « عشتار اربيلا » ، تمييزا لها عن عشتار «نينوى » وعشتار مدينة «أكد» (العاصمة الاكدية في وسط السهل الرسوبي ) . وعرف معبد عشتار في اربيلا في الكتابات المسمارية باسم « اي-گشان-كلامّا »
(E-GASHAN-KALAM-MA)
ويعني في اللغة السومرية « بيت سيدة الاقليم »[١٠] ،ولعل

---

(٩) راجع الكتابة المسمارية في مسلته المنشورة في :
Luckenbill, Ancient Records, I, 1. 49

(١٠) كانت المعابد في العراق القديم كلها تقريبا تسمى باسماء سومرية في جميع عهود حضارة وادي الرافدين .

